لەبڵاوکراوەکانی ناوەندی هەولێری مەکتەبی راگەیاندن ( ی.ن.ک )
زنجیرە ( ٩ )

ناوی کتێب: حەمید رەشاش و تولە رێیەکانی کوردایەتی

بابەت: بیرەوەریی

نووسینی: ستار محەمەد ئەمین

پێداچوونەوەی: نازم دڵبەند

دیزاین: ژیوا

نۆرەی چاپ:

چاپخانە:

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

نرخ:

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکانی هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ١٤٧ )ی ساڵی ( ٢٠٢٢ ) پێدراوە.

## سەرە قەڵەمێك

ئەو كتێبەی لەبەر دەستتانە بیرەوەری و یادەوەری كەسایەتییێكی خاوەن ئەزموونی دوورو درێژە، كە هەموو ژیانی بووە بە مێژووی خەبات و تێكۆشان بۆ نەتەوەكەی، كە ئەویش مام حەمید رەشاشە.

ماوەیەكە من خەریكی نووسینەوەو ئامادەكردنی یادەوەرییەكانی مام حەمیدم، لەم یەك دوو هەفتەی دواییدا گەیشتمە قۆناغی كۆتایی كۆكردنەوەو نووسینەوەی بابەتەكان، تەلەفۆنم بۆ مام حەمید كردو پێیم راگەیاند گەیشتمە قۆناغی كۆتایی، پێم گوت خۆشت پێشەكییەكی جوان و پوختەی بۆ بنووسە كە هەروەكو خۆت جوان بێت، پێكەنی گووتی كاكە ستار با ئەوەشیان هەرلۆ جەنابت بی، هەر بەخۆت لەجیاتی من ئەوەش بنووسەوە، گووتی: ئەگەر نا بە كاك عەبدولوەهاب شێخانیم گووتیە لە جیاتی من ئەو پێشەكیەكە بنووسێت، بەلاّم زۆر حەزم دەكرد خۆی بینووسێت، دەستخۆشی لێكردم و گووتی بەخوای ئەو ماوەیە دەستم دەلەرزی و قەڵەمم پێ ناگیرێ، منیش پێم ووت مام حەمید ئاسانكاریەكت بۆ دەكەم كامیرایەك دەهێنم تۆ قسە بكە و منیش تۆماری دەكەم، دواتر دەینووسمەوەو پیشانت دەدەمەوە، زۆری پێخۆش بوو گووتی من خۆم تەلەفۆنت بۆ دەكەمەوە.

تا ٢٠٢٢/١/٨ ئەو ڕۆژەی ناساندنی كتێبی بیرەوەرییەكانی مامۆستا كەمال محیەدین لەساڵۆنی لاپەڕە نۆ ئەنجام دەدرا، مام حەمید لەگەڵ مامۆستا كەمال هات و لە كۆڕەكە ئامادەبوو، بەلاّم ئەو رۆژە بێ تاقەت دیاربوو، بۆیە

لە کۆڕەکەش بۆ کتێبەکە هیچ کۆمێنتی نەبوو، مام حەمید بەردەوام لە هەر کۆڕو کۆبونەوەیەك ئامادەبووایە قسەی خۆی هەبوو پێم وابێ تەندروستی باش نەبوو، بەڵام لەبەر دڵی مامۆستا کەمال و ئێمە هاتبوو بۆ کۆڕەکە، تاوەکو لێشم پرسی تەندروستیت چۆنە؟ مام حەمید وەك هەمیشە زۆر لەسەرخۆ بەهێمنی گووتی کاك ستار کوڕە باشم باش.

ئەو ڕۆژە مام حەمید زۆر دڵی بە چاپکردن و بڵاوکردنەوەی کتێبەکەی مامۆستا کەمال محێدین خۆش بوو، ئەوەندەش دڵی بە کردنەوەی هۆڵی نوێی سالۆنی لاپەڕە تۆ خۆش بوو، پێم گووت ئیشالله بەمزووا نە جەنابیشت هەر لێرە ئیمزا لەسەر کتێبەکەی خۆت دەکەی و پێشکەشی جەماوەری دەکەی، زۆری پێ خۆش بوو، منیش لێم دووبارە کردەوە بۆ پێشەکی کتێبەکەی...

گووتی : کاك ستار لەو ڕۆژانە خەبەرت دەدەمێ و تۆماری دەکەین ، لەو ڕۆژەوە چاوەڕوانی تەلەفۆنی مام حەمیدم دەکرد بۆ ئەوەی بچم لەماڵەوە پێشەکییەکەی بۆ تۆماربکەم، بەداخەوە دوای هەفتەیەك بۆ هەواڵ پرسین تەلەفۆنم بۆ کردەوە، وەڵامی نەبوو، پێدەچوو تەندروستی تێکچووبێت، چونکە هەمیشە کە تەلەفۆنم بۆ دەکرد ئەگەر یەکسەر تەلەفۆنەکەی هەڵنەگرتبایە ئەوە لەکاتێکی تر تەلەفۆنی بۆم دەکردەوە، ئە م جارەیان بۆ یەکەم جاربوو نەیتوانی وەڵامی من بداتەوە، تاکو ٢٠٢٢/١/٢١ ڕۆژی هەینی بەیانیەکەی زەنگی تەلەفۆنەکەی نازم دڵبەندی شاعیر بوو کەبە هەواڵی مەرگی مام حەمید ڕەشاش ڕایچڵەکاندم ، بەراستی مەرگی مام حەمید لەوانەیە بۆ خانەوادەکەی کۆستێکی گەورەو خەمناك بوو بێت، بەڵام بۆ من لەم تولەڕێیەدا بە جێی هێشتم و هەمووماني نائومێد کرد لە ئیمزاکردن

لەسەر کتێبەکەی و ئەرکی منیشی قورسترکرد، بەداخەوە مەرگ نەیهێشت نە پێشەکی بنووسێت و نە ئیمزای ناساندنی کتێبەکەشیمان بۆ بکات.

سەختە بۆ من لە ماوەی ئە و پێنج شەش ساڵەی دواییدا لەگەڵ بیرەوەری و یادەوەرییەکانی مام حەمید هەروەکو هەموو ئەو ساڵەی تەمەنی لەگەڵی ژیابم، مام حەمید زیاتر لە سێ چارگە سەدە رێبواری ئەم تونێلە تەنگ و دوورو درێژانە بوو، بەبێ دابڕان خوێندکاری رێبازی جەلالیزم کوردایەتی گۆشکرا بوو، (هەمەدان و بەکرەجۆو قەیەباشی بالیسان و هەولێر و باڵەکایەتی و دۆڵەرەقە و شاربازێرو خۆشناوەتی) تاوەکو بەغدا کەم شوێن هەبێ جێگای گیانبازی ئەم پیرە پیاوەی کوردایەتی نەبوبێت و دەیان جار لە لێواری مەرگ دەربازی نەبوو بێت. ئێوە وەرن سەیری سنووری جوگرافیای ژیانی کوردایەتی مام حەمید رەشاش بکەن، جگە لە وەی هەڤاڵینی سەرکردەی وەکو مامۆستا برایم ئەحمەد و رەوانشاد مام جەلال بووبێت و هاوسەنگەری دەیان پێشمەرگەی قارەمانی قۆناغە جیاجیاکانی شۆرش و کوردایەتی بووبێت لەدەیان تووڵە رێی کوردایەتی بە هەورازی یەکجار سەختدا تێپەربووبێ و بەسەر دەیان لەمپەری گەوردا بازی دابێت، بەراستی بۆمن زۆر سەختە بتوانم لەم چەند دێرەدا هەقی خۆی بدەمێ، مام حەمید زۆر بە کتوپڕی ژیانئاوایی لێ کردین و بەجێی هێشتین بەڵام یادو یادەوەرییەکانی لای هەمووومان دەمینێ.

**ستار محەمەد ئەمین**

٢٠٢٢/١/٢٥

# کاک حەمید ڕەشاشی هەمیشە زیندوو

نووسین لەسەر کەسایەتی و گەورەیی پێشمەرگە ئازاو دڵسۆزەکەی کوردستان، کاک حەمید ڕەشاش نەک تەنها کارێکی هاسان و پاراو نیەو نابێ، بۆیە هیچ کەسێك ناتوانێ بچێتە ژێر ئەو بارە قورس و گرانەو بەتێرو تەسەلی ئەم ئەرکە پیرۆزە جێبەجێ بکات بەخۆشمەوە.

بەهەر حاڵ لەگەڵ ئەم ڕاستیەی سەرەوەش نابێ بچینە دوای ئەوانەی کە دەڵێن (یان هەموی یان هیچی)، بۆیە ئەوەندەی لەتواناو بەردەستدایە لەسەر کاک حەمید بنوسرێت باشترە لەوەی چاوەڕوانی نوسینێکی پاراوو زۆر گەورەو ڕاست و بێ کەموکورتی بکەین کە ڕەنگە بەم زوانە دەست نەکەوێت.

بۆیە داوا دەکەم لەخانەوادە تێکۆشەرەکەی لەگەڵ سەرکردایەتی حزبەکەی و گشت هەڤاڵ و دۆستەکانی ئەوەندەی بۆیان ئەکرێت لەسەر ژیان و کارو کردەوەو ئازایەتی و پێشمەرگایەتی و کوردایەتی و حزبایەتی و دەم ودەست و دەرون پاکی بنووسن، چونکە کەسایەتی و پێگەی کاک حەمید ئەوەندە گەورەو فراوانە باوەڕ ناکەم لەلای چەند کەسێکی سنوردار جێگای ببێتەوە یا دەستکەوێت.

کاک حەمید لەساڵی (١٩٣١) لەگوندی (قەیەباشی) لەناوچەی پردێ لەدایك بووە لەخانەوادەیەکی جوتیاری هەژار، باوکی ناوی حوسێن تەهاو دایکی ناوی ڕەحمە بوو و خێزانەکەشی ناوی مەلەك محەمەد عەبدوڵا بوو.

کاك حەمید لەسەرەتای ژیانی، واتە لەتەمەنی (٦) شەش ساڵی دایکی مردووەو لەتەمەنی (٩) نۆ ساڵی باوکی مردووە، لەساڵی (٢٠١٥) خێزانەکەی کە (٨) هەشت ساڵ لەناو جێگا بووە بەنەخۆشی ئەویش مردووە، خوا بەهەشتی گەورەیان بەنەسیب بکات.

کاك حەمید بەمردنی دایك و باوکی نەك تەنها پشت و پەنا هەر خۆشەویستەکانی لەدەستدا، بەڵکو بێنازو ئاوارە مایەوەو لەخوێندیش بێ بەش بوو، کاك حەمید لەهەرزەکاریەوە سەرقاڵ و ڕاکە ڕاکەی بوو لەپێناو پەیداکردنی ژیانێکی نەمری و نەژی، بوو بەجوتیار، سەپان، تێلەکیش تەنانەت بوو بەڕەنجبەر لەپێناو پەیداکردنی خۆراك و جێگای نوستن لەلای خوا پێداوەکانی هەولێر.

لەتەمەنی (١٥) پازدە ساڵی چووە کۆیەو لەگوندی (کێلەخوان) لەبناری شاخی باواجی بوو بەشوان لەلای (حەمەسورو مورادی) خاوەن مێگەلە مەڕو ئەوانیش لەبەر وشکە ساڵی مەڕەکانیان فرۆشت و کاك حەمیدیش بێکار مایەوە لەگوندەکە.

لەساڵی (١٩٥٧) لەتەمەنی (٢٦) بیست و شەش ساڵی بوو بەسەربازی زۆرەملێ (إجباری) و پاش (١٨) هەژدە مانگ خۆی کرد بەسەربازی خۆبەخش بەمانگانەی (١,٥) یەك دینارو نیو لەگەڵ خواردن و جێگای نوستن کە ئەمە کاك حەمیدی ڕزگار کرد لەدەربەدەری و برسیەتی، سەربازخانەکەشی لەهەولێر لەناوچەی بارودخانە بوو، لەو کاتە خۆم ئەفسەری سوپای عیراق بووم بەپلەی ملازم پانی واتە یەك ئەستێرە لە (سریەی ١٦ ئالیات) لەهەولێر ڕۆژی هەینی بوو ئێوارەکە دانیشتبووم لەباخچەی بەر دەرگای ژوورەکەم (٣) سێ سەرباز هاتنە لام بەناوی (رئیس

عورەفا زەینەل، نائب عریف کەریم، سەرباز حەمید حوسێن تەها واتە کاك حەمید رەشاش) بەخێرهاتنیان لێکردم بۆ هەولێرو دڵخۆش بوون پێم، کە ڕۆیشتن رئیس عرفاو زەینەل گەڕایەوە پسولەیەکی پێمدا تیا نووسرابوو ﴿کاکە زۆر بەخێر بێیت بۆ هەولێر، خاڵت کاك (ع.ع) حەز ئەکات ڕۆژی جومعەی داهاتوو سەعات (٤) چوار بتان بینێت، بۆ ئەو مەبەستە برا گەورەکەت کاك (غ) دێت بەدواتان﴾ لەم ڕۆژە کاك حەمیدم ناسیوە تا ڕۆژێك پێش مردنی پەیوەندی ڕۆژانەم هەبووە لەگەڵی هەزار جار ڕەحمەت لەگۆڕەکەی پاشان بەخۆی و رەشاشەکەی چووە ناو شۆڕشی ئەیلول و بوو بە ئەندامی حزب.

لەزۆربەی شەڕەکان لەپێناو پاراستنی کوردستان و گەلی کورد بەشدار بووەو جێ دەستی بینراوە لەکاتی شەڕی براکوژی لەگەڵ مەکتەبی سیاسی بوو جێگای باوەڕو موتمانەی سەرکردایەتی حزب بوو، لێپرسراوی پاراستنی بارەگای مەکتەبی سیاسی بوو، لەماوەت دیسان بارەگای مام جەلال لەبەکرەجۆو ماوەیەك بووە بەڕاهێنەری (جریکهای جومبشی ئیرانی) کە دژی شای ئێران بوون، هەروەها ڕێکخراوی بەرگری ئەرتیری ئەفریقی لەشارەزا کردنیان بەشداری پارتیزانی و هەموو چەشنە چەکێك لەبەکرەجۆ مەشقی پێدەکردن.

پاش ئاشت بوونەوەی مەکتەبی سیاسی و بارزانی ڕەحمەتی لەهەمەدانەوە لەگەڵ هەڤالان عومەر دەبابەو عەلی عەسکەری و کەمال موفتی و مامۆستا عەباس حوسێن و (٥٠٠) پێنج سەد پێشمەرگە گەڕانەوە کوردستانی عیراق، لەناو شۆڕش کارو فەرمانیان وەرگرت تا ساڵی (١٩٧٥) کە بڕیاری ئاش بەتاڵیاندا گەڕاوە هەولێرو لەناو ریزەکانی حزب کاری بەرچاوی هەبوو دواجار

بووە بەئەندامی (ناوەندی کۆمەڵایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان) تا کۆچی دوایی کرد لەهەولێر لەگەڵ ڕەحمەتی مەلا محەمەد بەحرکەیی.

کاك حەمید لەپاڵ کاری سەربازی و حزبیش خۆی فێری خوێندەواری کردووە بەنووسین و خوێندنەوەی کوردی و عەرەبی و فارسی شارەزابییەکی باشی هەبووە لەزمانەوانی و کەلەپوری کوردی و قسە خۆشەکانی پێشینان و چیرۆکە پڕ لەئامۆژگاریەکان تا ئێستاش (٣) سێ پەرتووکی چاپکردووەو یەکێکیشی لەژێر چاپدایە بەچاودێری کاك ستار محەمەدئەمین و ناوەندی ڕەوشەنبیری یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەهەولێر، ئەم کارە پیرۆزو بەنرخانەی نەك تەنها مێژووی میللەتی کوردو کوردستانی دەوڵەمەند کردووە، بەڵکو پێگەی خۆی و حزبەکەشی زۆر گەورەتر کردووە، هەندێ لەنووسین و کتێبەکانی خراوەتە ناو پرۆگرامی زانکۆکانی کوردستان ودەستگاکان و ڕۆژنامەکانمان.

هەموو ئەو کارانە کاك حەمیدیان کردە کارزمایەکی ئەوەندە گەورەو سوود بەخش بۆ میللەتەکەی کە لەهەموو کوردستان بەڕێزەوە باسیان ئەکردو وێنەو دیداریان لەگەڵ ئەنجام دەداو لەهەموو کۆڕو کۆبوونەوە حزبی و گشتیەکان لەڕێزی پێشەوە دایان ناوە زۆرجار ئەگەر پێکەوە بچووباین ئەوا بەهۆی کاك حەمید منیشیان ئەبردە پێشەوە.

ئەو گەورەییەی کاك حەمید بەتەواوی خۆڕسك بوو، چونکە نە سەرۆك حزب و عەشیرەت بوو نە خاوەن دیوەخان و تەکیەو خانەقاو باڵەخانەو دکتۆراو تاج و نەجمەی سەر شان بوو، بەڵکو تەنانەت خاوەن ئیرادەو باوەڕ بەخۆی بوو، بڕیاری دابوو مل کەچ نەکات بۆ ئەو ژیانە تفتوتاڵەی توشی

هاتووە، باوەڕی تەواوی هەبوو کە مرۆڤ ئەتوانێ گۆڕانکاری لەژیانی خۆی و میللەتەکەی بکا.

تەمەنی کوردایەتی و حزبایەتیم لە (٧٥) حەفتاوپێنج ساڵ زیاترە نەمدیت کەسێك لەئاستی کاك حەمید رەشاش توانی بووبێت لەو چەشنە کاروانەی ژیان کە پڕ بوو لە (ئێش و ئازارو تەنهایی و هەژاری و دەربەدەری و کرێکاری و سەپانی و شوانی و تەنانەت ڕەنجبەریش...) بەسەر بڵندی پێگەو کەسایەتی خۆی بگەیەنێت بەم پلەیە بەرزو پڕ لەسەردەرچەی کە کاك حەمیدی پێگەیشتووە.

کاك حەمید رەشاش بۆ گەلی کورد سەرمایەکی زۆر گەورە بوو ئەگەر کەشوهەوای سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی لەبار بوایە کاك حەمید ئەبوو بەسەرکردەیەکی گەورەتر لەزۆر سەرکردەکانی شەڕی جیهانی یەکەم و جولآنەوەی نەتەوایەتی کورد، بۆیە پێویستە سەرکردەکانی کوردو حکومەتی هەرێمی کوردستان و یەکێتی و پارتی نەهێڵن ئەو سەرمایە گەورەی کورد وون بێت هەوڵی پێویست بدەن لەگەڵ ڕێکخراوی (یونسکۆ) توێژینەوەیەکی قووڵ و فراوان بکەن لەسەر ژیان و کەسایەتی و کارە دەگمەنەکانی ئەو مرۆڤە بێ دایك و باوك و خێزانە، بەهەژاری و دەربەدەری و سەربازی و نەخوێندەواری و پێشمەرگایەتی چۆن توانی ببێتە ئەو کارزما گەورەیە، ئەبێ بیخەنە لیستی کێبڕکێ بۆ بەدەستهێنانی مەدالیاکانی جیهانی کە گومانم نیە بەدەستی دێنێت، گەورەییەکەش بۆ خۆی و میللەتی کورد ئەمێنێ.

نوسین لەسەر گەورەیی و دڵسۆزی کاك حەمید رەشاش تەواو نابێت داخی گرانم سەعات (٧)ی بەیانی رۆژی جومعە لە (٢٠٢٢/١/٢١) لەخەستەخانەی پار لەهەولێر دلە گەورەو ماندووەکەی وەستاو لەمزگەوتی سەید حوسێن لە

حەی عەسکەری مەراسیمی شوشتن و نوێژ لەسەرکردنی بۆ کرا بە ئامادەبوونی هەزارەها لەکەس و کارو هەڤاڵ و هەوادارو ناسیاوەکانی پاشان بردیانەوە ماڵەکەی خۆی بۆ دوا دیدەنی کەس و کارەکەی خواحافیزی بکات تا بەیەك دەگەنەوە بەڕەحمەتی خوا، پاشان بردیانە بارەگای مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان مەراسیمی حزبی بۆ کراو جەنابی هەڤاڵ ڕێبوار بەناوی حزب ووتاری لەسەر خوێندەوە پاشان بەرەو گۆڕستانی کەسنەزان، کە هەزارەها سەیارە بەدرێژایی (٢) دوو کیلۆمەتر بەڕێکەوتن سەعات (٣) سێ بەخاك سپێردرا، هەزار ڕەحمەت لە گۆڕە پاکەکەی و خوا سەبووری خۆم و کەس و کارو هەڤاڵ و هەوادارو ناسیاوەکانی بدات.

داواکارم لە یەکێتی دەستەیەکی حزبی و پێشمەرگەیی بەناو بکات بەزووترین کات.

**پارێزەر / کەمال محیەدین**

٢٠٢٢/٢/١

**هەولێر**

## بۆ هەڵۆ بەرزەفڕەکەی کوردستان مام حەمید ڕەشاش

(حەمید حوسێن تەها) ناسراو بە حەمید ڕەشاش لە ساڵی (١٩٣١) لە بناری چیای شیشار لە گوندی بالیسان کۆرپەیەک لەدایک دەبێت، ناوی دەنێن حەمید، هەر لە سەرەتای ژیانیەوە بەژەکی هەژاری و بێ کەسی فرچک دەدرێت، دەبێت بە مێردمنداڵ و لە زێدی باب و باپیرانی تەرە دەبێت و لە گوندی (قەی باشی) دەگیرسێتەوە. دوای ماوەیەک دەچێتە ناوچەی شەمامك و لەوێ جێگیر دەبێ. مام حەمید ڕەنجدەرو زەحمەتکێش بووە، ئازاو بەهێز بووە، لەکاری کشتوکاڵی (سەپانی و جووتیاری وە پاڵەیی) یەکجار لێزان و پسپۆڕ بووە، لە کارەکانی سەرکەوتوو بووە.

پیاوێکی نەرم و نیان و زۆر هێورو لەسەرخۆ بووە، بۆیە خۆشەویستی ناو کۆمەڵانی خەڵکی ناوچەکە بووە، ماوەیەکی زۆر بە ڕەنجبەری ڕادەبوێری، شارەزایەکی زۆر لەناو کەرستەو ئامێری کشتوکاڵی پەیدا دەکات. لەپێش پەنجاکان دەچێتە ڕێزی سەربازی و زۆر شوێن و ناوچە بە سەربازی دەگەڕێ و دەبینێ لە سەربازی لە ڕێگای برادەرێکی خۆی دەچێتە ڕێزی پارتی دیموکراتی کوردستان، خۆی گۆتی زۆر هەستم بە چەوسانەوەی نەتەوەکەم دەکرد، هەموو ئاواتم ئەوەبوو ببمە پارتی بۆ ئەوەی بتوانم بەرگری لە نەتەوەکەم بکەم. هەر کە پێی گۆتم بۆ نایە ڕێزی حزب (کاک حەمید) هەر وەختبوو شاگەشکەم لە خۆشیان لەسەر دەستی ئەو بەڕێزە بوومە پارتی و زۆر بە دڵسۆزی کارم بۆ حزب دەکرد. زۆر کەسی تێکۆشەرو خەباتگێڕم بە

نهێنی ناسی و هامووشۆم لەگەڵیان پەیدا کرد. هەتا ساڵی (١٩٥٨) کە شۆڕشی عەبدولکەریمی ڕوویدا، پارتی لە هەموو ڕوویێکەوە گەشەی زۆری کرد، تاکو ساڵی ١٩٦١ .

لەو ماوەیەدا بوومە لێپرسراوی پارتی لە لیوای دووی هەولێر لە ساڵی ١٩٦١ لەگەڵ چەند هەڤاڵێکی تری پارتی بڕیارمان دا (مشجب سلاح) جبەخانەی سەربازگەکەمان ببەین سەربازەکانیش بەدیل بگرین، چونکە ژمارەی کوردەکان لەم فەوجەدا زۆر بوو، بەڵام نەکراو دواخرا. هەر ئەو ساڵە (١٩٦١) فەوجەکەیان دەگوازرێتەوە بۆ (ڕانیە) لەگەڵ جاڕدانی شۆڕش پەیوەندی بە شۆڕشەوە دەکات، مام حەمید سەرەتا دەچێتە لای عەباسی مامەندئاغا لە دواییدا دەچێتە (ناوچەی پارتی) لە گوندی پاشقۆتەل. گوتی لە سەرەتادا ئیش و کاری بارەگایان پێ دەکردم، چالاکییەکی پێشمەرگە هاتە پێشمان، کەس نەیوێرا خۆی لێ بدات، گووتم من ئەنجامی دەدەم و بەسەرکەوتوویی ئەنجاممدا، دوای ئەو چالاکیەی کە کردم هەڵسوکەوتی هەڤاڵانم بەرامبەرم بە تەواوی گۆڕاو بە چاوێکی زۆر بەرز سەیریان دەکردم، چونکە زانیان کە من ئازایەتی و توانام بایی چەندە، گرنگی زۆریان پێ دەدام، بەڕێزان مام حەمید خۆی کەسێکی بەهرەدار و زیرەك بوێرو بە جەرگ بووە، وەك دەڵێن شۆڕش مرۆڤی شۆڕشگێڕ دروست دەکات ئەلێرەدا گەورەیی مام حەمید و وانەی شۆڕش تێکەڵ بە یەك دەبن کەسایەتییەکی یەکجار بەرز بۆ مام حەمید دروست دەبێت.

مام حەمید دەچێتە قۆناغێکی ترەوە لەناو شۆڕشدا، هەمووجار دەیگوت: من ئەوکاتیش گوتوومە کوردایەتی خەرمانەیەکە لە شەرەف و بەرگری، دەبێ

لەم خەرمانەیەدا من بەشم هەبێ بەم بیرکردنەوەیە لەنێو شۆڕش و خەباتی ئەیلوولدا بوو، بۆیە توانی رۆژانی سەخت و بەستەڵەك و پڕ لە ناخۆشی و رێبازی سەختەرێگا هەڵبژێری و كۆڵ نەدات و بیكاتە ئاوات و ئامانجی دوارۆژی خۆی، نەترسێت لە برسیەتی و شەو و شەونخونی ناخۆشی رۆژگاری پێشمەرگایەتی. لەنێو شۆڕش دەبێتە هەڵۆیەكی بەرزەفڕی سەرلووتكەی شاخەكانی كوردستان و دوژمن بەزێن دەبێت بە هاوڕێ و هاودەمی (مام جەلال). چونكە مام جەلال بە شامێدی هەموو ئەو تێكۆشەرانەی كە لەگەڵی بوونە زۆر ئازاو چاونەترس بووە، بۆیە هەر زوو (مام حەمید و مام جەلال) دەبن بە دوو هاوڕێی گیانی بە گیانی یەكتری. چونكە بەراستی هەردووكیان زۆر بوێر بوونە.

ـ نازناوی رەشاش:

ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵ (مام جەلال) دەبن (٥ ـ ٦) كەسیان ناویان حەمید دەبێت، مام جەلال دەڵێت بۆ لە یەكتری جیاكردنەوەتان و ناسینتان دەبێ نازناوتان بۆ دابنێم لەبەرئەوەی مام حەمید چەكەكەی رەشاش دەبێت، ناوی دەنێت حەمید رەشاش، ئەوكات لە گوندی پیرەر دەبن (رەشاش) چەكێكی قورس بووە هەر لە ئازایەتی و بوێری مام حەمید وەشاوەتەوەو توانیویەتی بەكاری بهێنی و دوژمنی كوردی پێ بتەزێنی بۆیە بوویتە نازناوی ئەو پاڵەوانەو قارەمانەی كوردستان. ببێتە نازناوێك بۆ ناسینی خۆی و نەوەو نەتیژەی مام حەمید دەبێتە مەدالیایەكی ئیفتخاری گران بەها لە گەردەنی بەرزی بكرێت، هەتا هەتایی پێی بناسرێتەوە.

**خوێندەواری مام حەمید:**

لە هیچ قوتابخانەیەك وانەی (دوو داری دی نەخوێندووە) فەقێ و فەقێلەی هیچ حوجرەیەك نەبووە خۆی بەهرەدار بووە بیری لەوە کردۆتەوە ئەز چەوابی نەخوندەوار بم، بۆیە هانا بۆ ئەم و ئەو دەبات تا مامۆستا قوربانتم ئەو پیتە مانای چییەو ئەز قوربانی چاڤا تەمە ئەم ئاخافتنە چ دەبێژی و لەو بوارەش کۆڵ ناداو تا تەواو دەبێتە خوێندەوار. لە لایەکی تریشەوە بە پێشمەرگایەتی گوند و چیاو دۆڵ و پێدەشت و دارو بەردی کوردستان دەبینێت و هەموو ناوەکان و پەندو ئیدیۆم و چیرۆك و قسەی نەستەق لە کۆگای مێشکی خۆی تۆمار دەکات هەتا دەبێتە زماناس و زمانزانێکی یەکجار گەورەو ناسراو چوار پەرتووك دەنووسێت بە ناوەکانی:

١- ژیانی کوردەواری

٢- پەندی کوردی

٣- هەوارگەی وشە

٤- هەگبەی زاراوە رەسەنەکان

کە بارتەقای چل پەرتووکە، لەبەر گرنگی و بەسوودی و دەوڵەمەندی هەگبەی زاراوە رەسەنەکان (قاموسە) لە زانکۆی کۆیە کراوە بە مەنهەج بۆ قوتابیان.

لەگەڵ مندا (٣٠) حەلقەمان لە پەندو چیرۆك و ئیدیۆم و وشەی رەسەنی کوردی بۆ (tv) رەسەن تۆمار کردووە بۆ ماوەی ٢ ساڵ لە رۆژنامەی هەولێر بە جووتە بە دەیان بابەتمان لەسەر کەرستەکانی زمانی کوردی نووسیوە.

جگە لەو نووسینانەی کە مام حەمید نووسیویەتی لە گۆڤارو رۆژنامەو تیڤییەکانی تریش زۆر بابەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و پێشمەرگایەتی

نووسیوە، بۆیە مام حەمید جگە لە رەشاشەکەی بە قەلەمیش بەقەد چیایەك بەرگری لە زمان و ئەدەبی کوردی کردووە.

مام حەمید ئوستادی زمان و ئەدەبی کوردی بوو بالآی بەقەد منارەی چۆلی بەرزەو ئازایەتی و زیرەکی و دڵسۆزی و جوامێری بەقەد قەلآ سەرکەشەکەی هەولێرە، روحی پاکی ئەو پیاوە مەزنەو پاك و بێ گەردە ئەستێرەیەکی گەشە لە ئاسمانی کوردستان و شاری هەولێر لە شەوانی تارو تاریك هەڵدێ و دەبێتە چرای رووناکی رێگای خەبات و تێکۆشان و نووسین بۆ نەوەی نوێ.

لە کۆتاییدا دەڵێم هاورێی ئازیزو خۆشەویستم تۆ هەر نەمری گوڵێکی لە باغی سەربەرزی و سەرفرازی نەمران بۆنی خۆش و جوانت نابڕێ و دەرِوات و دەداتەوە لە هەر چوار پارچەی کوردستان.

**م. عەبدولوەهاب شێخانی**

# پێشەکی

بیرۆکەی لەدایك بوونی ئەم کتێبە بە ناوی تولەرێیەکانی کوردایەتی لە سەرەتا لە رێگای بەرنامەیەکی تایبەت بەناوی (بۆ مێژوو) بەشی دۆکیۆمێنتی تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان کەناڵی هەولێر بوو، دوای راوێژکردن لەگەڵ برای بەرێزم کاك هاوڕێ رواندوزی بەرێوەبەری تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان کەناڵی هەولێر، دەست نیشان کردنی کەسایەتیە دیارەکانی هەولێریێ بوو بۆ بەشداری کردن لەم بەرنامەیە، یەکێك لەوانەی دەستنیشانمان کرد مام حەمید رەشاش بوو، دوای پەیوەندی پێوەکردنی یەکسەر وەڵامی بە ئەرێ دایەوە، ئەوەبوو لەگەڵ برایانی وێنەگر پێشرەو خالید و سەنعان هەولێری هەروەها برای بەرێزم کاك حەمید سابیر چاوساغ و هاوسەفەرمان بوو لە هەموو گەشتەکەمان لە خوشناوەتی، ئاکۆیان، شارەزوور، دەشتی هەولێرو باڵەکایەتی و وراتی کۆیە، چەمی رێزان و ئەشکەوتی مالومەو بێتواتە، بالیسان و قەیە باشی و زۆر شوێنی تر بۆ هەموو ئەو شوێنانەی کە مام حەمید لێی ژیاوە یاخود پێشمەرگایەتی لێ کردبوو، ماوەی مانگێك ئێمە ناوە ناوە هاوسەفەری مام حەمید بووین، هەموو ئەو شوێن و تولە رێیانەمان بەسەر کردنەوە، کە رۆژێك لەرۆژان جێگای ژووانی مام حەمید بوون ، زیاتر لە ٩ سەعات بوو تۆمارمان کرد.

دوای ئەوەی سێ ئەڵقەی پوختەمان بۆ تەلەفزیۆن ئامادەکردو پێشکەشی بینەرانی گەلی کوردستانمان کرد بەراستی کاردانەوەی چاکی هەبوو لەلایەن بینەران شارەزایانی بواری مێژووی کورد.

بۆیە بە باشم زانی هەموو ئەو چاوپێکەوتنەی لەگەڵ مام حەمید ئەنجامم داوە بەتاڵی بکەم و لەرۆژنامەی کوردستانی نوێ بلاّوی بکەمەوە، دوای ئەوە بیرم لێ کردەوەو بە پێویستم زانی ئەم یادەوەرییانە تۆمار بکرێن و بکرێن بە کتێب و لەدووتوێی کتێبێکی مێژوویی چاپی بکەم، ئەوەبوو دوای راوێژ کردن لەگەڵ برای بەرێزمان کاك ستران عەبدوللا گووتی زۆر باشە چیتان دەوێ بۆتانی بکەین، هەر کە زانیم کاك ستران پێیباشە لەگەڵ مام حەمیدیش قسەم کرد، دیاربوو زۆری پێخۆش بوو، ئەوەبوو هەندێك لەو بابەتانەی لای خۆی وەکو دەستنووس هەڵیگرتبوون لێم وەرگرتن و هەموویم چاپکردوو و کۆم کردنەوە، لەگەڵ هەندێ وێنەی کۆن و نوێی مێژوویی، بەراستی رۆژانە لە پەیوەندی دابووم لەگەڵ مام حەمید، زۆر بابەتی تر لە یادەوەرییەکانی لەدوای چاوپێکەوتنەکە بەبیری هاتنەوەو خستمانە سەر بابەتەکانی تر، مام حەمید لە گێڕانەوەی یادەوەرییەکانی هەتابڵێی نەرم و نیان و زۆر بە دیقەت و لەسەرخۆ تیشکی دەخستە سەر هەموو بیرەوەرییەکانی بە باشی و خراپەکانی.

لە سەرەتادا زیاتر باس لە ژیانی خانەوادەکەی دەکا و یادەوەرییەکانی منالّی خۆی دەگێڕێتەوە هەر لە منداڵی دایك و باوکی کۆچی دوایی دەکەن و مام حەمید دوور لە نازی دایك و باوکی گەورە دەبێت. بەراستی تراجیدیایی زۆر هەیە لە ژیانی مام حەمید، هەر بۆ بژێوی ژیانی چەندین گوندی کوردستان گەڕاوە، لەسەرەتادا دەبێتە شوان و بە کشتوکاڵەوە خەریك

دەبێت، لە قۆناغی دووەمی باس لە ژیانی خۆی دەکا لەناو سوپای عێراقی و چۆنیەتی پەیوەندی کردنی بە پارتی دیموکراتی کوردستان و بوون بەپێشمەرگەو بیرەوەرییەکانی پێش هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول و جیابوونەوەی باڵی مەکتەبی سیاسی، دیارە لەگەڵ جیابوونەوەی باڵی مەکتەبی سیاسی بەهۆی نزیکی لە مامۆستا برایم ئەحمەد و مام جەلال زۆر بەوردی تیشك دەخاتە سەر ئەو ڕووداوانەی ناو پارتی دیموکراتی کوردستان.

ئەوەی زۆر گرنگە مام حەمید لە گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانی خۆی زۆر ڕاستگۆیانە و بەرێزەوە باس لەیارو نەیارەکانی دەکات.

مام حەمید پیاوێکی زۆر پشوو درێژ و بەسەلیقە بوو سەرە ڕای ئەوەی لە سەرەتای ژیانی هەمووی کولەمەرگی و هەژاری و بێ دایك و باوکی وای کردووە بە هەتیوی گەورە بووە، هەر بۆیەش لەسەرەتای ژیانیدا نەخوێندەوار بووە، بەڵام کۆڵی نەداوەو لە پێشمەرگایەتیدا خۆی فێری خوێندەواری دەکات، تاوای لێدێت لەسەردەمانێك سەرپەرشتی لقی پارتی دیمکراتی کوردستان باڵی مەکتەبی سیاسی دەکات و پێش دەکەوێت، بەراستی زۆر زەحمەتە بتوانم باسی هەموو سیفەتە جوانەکانی مام حەمید بکەم، لەبیرمە کاتێ خەریکی تۆمارکردنی بیرەوەرییەکانی بووە لە گەشتێکمان پێکەوە چوینە بەکرە جۆ لەوێشەوە سەردانی مامۆستا عەبدولرەقیب یوسفمان کرد دۆستی دێرینی مام حەمید بوو مامۆستا گووتی حەمید ئیشێکی باش دەکەی بیرەوەرییەکانی خۆت تۆمار دەکەی لەبەرئەوەی زاکیرەیەکی باشت هەیە ڕووی لەمن کرد و گووتی ئافەرین بۆ تۆش کەسایەتێکی زۆر چاکت هەڵبژاردووە باس لە م مێژووە بکات ،

دڵنیام مام حەمید ئەگەر کورد نەبووایە ژیانی دەیان چیرۆك و رۆمانی لەسەر دەنووسرایەوە، هەر لە ژیانی بێ دایك و باوکی و نەخوێندەواری پەیوەندی کردنی بەهێزی پێشمەرگە و جوولانەوەی شەواف و شۆرشی ١٤ ی تەمووز، بەکرەجۆ و هەمەدان، ئەشکەوتی مالومەو ئاوەکورتە، پێنجوین و ماوەت و چەمی رێزان، ئەوانە هەمووی چیرۆکی ژیانی مام حەمیدن جگە لەوەی لەرووی ئیدارییەوەش پیاوێکی زۆر وردو بەسەلیقە بووە لە ئیدارەدان، تاوەکو هاتنی ڤایرۆسی کۆڤید ١٩ مام حەمید لە مەکتەبی کۆمەلایەتی سەرپەرشتیاری بەشی ئیدارەی لقی هەولێری مەکتەبەکە بووە و هەم ئەندام مەکتەبیش بووە، بەراستی ئەوەها ئاسان نییە بتەوێ باس لە ژیانی مام حەمید رەشاش بکەی.

سەرباری ئەوانە هەمووی، مام حەمید نووسەرێکی چاکی بواری کلتوری بووە و شارەزایەکی باشی بابەتە کۆمەڵایەتیی و کلتوورییەکان بووە، لەهەموو ئەوانەش گرنگتر مام حەمید پیاوێکی زۆر بەوەفا بووە بۆ هەموو دۆست و برادەرەکانی، ئەگەر بەتولە رێیەکانی مام حەمیدا بچیتەوە، لەم کتێبە بۆتان بەدیار دەکەوێت کە کەم کەس هەیە لە قۆناغێك لەقۆناغەکان هەڤاڵی مام حەمید بووبێ ئەو باسی نەکردبێ، بەتایبەتی ئەگەر لە ژیان نەمابووبێت هەرهیچ نا وتارێکی لەسەر نووسیوەو بلاویکردۆتەوە یان ئەوەتا ئەگەر لە ژیان مابووبێ سەردانی کردوون، بەراستی ئەو سیفەتانەی لە مام حەمید هەنە دەگمەن و لە کەم کەسدا هەیە بەو تەمەنەیەوە هەموو رووداوەکانی زۆر بە وردی لە زاکیرەی تۆمار کردووە، زۆر بە باشی لە میمۆری مێشکیدا هەڵی گرتوون بۆ نەوەی ئیمرۆ ، دەتوانم بڵێم مام حەمید مەوسوعەی سەردەمی خۆی بووە، زۆر بە ئامانەتەوە وەکو خۆی شتەکاتی

گێڕاوەتەوە، هیوادارم هەمووان کە ئەم کتێبە دەخوێننەوە بابەتە باشەکان سوودی لێ ببینن و ئەوانەی کە تێبینیتان لەسەری هەیە ئەویش پەندی لێ وەرگرن، مام حەمید گووتەنی ئێمە هەتا ئێرەمان هێنا بەباش و خراپی سوودی لێ وەرگرن .

شتێکی زۆر گرنگم بە بیر هاتەوە ئەو کاتەی گەیشتینە گوندی ئاوەکورتە باسی جیابوونەوەکەی پارتی کرد گووتی ماڵوێرانیەکەی کورد لێرە دەستی پێکرد، من نامەوێ باسی شەڕەکان بکەم چونکە بەهەموو شێوەیەك شەڕ خراپە بەتایبەتی ئەگەر ناوخۆیی بێت ئەوە خراپترە بۆیە من بە هیچ شێوەیەك باسی ئەو ڕۆژانە ناکەم داوای لێبوردنتان لێ دەکەم .

ئەم بابەتە ماوەیەکی باشە لای من ماوەتەوە چەند جارێك ویستوومە کۆی بکەمەوەو بیکەمە کتێبێك لە بیرەوەرییەکانی مام حەمید، هەندێك بابەتی تری هاتووەتە سەر، دواجار هەرکە چوومەلای مام حەمید گووتی با بابەتەکانی کوردستانی نوێشی تێبکەین ئەوەبوو لەرێگای کاك حەسەن یاسین قائیمەکەیم لە مام حەمید وەرگرتوو لەگەڵ خۆی بردیەوە بۆ سلێمانی، پاش ماوەیەك بابەتەکانی بۆ ناردینەوە لەگەل کاك مەسعودی مەلاهەمزە لێپرسراوی ناوەندی هەولێری مەکتەبی راگەیاندن بڕیاری لە چاپدانیمان وەرگرت، کە وەك بڵاوکراوەی ناوەندی هەولێری مەکتەبی راگەیاندن چاپ و بڵاوی بکەینەوە.

بە دەرفەتی دەزانم کە سوپاسی سکرتاریەتی سەرۆك مام جەلال بکەم، کە دڵسۆزانە هاتنە مەیدان و وەك وەفایەك بۆ خەبات و تێکۆشانی مام حەمید رەشاش بڕیاریان دا کتێبەکە لەسەر ئەرکی خۆیان چاپ بکەن.

لێرەدا دەمەوێ سوپاسی هەموو ئەوانە بکەم کە هاوکارم بووینە بۆ لەچاپدانی ئەم کتێبە بەتایبەتی برای بەڕێزم نازم دڵبەندی شاعیر کەئەرکی پێداچوونەوەی خستە ئەستۆی خۆی، هەروەها کاک بەیاری مامۆستا خالید و سامی کەمال و پێشرەو خالیدو کاک مەهدی ئەحمەد ئەوانە لە م دواییەدا زۆر هاوکارم بووینە.

ستار محەمەد ئەمین



ستار محەمەد ئەمین لەگەڵ مام حەمید رەشاش

# دەقی بیرەوەرییەکانی حەمید ڕەشاش
# لە بەرنامەی بۆ مێژوودا

ئەو یەکێکە لە کەسایەتیە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان کە تەمەنێکە، نزیکەی بۆ سێ چارەگە سەدە دەچێت، بەگوڕو تینێکی ماندوو نەناسانەوە بێئەوەی بۆ ساتێکیش پشووی دابێت، لە کاروانی کوردایەتی و کوردەواریدا نەوەستاوەو، بۆ تەنیا ساتێکیش ووچانی نەداوەو تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت لەم کاروانە دانەبڕاوە ئەو کەسایەتیەش (مام حەمید ڕەشاشە) کە بۆتە یەکێك لەو کەسانەی دەتووانرێ لەڕاستگۆییدا متمانەی پێبکرێ و گوێ بۆ بیرەوەریەکانی ڕا بگیرێ و بە ووردی هەڵوەستەی لەسەر بکرێ ، بۆ ئەوەی مێژوو لە لاپەرەکانی خۆیدا بە دڵنیاییەوە تۆمار بکات ئەوەی پێویستە لێرەدا لەسەر خوێنەری کورد بەگوێو بەهەستی خوێندنەوە لە باس و ڕووداوەکانی ئەم پیاوە بڕوانێو لە بەسوودەکانی کەلك وەربگرێ و لە هەڵەو شکەستەکانیش پەند وەربگرێت، بەر لەوەی بێینە سەرەدێری بیرەوەرییەکانی، پێویستە چەند زانیارییەك لەسەر ژیانی ئەم پیاوە ماندوو نەناسە بزانیین.

مام حەمید ڕەشاش دەربارەی، ناسانامەی ژیانی خۆی لە سەرەتادا ووتی: من ناوم (حەمید حوسێن تەهایە) ناسراوم بە (حەمید ڕەشاش) لە عەشیرەتی خۆشناوم خەڵکی گوندی بالیسانم لەبەرەبابی (میروسوم) زیاتر لە سەد ساڵ دەبێت، ئەو کاتە بنەماڵەکەمان بەهۆی کێشەیەکی کۆمەڵایەتی

لەنێوانیاندا لەگەڵ بنەماڵەیەکی تر لە گوندی بالیسان کێشەیەك دروست دەبێ، بەهۆی ئەم کێشە کۆمەلأیەتیەوە گوندی بالیسان بەجێ دەهێڵن و دەچنە ناوچەیەکی تر لە سەر زێی بچووك لەشارۆچکەی پردێ ئەویش گوندی (قەیە باشیە) بۆ ئەوەی کێشەکەی نێوانیان کۆتایی پێ بێت لەوێدا دادەگیرسێنەوە، ژیان لەوێدا دەبەنەسەر، بۆیە من لە گوندی قەیەباشی لەساڵی ١٩٣١ لەدایك بوویمە، هەر بەهۆی ئەم کێشە کۆمەلأیەتیەوە بۆ ئەوەی نەمان دۆزنەوە باوکم ئەو گوندەشی بە جێ هێشتووە ، هەر لەم ناوچەیە لە گوندێکی تریەناوی قەرەبەگەوە ، ئەویش لەسەر زێی بچووك بووە ، لەوێ ماوەیەك نیشتەجێ بووین ، من مناڵ بووم تازە فامم دەکرد لەم گوندەدا فێری تاڵ و شیرینی ژیان بووم واتە قەرەبەگ بۆ من بۆتە سەرەتای یادەوەریە ناخۆشەکانی ژیانم، من لەوێوە لەمانای ناخۆشیەکانی ژیان گەیشتم.

لەبیرمە ئەو خێزانەی ئێمە لەدایکم و باوکم و لە دوو براو خوشکێکمان پێکهاتبوو، براکەم ناوی مەجید بوو خوشکەکەشم ناوی لەعلێ بوو، هێشتا لەگوندی قەرە بەگ بووین مەجیدی برام ناوی بۆ عەسکەری هاتەوە، هەر لە یەکەم مۆڵەتی سەربازیدا کە وەریگرتبێ بۆ ئەوەی سەر لەماڵەوە بدات، لە دوای سێ مانگی ئەرکی سەربازی، باوکم لێ نەگەڕاو ڕازی نەبوو بگەڕێتەوە بۆ سەربازی، بۆیە هەستا بەبێ ئەوەی مەجیدی برام هەست پێبکا جلوبەرگەکەی سەربازی لەناو تەویلەی مانگاو ڕەشە ولأخان شاردەوە.

هەر ئەو شەوە منیشیان لە خەو هەڵساند ووتیان هەستە لێرە باردەکەین دەڕۆین، بەیانیەکەی زۆر زوو هێشتا ئەستێرە بە دەرەوە بوون لەزێی پەڕینەوەو چووین بۆ گوندی (قوچە بلْباس) کە گەیشتینە ئەوێ یەکەم شت

ناوی مەجیدی برامیان کرد بە مەحەمەد، سەرەتا نەمدەزانی بۆ ناوی براکەمیان گۆڕی، لەدواییدا تێگەیشتم بۆ ئەوەیە لەخزمەتی سەربازی بیشارنەوە بۆ ئەوەی کەس نەمان ناسێتەوە، تازە فەراقە ببووم، تەمەنم شەش حەوت، سالێك دەبوو لەبەر هەژاری و نەداری بۆ بژێوی ژیانی خانەوادەکەمان منیان خستە بەر کارو بەرخ کردمیان بە بەرخەوان ئەوەبوو بەیانیان زۆر زوو کاروبەرخم دەبردە دەورووبەری گوندی لە گردی قەرەچناغە دەم لەوەڕاندن.

ئەوەبوو ڕۆژێکیان لەگەڵ چەند برادەرێکی تر ئەوانیش بەرخەوان بوون بەرخۆلەکانیان وەکو من دەهێنایە ناو قەرسیلێ، پێکەوە خەریکی یاری (کێلە بەردانێ) بووین و هەر ئۆتۆمۆبیلێکیش بەم نزیکانەدا بهاتبیایە ئەوە بەردمان بۆ دەهاویشت یەکێك لەو برادەرانەمان بۆ بەدبەختی بەردێکی هاوێشت، بەر یەکێك لەو تانکەرانە کەوت و جامی شووشەی پێشەوەی تانکەرەکەی شکاند، ئەو تانکەرانە موڵکی حکومەت بوون، نەوتیان دەگواستەوە بۆ شارەکان ، شوفێرەکەی بە دوامان کەوت زۆر ماندو بووین ئەوەبوو توانیان یەکێك لە و برادەرانەمان دەستگیر بکەن بەناوی (عەزیز) کە ئەویان گرت، لەگەڵ خۆیان بردیان بۆ هەولێرێ بەیانیەکەی زوو پۆلیسی شاری بەسواری ولاَخ هاتنە گوندی، جەلبیان هێنا بوو، چونکە هەر کە عەزیزی برادەرمان گیرابوو لەوێ ناوی هەموومانی دابووە پۆلیسەکان ئەوانیش بەدواماندا هاتبوونە گوندی و ئێمەشیان گرت و بردمانیان بۆ شاری، لە قشلەی سواری تا لە هەولێرێ بمان خەنە زیندانێ، هەریەکەو لە ئێمە کەسێکی خۆمانی لەگەڵ هاتبوو بۆ هەولێرێ لەبەر ئەوەی ئێمە هێشتا منداڵ بووین لەوێدا هەریەکەو روبعە دینارێکیان سزا بۆ نووسی بووین ئەوەبوو لەوێ هەریەکەو ئەوانەی لەگەڵمان

هاتبوون پارەکەیان بۆ داین و ئازادکراین و کەسوکارەکەشمان زۆر سەر زەنشتیان کردین، ئینجا گەراینەوە گوندی قووچە بلباس.

هێشتا لە گوندی قووچە بلباس بووین تەمەنم حەوت ساڵان بوو دایکم تووشی نەخۆشیەکی کوشندە بوو ئەوەبوو دایکم لەوێ کۆچی دوایی کردو بەجێی هێشتم، بەڕاستی کەلێنێکی گەورە لە ژیانم بۆ من دروست بوو، بەداخەوە زۆری پێ نەچوو باوکیشم بەجێی هێشتم ئەویش کۆچی دوایی کرد، لەدەستدانی دایك و باوك لەم ماوە کورتەو لەم تەمەنەدا، بۆمن زۆر سەخت و ناخۆش بوو ئەوە بوو بە نەمانی دایك و باوکم هەتیو مامەوە لای براو برازنم مامەوە، ئەوانیش لەگەڵ مندا هەڵسوکەوتیان زۆر خراپ بوو، ئەوەندەی پێ نەچوو لەدوای مردنی دایك و باوکم براکەم منی کردە شوانی ماڵی خدری شەمێ)، هێشتا منداڵ بووم زۆر گوندو شوێنی پێ کردم بۆ ئەوەی شوانیم پێ بکات، هەموو ئەو شوانیانەشی کە بەمنی دەکرد داهات و پارەو پوولەکەی هیچی بۆ خۆم نەبوو، هەموو ئەو شەرتە شوانیانەی من کردبووم نەمدەزانی پارەکەی چەندەو چۆنە هەر هەمووی خۆی و خێزانەکەی لووشیان دەکرد، بۆ من تەنیا نان و زگ بوو هیچی تر، زۆر لە ژیانی خۆم بێزار ببووم، بەلام هیچم لە دەست نەدەهات.

لای خۆمان ئەو ساڵە نەهات بوو ژیان و گوزەرانی خەڵکەکە زۆرخراپ بوو، هەر بۆیە مەجیدی برام لە گەل خاوەن موڵکەکانی باش موسیان لە بیتوێن رێك کەوتبوو هەندێك پارەیان لێ وەرگرتبوو بە سەرداهاتی تووتن، لەم پارەیە مەجیدی برام تەنیا یەك شەرواڵی جانگی بۆ من کڕی، ئەوەی تری تاکو ئێستاش نازانم چی بەسەردەهات و چۆن سەرفی دەکرد، گوندی شێخ وەسانان لای من زۆر گرنگە لەبەر ئەوەی من دووجار ڕێم کەوتۆتە ئەو گوندە

بە تایبەتیش گەلی شێخێرێ لە شێخ وەسانان، یەکەمیان لە ساڵی چلەکان بوو ئەو کاتە شوان بوویمە وەك شوانێك چوویمە بۆ بەر شەوینی مەڕەکانم دەبرد بۆ لەوەراندن شەوەکەشی دەمامەوە لە ئەشکەوتی گەلی شێخێرێ تا بەیانی لەوێ دەمامەوە لەگەڵ مەڕەکان شەوینم دەکرد، دووەمیانیان ئەو کاتە بوو کە هێزەکەمان لە ئێران لە شاری هەمەدان گەڕایەوە بۆ کوردستان بۆ یەکەم جار لە شێخ وەسانان، مایەوە ئەو هێزە بەفەرماندەی رەئیس کەمال موفتی بوو لەشێخ وەسانان لە ئەشکەوتی شێخێرێ ماینەوە، لێرەوە با بەس بێت بۆ ئەوەی ڕێزبەندی بیرەوەرییەکانی خۆم لێ تێك نەچێ.

جا ساڵی ١٩٥٣ بوو لە هەولێرەوە دەچووم بۆ کرکوك بەدوای ئیش و کارو کەسابەت دەگەڕام چەند ڕۆژێك لە کەرکوك مامەوە، هیچ ئیش وکارم دەست نەکەوت، بۆیە لە دواجار بڕیارمدا بگەڕێمەوە گوندەکانی لای خۆمان لەدەشتی هەولێر، دووبارە دەست بە شوانی و ڕەنجبەری و جوتیاری بکەمەوە، بە پیادە گوند بە گوند بەدوای ئیش دەگەڕام بۆ بژێوی ژیانم تاکو گەیشتمە شارۆچکەی پردێ و گوندەکانی دەورو بەری لە گوندی (شەعەل) خۆم گرتەوە، بووم بە سەپانی نوری ناوێك، ئەوەبوو زۆر لەم گوندە نەمامەوە، کەوتمە ناو کێشەی جووتیارەکانی گوندی شەعەل و ئاغاکایان کە گەیشتمە ئەوێ تازە گرژییەك لەنێوان ئاغاکان و جووتیارەکانی ئەو گوندەدا دروست ببوو، بۆیە ئاغاکان بە دوای ئەوەبوون تۆڵە لە جوتیارەکان بکەنەوە، بۆ ئەم مەبەستە ئاغاکان مەفرەزەیە کی سەربازییان هێنابوو بۆ سەر گوندی شەعەل و هەرچی گەنج و کوڕو کاڵی گوند بوو لەفیرارو موتەخەلیفی سەربازی هەر هەموویان گێسك لێداو بردیانن بۆ بەندیخانەی دیبەگە، بۆ بەدبەختی منیش بەبەر ئەو ڕاپێچ کردنە کەوتم، لەپەرێزێ کارم دەکرد

منیشیان لەگەل خەڵکی ئەو گوندە گلدایەوە بۆ شارەدێی دیبەگەیان بردین، لەوێ ناوەکانیان خوێندەوە ئەوە بوو ناوی من لەگەڵ ئەوان نەبوو. بەڵام لەوێدا یەکسەر بیرۆکەی ئەوەم بۆ هات کە خۆم لە شوانی و سەپانی دەرباز بکەم بۆ ئەوەی لە لایەکەی تریش خۆم لەدەستی مەجیدی برام رزگار بکەم و ببم بە سەرباز، ئەم بڕیارە هەر چەندە تۆزێك ناخۆش بوو کارێکی نامۆش بوو، چونکە ئەو کاتە خەڵك لەبەر سەربازی هەڵدەهات منیش بە پێی خۆم چووم ببم بە عەسکەر، بەڵام بۆ من ئاسایی بوو، ئەویش لەبەر بێ کەسی و بێزاری ژیانی خۆم بوو هەر بۆیە بەپێچەوانەی خەڵکەکە بەزۆری خۆم کردە عەسکەر. پاشماوەیەکی کەم بردمیان بۆ شاری موسڵ، پاش ئەوەی بۆ عەسکەری ڕەوانەی موسڵ کرام زۆر ئارەزووی ئەوەم هەبوو ببم بە حیزبی و لە ڕیزەکانی سوپا بۆ حیزب کار بکەم، ئەوە بوو لەساڵی ١٩٥٥ لەشاری موسڵ لە ڕێگای نائب عەریفێك بەناوی یاسین جوامێر پەیوەندیم بەپارتی دیموکراتی کوردستانەوە کرد، هەروەها لەساڵی ١٩٥٦ دوای ئەوەی بڕیارمدا بەیەك جاری لەسەربازی بمێنمەوە وەك خۆبەخش، ئەوەبوو مووچەکەم زیاد بوو.. بوو بەپێنج دینار هەر بۆیەش بڕیارمدا ژن بهێنم، دڵم زۆر پڕە هەر بەدڵ پڕیەوە وەسفی خێزانەکەی خۆمتان بۆ دەکەم ئەو خێزانەی بەهۆی منەوە زۆر زەحمەتی کێشاوە، من لە کوێ بوویم ئەویش لەوێ بووە پەندێکی کوردی هەیە دەڵێ: (پیاو هەندوە ژن لە دووە) ژنەکەی من یەکێك بووە لەو دە ژنەی هەولێرێ کە بەستوونی کارەبایان بەستنەوەو تایەی سەیارەیان پێ هەڵواسین، یەکێ بووە لەو ژنانەی وەك تەتەر نامەی پێشمەرگەی بە کەسوکاریان دەگەیاند، یەکێك بووە لەو ژنە فیداکارانەی هەمیشە لە ناخۆشیەکان هاوڕێم بووە، لە شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژی ساڵی

١٩٥٨ بۆ ڕاهێنان لەسەر مەلەکردن ڕەوانەی بەغدایان کردین بۆ ماوەی ١٥ ڕۆژ ماینەوەو من ئەو کاتە لەبەغدا بووم کە شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ دەستی پێکرد لەناو شاری بەغدا بە چاوی خۆم بینیم لاشەی وەسی بە ستوونێکی کارەبا هەڵواسرابوو، هەروەها لاشەی نوری سەعیدیشم بینی کرابوو بەدوو لەت یەکیان لەکەرخ ئەوەی تریشیان لە ڕەسافە خەڵك بەدوای خۆیان ڕادەکێشا.

ئەوە بوو لەدوای ئەوە گەڕامەوە بۆ موسڵ، من ئەو کاتە لە فەوجی دووی لیوای پێنج بووم کاتێ شەواف هاتە ئەو شارە بۆ ئەوەی کودەتا بکا وگۆڕانکاری لە عەسکەر بکا، بەڕاستی خەڵکیان زۆر ئازاردا بە تایبەتی ئەوانەی کە لەگەڵ وان نەبوون، من ئەو کات بۆ ماوەی یەك هەفتە فەرماندەی پاسەوانی بەر دەرگای شەواف بووم، هەروەها پڕۆژەی ئاوو کارەبای سەربازگاکەی لە ژێر چاودێری من دابوو، هەر کە شەواف بزوتنەوەکەی ڕادەگەێنێ، پاش سێ ڕۆژ دوو فڕۆکەی مێکی ڕووسی هاتن شوێنی نیشتەجێبوونی شەوافیان تێکشکاندو شەواف هەڵهات و لە فڕۆکەخانە سەربازێك شەوافی کوشت و ئەوەبوو جوڵانەوەکەی شەواف هەرەسی هێنا و بۆماوەیەك بۆشایی حکومڕانی لە موسڵ دروست بوو، بۆیە تاوانێکی زۆر لەم شارە ئەنجامدرا ئەوەبوو هیزێکیان لە دهۆکەوە هێنا بۆ کۆنتڕۆلکردنی دۆخی ناو شاری موسڵ هێزەکە لەیەکێتی جووتیارانی دهۆك پێك هاتبوون ئەوەبوو ئەم هێزە توانیان کۆنتڕۆڵی دۆخەکە بکەن، هەر بۆیەش خەڵکەکە کە وێنەی عبدالکریم قاسمیان دەست نەدەکەوت بۆیە پارچەی ڕانکوچۆغەی کوردیان لە یەخەی خۆیان دەدا بۆ پاراستنی گیانی خۆیان، لەگەڵ ئەوەش خەڵکێکی زۆر لە ناوچوو و کوژرا، لەدوای ئەوە من گوازرامەوە بۆ هەولێر.

ئەو پیاوانەی لەسەردەمی خۆی و لە ئەوێ ڕۆژێ کە، بانگی کوردایەتیان دا لەڕۆژگارە سەخت و ئەنگوستە چاوەکان خۆڕاگربوون، بەو کوێرە خەتەی خوێندەواری کە هەیان بووە، بەبێ گوێ دانە سەخت و دژواری ڕۆژگارەکە خۆیان پێگەیاندوە، هەروەك چۆن لەکوردایەتیەکەیان بەرەو پێشەوە هەنگاویان ناوە لەم بوارەش کۆڵیان نەداوە، مام حەمید ڕەشاش، یەکێك بووە لەو کەسایەتیانەی باسی ژیان و نەخوێندەواری خۆی بەم شێوەیە دەکات و لاپەڕەکانی ژیانی خۆی هەڵدەداتەوەو دەڵێ: لەبەر ئەوەی سەردەمی منداڵی من قوتابخانە لە گوندەکان نەبوو، هەرچەند باسی ژیانی خۆم بکەم تەواو نابێ، باروگوزەرانی من زۆر خراپ بوو لەشوانی، سەپانی، دەستی پێکردووە، زۆر منداڵ بووم کە دایکم و باوکم جێیان هێشتم و کۆچی دواییان کردو بە هەتیووی گەورەبووم کەوتمە لای براو برازنم ئەوانیش، هەر زۆر زوو خستمیانە بەر کاروبەرخ و ئیشی خۆیان لە ماڵەوە، ئیشی دەرەوەشیان پێ دەکردم بەرخەوانی، شوانی، سەپانی، تا وەکو بووم بەسەرباز جلی سەربازیم لەبەر کرد، ئەوەی زیاتر هانی دام بۆ خوێندەواری ئەو کاتانە بوو، کە بووم بەحیزبی (پارتی)، چونکە دەبوا خۆم نامە بنووسم، هەروەها پێویست بوو بڵاوکراوەکانی حیزبیش بەخۆم بخوێنمەوە، بەتایبەتی ئەو کاتەی بووم بە پێشمەرگە، لەوێ دکتۆر حەسەن و حوسێن هەندێك خوێندەواری تر زۆر هەوڵیاندا بۆ ئەوەی من فێری خوێندن و نووسین بکەن، سوپاسیان دەکەم بەتایبەتی ئەوانەی ناویانم لەبیر کردوو.

دەربارەی پەیوەندی کردنی بەو کەسانەی لەبارزانییەوە نزیك بوون لە ڕواندزو دەوروبەری (مام حەمید ڕەشاش) دەیگێڕێتەوەو دەڵێ: ساڵی ١٩٦١ بوو گرمە گەرمی حیزبایەتی بوو لیواکەی ئێمە لە حامیەی ڕواندز بوو زۆربەی

عەریف و نائب عەریف و عەسکەرییەکانی لیواکەی ئێمە پەیوەندیان بە حیزبەوە کردبوو، لێرە سێ جار بەرپرسی حیزبیمان ئاشکرا بوو هەموو جارێ یەکێکی تریان لەجێگای ئەو دادەنا، یەکەم جار (عومەری سەید نەبی) بوو بە بەرپرسی حیزب لە لیواکە خەڵکی (کانی قوڕێ) بوو، کە ئەو ئاشکرابوو، پەیوەندی کرد بە شۆڕش ڕۆیشت و لەدوای ئەو عومەر ناوێك هاتە جێگەکەی ئەو، دوو مانگ ئەویش ئاشکرا بوو ڕۆیشت، لە دوای ئەویش سەعیدی مەلا ئەحمەد بوو بە بەرپرسمان، زۆری پێ نەچوو ئەویش ئاشکرا بوو، ئینجا من بووم بە بەرپرسی حیزبیەکانی لیوا، زۆر نەمابوو منیش ئاشکرابم شۆڕش دەستیپێکرد، لەناو ڕواندزیش پەیوەندیم لەگەڵ (نەبی حەمەلاو، ئیبراهیم حەمەلاو) هەبوو، لەجوندیانیش پەیوندی نهێنیم لەگەڵ وەهاب ئاغای جوندیان هەبوو، هەروەها پەیوەندی باشیشم لەگەڵ جەلال بەگی دەرگەڵەیی هەبوو، زۆر دەچووم سەرم لێ دەدا، چونکە ئەویش حیزبی بوو، لەوێ مامەوە تا وەکو دەستپێکی شۆڕشی ئەیلول، پاشانماڵم بردەوە بۆ هەولێرێ.

مام حەمید ڕەشاش، دەربارەی پەیوەندیکردنی بە شۆڕشی ئەیلول و چۆنیەتی پەیوەندیکردنی بەهێزی لەشکری کوردستانەوە بۆی گێڕامەوەو گوتی: من لە ١٩٦١/٩/١٦ لە سەرکەپکان پەیوەندیم بەڕێزەکانی شۆڕشەوە کرد، ئەو کاتەی پەیوندیم کرد شەو بوو ڕەشاشێك و کۆمەڵێك فیشەکم پێبوو جلوبەرگی سەربازیم هەر لەبەربوو ماوەیەك بوو بەپێ ڕێم کردبوو زۆر ماندوو شەکەت بووم کە گەیشتم لەشکرێکی زۆری پاشماوەی عەشائیری لەوێ بوون هێشتا ئەوانیش ناوی پێشمەرگەیان لێنەنرابوو هەر بە لەشکر ناویان دەبردن لای عەباس ئاغای ئاکۆ بوون، چەکەکەیان لێ وەرگرتم و لەبن کەپرێك لێی

ڕاکشام ماوەیەکی پێچوو پیاوێکیان ناردبوو، هاتە لام گوتی: عباس ئاغا دەیەوێ بتبینێ، منیش لەبەر ئەوەی لە دوورەوە زۆر گوێبیستی ناوی عباس ئاغا ببووم دەمویست لە نزیکەوەش بیبینم زۆری پێنەچوو هات و بەڕاستی بەخێرهاتنێکی گەرمی لێکردم لێم بەپێش کەوت و گوتی کاکی عەسکەر ئەوە بۆ تەقەت لە لەشکر کردووە منیش ووتم کاك عباس بەپێچەوانەوە من تەقەم لە لەشکر نەکردووە بەڵکو فیشەکێکی زۆریشم پێبووە هەر هەموویم بەسەر لەشکردا دابەش کردووە، دیاربوو یەکێك لە ناو لەشکرەکەی عباس ئاغا منی دەناسی پێی ووتبوو ئەوە فلانەو لێپرسراوی حیزبی بوو لە لیوای ئێمە خەڵکی دەکردە حیزبی بە عەباس ئاغای ووت من ئەوە دەناسم، هەر چەندە بەرامبەر من هەڵوێستەکەی گۆڕا، بەڵام من هیچ بەڵگەیێکم لا نەبوو حیزبێتی خۆم بسەلمێنم، لەبەر ئەوەی ئەو کات ئەوەی پەیوەندی بەشۆڕش بکردبایە دەبوایە پسولەی حیزبی لا بوایە، لەلایەکی تریشەوە من لە ناوچەی هەولێرەوە ببووم بە حیزبی واتە دوو سنوور جیاواز بوون، من تا ئەو کاتەی لێرە مامەوە ئیشوکاری ناو بارەگای لەشکریان پێ دەکردم.

مام حەمید ڕەشاش چۆنیەتی ناسینی خۆی لەلایەن لەشکرەوە واتە ئەو هێزەی لەسەرکەپکانەوە بوو دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ئەوەبوو ڕۆژێکیان مەلا عەولا هاتبوو بۆ سەردانیکردنی عەباس ئاغا بە مەبەستی فیشەك پەیداکردن بۆ هێزەکەی کە لەشاخی سەفین بوون، هاتە بارەگای لەشکر لەسەرکەپکان هەر کە چاوی بەمن کەوت شا گەشکە بوو ووتی ئەوە لێرە چی دەکەی، منیش دوای ئەوەی بۆم گێڕایەوە کە چۆن پەیوەندیم کردووە، ئەوەبوو دوای ئەم سەفەرەی مەلا عەولا بۆ گوندی (سەرکەپکان) من بوومە متمانە پێکراوی ناوچەکەو عەباس ئاغا، بەڕاستی ئەوەی هەرگیز نابێ لەبیر بکرێ دەوری

عەباس ئاغایە کە ئێمە ئەو کات دوو لق بووین لەسەرکەپکان بۆ ماوەی ساڵێك بوو ئەرکی ژیان وگوزەرانی هەردوو لقەکەی خستبووە سەر ئەرکی خۆی و جێگاو ڕێگای بۆ کردبووینەوە.

لە درێژەی بیرەوەرییەکانی خۆی مام حەمید رەشاش ئێمەی بردەوە بۆ گوندی ڕێزینەو گوتی: لەگوندی ڕێزینە ناوی دەستەو پەل و لق و بەتالیۆن دەنراوو پێشمەرگە ڕێکخرایەوە، لە گوندی ڕێزینە بەئامادەبوونی مام جەلال و عەلی عەسکەری و مەلا عەولاّ و عومەر دەبابە کە لەویّ ئامادە ببوون، حەمید کاوانی کرا بە سەرپەل و منیش وەك جێگر دەست نیشان کرام و بووم بە جێگری سەرپەل، ئەو کاتە لەگوندی (دوواویّ) بووین لەپەلەکەمان چەند سەر دەستەیەك لەگەڵمان بوون لەوانە (ڕەحمانە ڕووتە، حوسێن کاوانی) ئەو کاتە بارەگای پەلمان لەگوندی دوواویّ بوو، پێشمەرگە باروگوزەرانی زۆر خراپ بوو، ئەگەر چی خەڵکی گوندەکە هاوکارمان بوون، لە جلوبەرگ و نووستن و خواردن و ژیانی ڕۆژانە و لە خۆشی و ناخۆشیدا.

هەروەها لەدرێژەی بیرەوەرییەکانیدا مام حەمید دەگێڕێتەوەو دەڵێ: هەر لەو ساڵە لە یادی نەورۆز ئاهەنگێکی خۆشمان ئەنجامدا کەچی هیچمان نەبوو نە مایك و نە کورسی و نە کۆرس و نە گۆرانیبێژ، بەڵام نەورۆزێکی خۆشمان کرد، شۆڕش لە ڕانیە هەشت کوڕو هەشت کچیان هێنابوو بەنهێنی، لەوانە کچی مامۆستا تۆفیقی مەلا سدیقی، هەروەها کچ و کوڕێکی مامۆستا ئیسماعیل سەرهەنگیان لەگەڵدابوو، دەستپێکی ئاهەنگەکە بەچەند ئایەتێك لەقورئانی پیرۆز لە لایەن مامۆستا مەلا عەولاّ خوێندرایەوە لەپاشان مەلا عەولاّ گۆرانی شیرین بەهارەی گووت.

ئەی مام حەمید چۆن بوو بە حەمید رەشاش، ووتی: ئێمە پەلەکەمان لەدەشتی کۆیە بوو، سەرکردایەتی پارتی خەریکی کۆبونەوە بوون لە گوندی عەوالآ زۆرینەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی ئامادەببوون جگە لەبارزانی ئەویش لەبادیان لەبامەرنێ بوو لەدوای ئەم کۆبونەوەیە کە مام جەلال و عەلی عەسکەری و دکتۆر خالیدو محمود ئاغای کاکە زیادی هەر هەمووان لەوێ ئامادە بوون، بەدوای مەفرزەکەی ئێمەیان ناردبوو ئێمەش بێینە ئەوێ، ئێمەش ئەو کات بەفەرماندەی حەمید کاوانی لە گوندی ئامانج بووین، ئەو شەوەی کە نامەکەمان پێ گەیشت بەیانیەکەی زوو بەرێکەوتین لە شیوەشان گەیشتینە ئەم هێزە، بەرێکەوت ئێمە لەوێ پێنج حەمید ناو بووین لەوێ ئامادە بووین هەر کە مام جەلال بانگی هەر یەکەمانی دەکرد ئێمە هەر پێنج ناو حەمیدەکە وەلآممان دەدایەوە، بۆیە مام جەلال ووتی ئەوەها نابێ، وەرن با یەکەو نازناوێکتان بۆ دابنێم لەو رۆژەوە ناوی منی نا حەمید رەشاش، بۆیە من زۆر بە نازناوی حەمید رەشاشەوە شانازی دەکەم لەبەر ئەوەی مامی گەورە ئەو ناوەی بۆ داناوم، هەر لەوێ بوو مام جەلال رایسپاردین بۆ ئەوەی بەشداری لە چالاکیەك بکەین و ئەنجامی بدەین، ئەوە بوو کە دەبێ بچین کەمین بۆ فەرمانبەرانی کۆیە دابنێین مەبلەغیکی باشی پارەیان لایە دەیهێنن بۆ شاری کۆیە، پاش ئەوەی هەواڵی ئەوە گەیشتە مام جەلال کە پارەکە دوا دەکەوێ، بۆیە مام جەلال مەفرەزەکەی ئێمەی بەرێکردو دکتۆر خالیدیش لەگەڵ ئێمە گەرایەوە بۆ ئەشکەوتی جەلی، لەدوای گەرانەوەی ئێمە بە رۆژێك هەواڵەکە گەیشت بوو، کەوا پارەکە بەیانی دەگات، ئەوە بوو مام جەلال و چەند پێشمەرگەیەك لەنزیك گوندی شێخ شەروان کەمینێك دادەنێن پارەکە دەست بەسەر دادەگرن کە برەکەی

٣١٠٠٠ سی و یەك هەزار دینار بوو هەر هەموویان گەیاندە ناو شۆڕش و لەگوندی ڕێزینە لەوێ دابەشیان کردو کە لەو پارەیە ١٣ سیانزە هەزار دیناریان بۆ مەلا مستەفا بارزانی نارد.

ئەشکەوتی مام جەلال و گوندی شێخ شەروان یادەوەرییەکانی، مام حەمید رەشاش لەم ڕووەوە دەڵێ: لەبەر ئەوەی زۆربەی کاتەکانی مام جەلال لەم ئەشکەوتە بووە لەساڵەکانی شەستەکان، بۆیە هەر بەناوی ئەو ناوبانگی دەرکردبوو هەر چەندە هەڤاڵان (مام جەلال، عومەر دەبابە، عەلی عەسکەری) زۆربەیان لەم ئەشکەوتە ماونەتەوە، بەڵام ئەوەی لێی بەرپرس بوو دکتۆر خالید بووە زۆر جاریش ئێمە کە لە جەولەی پێشمەرگایەتی دەگەڕاینەوە لەوێ پشوومان دەداو شەو لەوێ دەماینەوە بەرۆژیش دەهاتینە ناو گوندی شێخ شەروان.

لەساڵی ١٩٦٢ هەندێك لە ئەفسەری عەسکەری پەیوەندیان بەشۆڕشەوە کرد لەوانە عەبدوللا جەبووری و تەها بامەرنی بوون، بەکر ئاغاش ئەفسەر بوو لەناو شۆڕش، داوایان لە مام جەلال کرد کە سریەکی عەسکەری کۆماندۆ دروست بکەن مەشقی سەربازیان پێ بکەن، مام جەلالیش ڕازی بوو بۆیە کۆمەلێك پێشمەرگەیان هێنا جلوبەرگیان جیاواز بوو، هەر هەموویان چەکی کلاشینکۆفیان پێبوو، گوایە ئەوانە بۆ شەڕی زۆر قورس و تایبەت ئامادەکراون، لەساڵی ١٩٦٣ ئەو هێزە تایبەتە لەگەڵ ئێمە دانیشتن بۆ ئەوەی پێکەوە نەخشە دابنێین بۆ دەست بەسەر داگرتنی سەنگەرەکانی سەر هەیبەت سوڵتان کە ئەو کات ئەم سەنگەرانە جاشی لێبوون، ئەو پلانە زۆری خایاند و ماوەیێکی باشی بەسەر داچوو تا وای لێهات حکومەت بەهەموو نهێنیەکانی ئێمەی زانیبوو، ئێمەو ئەو هێزەی کۆماندۆ و هەندێك

هێزی تر کە عەلی عەسکەری هێنابووی، هێزەکانیان دابەش کرد بوو، من و عەریف عەلی رقم یەك بۆ سەنگەرەکانی پێشەوە دەست نیشانکراین، ڕەشید سندی و هێزێکی تر بۆ سەنگەرەکانی دواوە دانرابوون، ماوەیەك بوو چەند دانەیەك لە موشەکی بازووکەمان بۆ هاتبوو، بۆیە نهێنی دەستپێکردنی شەڕەکە، ئەوەبوو هەر کە ڕەشید سندی لە دوواوە موشەکێکی بازووکە لەسەنگەرەکانی پێشەوەی دوژمن بدات ئینجا لە هەموو لایەکەوە ئێمە دەست بە هێرشەکە بکەین، جاشەکان لەبەر ئەوەی نهێنیەکانی ئێمەیان دەست کەوتبوو، ئەوان پێشی ئێمە دەستیان بە هێرش کرد لە هەموو لایەکەوە تەقە دەستی پێکرد بۆ سەر هێزەکانی ئێمە و کەمینەکانی ئێمەیان شکاند، لەو شەڕە ئێمە زیانی گەورەمان پێگەیشت، دوو پێشمەرگەی قارەمان لە هێزەکەی ئێمە شەهیدبوون چەندین بریندارێشمان هەبوو.

زۆرن ئەوانەی لەسەر مێژووی ئازادیخوازی نەتەوەی کورد بابەت و شارەزاییان هەیە یاخود بۆ ماوەیەك لەناو ڕووداوەکان ژیاون و بوون بە شایەتحاڵی ڕووداوەکان، شۆڕشی ئەیلولیش یەکێکە لەو ڕووداوانەی نزیکەی نیو سەدەی بەسەردا تێپەڕ بووە زۆرکەس و لایەنی سیاسی چیرۆك و بەسەرهاتی جیاجیان لەیادەوەرییەکانی خۆیان تۆمار کردووەو ئیمرۆش ویژدانی خۆیان ئاسوودە دەکەن و بۆ لاپەڕەکانی مێژوو تۆماری دەکەن لەم گەشتەماندا بە ناو یادەوەرییەکانی یەکێك لە پێشمەرگە دێرینەکانی سەدەی ڕابردوو کە تاکو ئەم چرکە ساتەش لە ژیاندا ماوە وەك کادیرێکی لێهاتووی ئەو سەردەمەش بەردەوامەو چیرۆك و بەسەرهاتەکانیدا دەمانباتەوە ناو توولە ڕێیەکانی کوردایەتی و لەناو شۆڕشی ئەیلولدا وەك سەرمایەیێکی نیشتمانی لەهزرو بیری خۆییدا تۆماری بکەین.

یەکێك لەو پێشمەرگەو قارەمانانەی کە لەسەرەتاوە وەك کادیرێکی چالاکی پارتی دیموکراتی کوردستان بە نهێنی لەناو سوپای عێراقی و سەربازگاکانی دوژمن کاری حیزبایەتی ئەنجام داوەو لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشەکەش بەشداربوێکی چالاك بووەو لە هەموو قۆناغانەکانی شۆڕشیدا دەوری بەرچاوی هەبووە وەکو سەربازێکی وون لەم ڕۆژگارەدا بووتە شاهێدحاڵی هەموو ئەو ڕووداوانەی کە لەم ماوەیەدا ڕوویان داوە دەڵێت: ئەو کاتەی کە سەرباز بووم لە فەوجی سێی سەر بە لیوای سێی پیادە، ئێمە زۆربەمان لەو فەوجەدا سەرباز بووین کورد بووین، سەرەتای ئەوەبوو کە ئاڵوگۆرکێ دەکرا لە نێوان کوردو عەرەبدا تازە سەربازی عەرەبیان دەهێنا لە کوردستان جێ نیشینیان دەکردو کوردیشیان دەبرد لە خوارووی عێراقیان دادەنا، ئەو کاتە ئەندامانی حیزب (پارتی) هەموویان یەك بۆچوون نەبووین بەڵکو لێکدانەوەی جیاوازمان هەبوو لە سەر دەست پێکردنی شۆڕش، لەسەروو بەندی ئەوەدا بوو کە هەندێك لە عەشایرەکانی ناوچەکە هێزیان بۆ خۆیان کۆدەکردەوەو خۆیان ئامادە دەکرد، لێرەو لەوێش باس لەوە دەکرا کە ئەو ساڵە لەوانەیە شۆڕش دەستپێبکا، لەم کاتانەدا بوو کە سەدیقی میران بەگ لە نێوان هەردوو گوندی حوجران و کاوانیان دەکەوێتە کەمینێك و دەیکوژن، بەو هۆیەوە کۆمەڵە کەسێك لە دانیشتووانی کاوانیان و حوجران، تاوانبار دەکرێن بە کوشتنی سەدیق بەگ، لە ١٩٦١/٢/١٨ دوای ئەوەی ئەو خەڵکانە بەکوشتنی میرانی سەدیق بەگ تاوانبار دەکرێن فەرمانی گرتنیان بۆ دەردەچێت، هەر بۆیە ئەوانیش خۆیان نادەنە دەست و دەچنە شاخی سەفین لە ئەشکەوتەکان لەوێدا خۆیان حەشار دەدەن و بۆ ماوەیەك لەوێ دەمێننەوە، بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن و نەکەونە بەردەستی پیاوەکانی

حکومەت مەبەستی تۆڵە سەندنەوە لە خوێنی سدیق بەگ، میرەکانی شەقڵاوە هێزێکی زۆریان کۆکردەوە بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر شاخی سەفین، ئەو مەفرەزەیە کە ئەوە دەزانن ئەو جێگایە بەجێ دەهێڵن دەچن بۆ شارۆچکەی ڕانیەو لەدۆڵە ڕەقە لە لای عەباسی مامەند ئاغا لەسەرکەپکان دەمێننەوە، دوای ئەوە بۆ پاراستنی گیانی خۆیان جێگای خۆیان دەگۆڕن و دەچنە لای ئاغاکانی پشدەر لەوێش ماوەیەك دەمێننەوە و دووبارە جێگای خۆیان دەگۆڕن و بۆ ماوەیەکیش دەچنە لای ئەحمەد شاباز لەوێش ماوەیەك دەمێننەوە، دوای ئەوە مانگی شەش لەساڵی ١٩٦١ ئەو هێزە دەگەڕێنەوە بۆ شاخی سەفین و لەئەشکەوتەکانی ئەو شاخەدا جێگیر دەبنەوە دوای مانەوەیان لەوێدا ژمارەیەکی تر لە خەڵکی دەوروبەری شەقڵاوەو ناوچەکانی تر پەیوەندی بەو مەفرەزەیەوە دەکەن تا وای لێدێت ژمارەیان زیاد دەکا و هەندێك خەڵکی ناسراو لەم لاو ئەو لادا پەیوەندیان پێوە دەکەن لەوانەی کە پەیوەندیان پێیانەوە کرد لەم کاتەدا کە لای من دیارو نووسراون، پێك هاتبوون لە سەعید مەسیفی، مام تەها ڕەشکە، حەسەن ناسر، وەستا شێخ محەمەدو برازاکەی کە ناوی عومەر بوو، خالید ئاژگەیی، مامۆستا جەوهەر میرانی، بەشێکی تر لە خەڵکی کاوانیان، چوونە پاڵ ئەو مەفرەزەیە لە شاخی سەفین، ئەوانە هەر هەموویان پارتی بوون و لەپەیوەندی دابوون لەگەڵ حیزب، بۆیە حیزب لە زۆر شت ئاگاداری دەکردنەوە، تا ئەو ڕۆژەی کە شەمسەدین موفتی فەرمانی دەستگیرکردنی بۆ دەردەچێت لەلایەن حکومەتەوە لەهەولێر ئەویش خۆی نادات بە دەستەوەو کە ئەو کاتە مەفرەزەکە لە ئاقوویان و پوونگینە بوون لەم ناوچە دەسوڕانەوە، شەمسەدین موفتیش پەیوەندی بەو مەفرەزەیە دەکات و جار جارەش

مامۆستا مەلا عەولاّ کە ناسراو بوو بە مەلا ماتۆڕ سەردانی دەکردن، لە درێژەی ئەو پەیوەندی کردنانە تا وای لێهات لەناو پۆلیسە کوردەکانیش بیرۆکەی پەیوەندی کردن بەم مەفرەزەیە هاتە ئاراوەو بە تایبەتیش لەناو سەربازگەو مەخفەرەکان، عەسکەرو پۆلیسە کوردەکان، تا ئەو ڕۆژەی پەیوەندیکردنی چوار پۆلیس لەهەولێر بە مەفرەزەکەی شاخی سەفین دەنگی دایەوە حکومەت هەستی بەوە کردبوو کەوا خەڵکێکی زۆر خۆی ئامادە کردووە پەیوەندی بەو مەفرەزەیە بکات، لەوەش دەترسا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئەم مەفرەزەیە لەشێوەی هێزێکی بچوکی یاخی بوو بۆ هێزێکی گەورەو تۆکمەی عەسکەری خۆی نیشان دەدا بۆیە حکومەت شڵەژاو هەر لەم سەرو بەندەش دابوو چوار پۆلیس بەفەرمانی حیزب پەیوەندیان بەو مەفرەزەیە کرد ئەوەش ناوەکانیانە(عەریف سلێمان، ئەنوەر جۆخین، ڕەشید شۆرە، ڕەحمان مەلا قادر) ئەوانە بە فەرمانی حیزب پەیوەندیان کردبوو لەئاقوبان لەگەڵ شەمسەدین موفتی یەکیان گرتەوە. پەیوەندیکردنی ئەو چوار پۆلیسە دەنگی دایەوە لەناو سەربازو پۆلیسە کوردەکان، ئەمەیان بەجارێك حکومەتی شپرزە کردبوو، لەناو سەربازگاکان توندوتیژی و چاودێری کردنێکی زۆر وورد بەتایبەتی لە سەر کوردەکان پەیڕەوکراو باوەڕیان بە سەربازو پۆلیسە کوردەکان نەما هەر سەربازو پۆلیسێکی کورد عەرەبێکیان لەگەڵ دادەنا بەتایبەتی لەکاتی پاسەوانی کردنی شەوانە تا ئەو بێ متمانەییە وای لێهات حکومەت هێز کۆبکاتەوە لەسەربازو جاش بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر ئەو مەفرەزەیە، هەر لەو کاتەدا بوو هەشتا پۆلیس لەعەریف و نائب عەریف پەیوەندیان بەو مەفرەزەیەی شاخی سەفینەوە کرد، بەخۆیان و چەکەکانیانەوە تا مانگی هەشت ئەو مەفرەزەیە ژمارەیان

بوو بە دوو سەد کەس زیاتر، لەو کاتانە بوو لیواکەی مام حەمید ڕەشاش لەسەرەتای مانگی حەوتی ساڵی ١٩٦١ بۆ فەرەزیات چوونە گوندی بەرزێوە، ئەوەبوو مام حەمید ڕەشاش و هاوڕێکانی هەر کە لەگوندی بەرزێوەی بوون کەوتنە پلاندانان بۆ پەیوەندی کردن بەشۆڕش، هەر چ کاتێ کە شۆڕش دەست پێبکات ئەوانیش دیارییەکی باش بگەیننە ناو شۆڕش.

لەگەڵ (مام حەمید ڕەشاش) لەدرێژەی گەشتەکەماندا لە توولە ڕێیەکانی کوردایەتیدا بەردەوام دەبین و دەڵێ: هەر کە سەربازگەکەمان لەبەرزێوێ جێگیر بوو ئێمەی ئەندامانی حیزب لەناو لیواکە بەنهێنی کۆبووینەوە بۆ ئەوەی ئەگەر شۆڕش دەستی پێکرد چی بکەین باشە بۆ ئەوەی ببینە پاڵپشتی شۆڕشەکە، بیرمان لە پەیوەندی کردن و پلاندانان کردەوە لەسەر ئەوە ڕێکەوتین لەگەڵ دەستپێکردنی شۆڕشەکە ئێمەش لەناو لیواکە گورزێك لەدوژمن بوەشێنین و دەست بەسەر هەموو لیوای سێ دابگرین بە چەك و تەقەمەنیەکانیشەوەو بگەێنینە ناو شۆڕش، مام حەمید دەڵێ ئەو کارە زۆر ئاسان بوو لەبەر ئەوەی ئەو کاتە هەر هەموو لێپرسراوی کۆگاکانی چەك و تەقەمەنی لەلیوای سێ کورد بوون و لە هەمان کاتیشدا حیزبی بوون ، هەر بۆیە ئێمە شەوان کۆگاکانمان بەکلیلی حیزب دادەخست بۆ ئەوەی هەر کاتێك بۆمان دیاری بکرێ ئەوە زۆر بەئاسانی بتوانین دەست بەسەر هەموو چەك و جبەخانەکەی لیوا دابگرین، پلانێکی زۆر تۆکمەمان دانابوو بۆ دەست بەسەر داگرتنی سەربازگەکەو زۆر ئاسان بوو لەبەر ئەوەی پاسەوانەکان هەریەکەو دوو فیشەکیان لابوو، لەلایەکی تریشەوە داوامان لە حیزب کردبوو لەشکر کۆبکاتەوە بۆ ئەوەی هێرش بکاتە سەرمان و ئێمەش لیواکە بە دەستەوە بدەین، جگە لە چەك و جبەخانە ئێمە سێسەد ولاغمان لابوو، هەر هەموویمان

ئامادە کردبوو بۆ ئەوەی بیانگەیەنینە ناو شۆڕش، لێپرسراوەکەی فەوجی سواریش هەر لایەنگیری حیزب بوو ئەویش ئەندامی خۆمان بوو، لەدوای ئەوەی پیلانەکەمان دارشت کەوتینە هەوڵدان بۆ بینینەوەی رێگایەك بۆ ئەوەی پەیوەندی بە بارزانییەوە بکەین، چونکە بەراستی کارێکی گەورە بوو و پێویستی بەوە هەبوو سەرکردایەتی کوردیش ئاگادار بێ لەم پلانەی ئێمە، بۆ ئەوەی بزانین پلانی ئەوان چییە، بۆیە کەوتینە پەیوەندی کردن بە وەهاب ئاغای جوندیان کە لە بارزانیەوە زۆر نزیك بوو نهێنیمان پێدان، ئەوانەی لەم پلانەدا ئاگادار بوون تەنیا ١٠ کەس بووین لەوانە ئێستا تەنیا سێ کەسمان ماوین کە بریتین (حەمیدرەشاش، خورشید شێرە، رەحمان بێتووشی) لەرێگای وەهاب ئاغای جوندیان دەقی پلانەکەمان گەیاندە مستەفا بارزانی، پاش ماوەیەك وەهاب ئاغای جوندیان وەڵامی داینەوە گوتی بارزانی فەرموویەتی (جارێ زۆر زووەو ئێمە خۆمان ئامادە نەکردووە بۆ شۆڕش، جارێ بە تەمای شۆڕش نین کەسیش با دەست لە خۆی نەدا).

مام (حەمیدرەشاش) لەدرێژەی بیرەوەرییەکانیدا بەتولە رێیەکانی خەباتی کوردایەتیدا دەڵێ: لەدوای بڵاوەپێکردنی لەشکری عەشائیری مام جەلال تاڵەبانی خۆی و تەنیا ١٧ پێشمەرگە هاتنە چەمی رێزان زۆربەی پێشمەرگەکان بێ چەك بوون لەوانە مەلا ناسیح بوو، یەکێك بوو لەو ١٧ پێشمەرگەیەی لەگەڵ هەڤاڵ مام جەلال کە هاتبوون بۆ چەمی رێزان، مام جەلال شوکر قادرو پێشمەرگەیەکی تری نارد بۆ لای ئەو مەفرەزەیەی شاخی سەفین، کە هەندێ چەکیان بۆ بنێرن لەو چەکانەی لەجبخانەی هەولێرەوە هاتبوون بۆ شاخی سەفین، ئەوەبوو سیانزە لەو چەکانەیان بۆ ناردن، لە مانگی شەشی ١٩٦٢ بوو کە هەندێك لەکادیرانی حیزب لەشارەوە هاتبوونە

دەرەوە بۆ چەمی ڕێزان لەوانە (مامۆستا برایم ئەحمەد کە سکرتێری حیزب بوو، مامۆستا نوری شاویس ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوو، مامۆستا عەلی عەبدولاّ کە ئەویش ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوو) هەر ئەو ڕۆژە مام جەلال لەگەڵ من و عەریف عەلی دانیشت و ووتی وەرن با هەڤالانی مەکتەبی سیاسیتان پێ بناسێنم، ئێمەش چووین بۆ لایان و هەر لەو شەوەشدا بوو کەمن بۆ یەکەم جار لەنزیکەوە مامۆستا برایم ئەحمەدم ناسی زۆر ڕێزی لێ گرتین، پیاوێکی زۆر بەڕێز بوو ماوەیەکی باش لایان دانیشتین و دوای ڕۆیشتین، لەدوای دوو ڕۆژ مام جەلال بەدوای منیدا ناردو چوومە لای و گوتی: دە پێشمەرگە لەوانەی لای خۆت دیاری بکە لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئەندامانی مەکتەبی سیاسی سەفەرێك هەیە پێویستە تۆش سەرپەرشتی ئەو هێزە بکەی، منیش گوتم بەسەرچاو هێزێکم پێکهێنا لە دە پێشمەرگە ئەوەبوو بۆ بەیانیەکەی زۆر زوو بوو کە بەڕێکەوتین بۆ حاجی ئۆمەران کە مەبەستیش لەو گەشتەدا چوونی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی بوو بۆ لای جەنابی مستەفا بارزانی دیارە ئەو کاتە بارەگاکەی بارزانی لە حاجی ئۆمەران بوو، ئێمە کە گەیشتینە ئەم دەوروبەرە لەوێدا ئەو هێزەی لەگەڵ بارزانیدا بوون، گەمارۆی مەخفەرەکەی ڕایاتیان دابوو، بۆ ماوەیەکی زۆر ئەم مەخفەرە خۆی نەدەدا بەدەستەوە نزیکەی چل ڕۆژی پێچوو ئینجا ئەم شەڕە یەکلاییی بوەوەو ئەو ماوەیەش ئێمە هەر بەڕێوە بووین لەبەر ئەوەی بە قۆناغ دەڕۆیشتین، ئەوەبوو ڕۆژێکیان لە گوندی شێخ وەتمان چلەی هاوین بوو کاتی زەردەلو پێڕاگەیشتن بوو بۆ پشوودان لەبن دار زەردەلویەك جێگایان بۆ ڕاخستین ئەو ناوە هەر هەمووی زەردەلوی هەڵوەری بوو برادەران هەمووی خەریکی زەردەلو خواردن بوو لەوێ کۆیان دەکردەوەو دەیانخوارد، مەلا عەولاّ بەسەر

دارەکە کەوت بۆ داتەکاندنی زەرەلوەکە، مامۆستا برایم توڕە بوو گوتی ئەوە هەموو زەردەلوە لێرە هەڵوەریوە تۆ بۆ بەسەر ئەو دارە کەوتی، ئەویش بەبێ دەنگی هاتە خوارەوە، لەوێدا من چەند ڕۆژێك لەگەڵیان دابڕام و چوومە گوندی خۆشکان، گەڕانەوەکەم بۆ ئەو گوندە لەسەر فەرمانی مام جەلال بوو، وتی: سێ ئەفسەر پەیوەندیان کردووە بەشۆڕش لە گوندی خۆشکان بڕۆن بیانهێنن بۆ ئێرە، ئەوەبوو منیش بەڕێکەوتم خۆم و چەند پێشمەرگە یەك بووین، کە گەیشتمە ئەوێ بینیم یەك لە ئەفسەرەکان (موقەدەم عەزیز عەقراوی)یە، یەکێکیشیان رئیس (بەکر عەبدولکەریم) بوو، ئەوەی تریشیان (عەزیز ئەتروشی) بوو هەر سێ ئەفسەرەکەم وەرگرت لەگەڵ نامەیەك بەڕێکەوتمەوە بۆ لای ئەندامانی مەکتەبی سیاسی، ئەوەبوو لە ڕایات پێك گەیشتینەوە، شەو بوو شەڕیش تەواو ببوو ئەوانەی لە مەخفەرەکە بوون خۆیان بە دەستەوە دابوو، هەروەها کە گەیشتینە ئەوێ مستەفا بارزانیش لەوێ بوو نامەکەم دایە دەست بارزانی خۆی، پێم ووت ئەوە ئەو سێ ئەفسەرەیە کە پەیوەندیان بە شۆڕشەوە کردووەو لەسەر داوای خۆمان ئەو مەفرەزە پێشمەرگەیە داوایان لە مام جەلال کرد با بارزانی ببینن و لەگەڵی دابنیشین، مام جەلالیش داواکەی ئێمەی قبوڵ کرد ئەوەبوو ئێمەی بردە لای بارزانی، بۆ مێژوو دەیگێڕمەوە بارزانی زۆر لەوە توڕەبوو کە یەکێك لە پێشمەرگەکان دەستی ماچ کرد.

لە هەولێرەوە بۆ هەڵەدن، مام حەمید ڕەشاش لەدرێژەی یادەوەرییەکانی لەبارەی ئەم هێزە دەڵێ: مام جەلال هێزێکی گەورەی کۆکردبۆوە لە گوندی هەڵەدن بۆ مەبەستی گرتنی چوارتاو باسنێ و گرتنی چەند مەخفەرێکی پۆلیس لەم ناوچەیە، ئەو هێزە کۆکرابۆوە ئێمە ئەو هێزەی ناوچەی هەولێر

لە دۆڵەڕەقە بووین ژمارەمان حەفتاو پێنج پێشمەرگە بوو شەهید حەمید کاوانی لێپرسراومان بوو، منیش جێگری بووم، مام جەلال بەدوایدا ناردین بۆ ئەوەی، ئێمەش بەشداری بکەین لەم چالاکیانە، ئەوەبوو ئەو هێزەمان جولاند بۆ گوندی هەڵەدن بەڕێکەوتین هەر کە ئێمەش گەیشتین ژمارەی لەشکرەکەی مام جەلال سەرپەرشتی دەکرد کە لەهەڵەدن بوون.. بوو بە سەدو پەنجا پێشمەرگە، ئەوەبوو ئەو هێزە بەڕێکەوت بۆ ماوەت.

مام حەمید بۆ پێناسەی ماوەت هەر لەگەڵ گێڕانەوەی یادەوەرییەکانی لەگەڵ ئەم هێزە دەڵێت ئێمە هاتینە ئەو شارە ساڵی ١٩٦٢ بوو بەڕاستی شارێکی بەخشندە بوون، ئەو ئێوارەیە کە گەیشتینە ماوەت مەخفەرەکەی پۆلیس هەر لە ماوەت مابوو ئەفسەرەکەی گوایە لەگەڵ حیزب بوو ناوی جەلالی حاجی عەلی بوو، پێش ئەوەی هێزەکەی پێشمەرگە بگاتە ماوەت جەلالی حاجی عەلی دەرگای مەخفەرەکەی لەسەر پۆلیسەکان داخستبوو، ئەوەبوو مام جەلال خۆی هێزەکەی بەم ناوچەیەدا بڵاوکردبۆوە بۆ ماوەی پێنج رۆژ لێرە ماینەوە، هەموو ئەوگوندانەی ئەو هێزەی پێدا دەرۆیشت مام جەلال بە ووتارە ئاگرینەکانی توانیبووی سەرنجی زۆربەی خەڵکی ئەم ناوچەیە بۆ پێشمەرگە رابکێشێ و وایان لێبکا ببن بەهێزی پشتگیری بۆ پاڵپشتی شۆرش ئەوەبوو بە چەکەکانی خۆیان بوونە پێشمەرگەو نۆرەدار واتە پانزە رۆژ پانزە رۆژ چەکیان لەگەڵ پێشمەرگە هەڵدەگرت.

دەست بەسەرداگرتنی چوارتاو شەهید بوونی حەمید کاوانی چیرۆکێکیتری مام حەمیدرەشاشە، گرتنی مەڵبەندی ناوەندی چوارتا مام جەلال پلانەکەی بۆ دارشت بووین ، کە لە شەوی نەورۆز چوارتا دەبێ ئازاد بکرێت ، ئەوەبوو مام جەلال لە گوندی کەناروێ هێزەکەی دابەش کرد بۆ چەند قۆڵێکەوە،

حەمید کاوانی و هێزێکی ڕەوانەی تەگەران کرد ، من و ڕەحمان ڕووتە و وەسمان حوجرانی و برازایەکی لەگەڵ چەند تۆبەدارێك لە بەردی قەڵی ، بەرامبەر مەڵبەندی ناوەندی چوارتا دانابوو ، مام جەلالیش لەگەڵ عەریف عەلی لەناو چوارتا بوون ، ئەوەبوو بۆ نیوەڕۆکەی لەسلێمانیەوە هێزێکی گەورە هاتبوو کە لەپۆلیسی گەڕۆك پێکهاتبوون ، لە تەگەران حەمید کاوانی و هێزەکەی بەرەنگاری بوونەوە تاکو درەنگانی شەو ، شەڕ بەردەوام بوو هێزەکەی حکومەت شکستی هێنا، بۆیە بەیانیەکەی هێزێکی تری گەورە لە سلێمانیەوە هاتبوو، ئەو جارەیان فڕۆکەی جەنگیشیان لە گەڵدا بوو ، حەمید کاوانی هەڵدەستێتە سەر پێیان و تەقە لە فڕۆکەکان دەکا و بۆیە فڕۆکەکە دەگەڕێتەوە سەریان و حەمید کاوانی و کاکۆ سەعیدیش شەهید دەبن ، هەرچەندە لەو شەڕە ئێمە دەستکەوتی زۆرمان هەبوو بەلام لەبەر شەهیدبوونی ئەم دوو پێشمەرگە قارەمانە هێزەکانمان کێشایەوە دواوە بۆ سەرگەڵو، لەوێ بەڕێز مام جەلال دەستکەوتەکانی دابەش کرد بەسەر ئەوانەی بێ چەك بوون ، بۆ بەرز کردنەوە وورەی پێشمەرگە و جەماوەری ناوچەکە هەڤاڵ مام جەلال پێ ی ووتم نارنجۆکێك بخە ئەم دۆڵە منیش دوو نارنجۆکی دووگرێم لابوو یەکێکیانم هەڵدایە دۆڵەکە دەنگی دایەوە.

لە گوندی دڕییەوە بۆ (ئەشکەوتەکانی ماڵومە)... چەند ئەشکەوتێك بە ڕیزیەکەوە لە پشتی گوندی مالومە لە باوەشی زنجیرە شاخی ئاسنگەرانەوە بوو لەم شوێنە سەختەدابوو کە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان لەگەڵ کۆمەڵە پێشمەرگەیەکی قارەمان بۆ ماوەی دوو ساڵ لە ئەم ئەشکەوتانەدا دەژیان و کردبوویانە مەیدانی خەبات و تێکۆشان و کاری سیاسی و بە ئامانج گەیاندنی مەسەلەی ڕەوای میللەتەکەمان و کاری ڕۆژانەی خۆیان لێ بە ئەنجام دەگەیاند.

مام حەمید ڕەشاش دەگێڕێتەوە دەڵێت: من لەم شوێنە وەکو لێپرسراوی پاسەوانەکانی مەکتەبی سیاسی بووم سەرەتا کە لە گوندی دڕینەوە هاتین بۆ ئەشکەوتەکانی ماڵومە ، یەکەم جار لە دەسپێکی کارەکانماندا هەڵساین بە خاوێن کردنەوەی ئەشکەوتەکان، لە خوارەوی ئەشکەوتەکانیش چەند ژورێکمان بۆ پێشمەرگەکان دروست کرد لە دوای ئەوە دا ئینجا هەڤاڵانی مەکتەبی سیاسی هاتنە ئەوێ رۆژانە کارو بارەکانی خۆیان لەوێدا ئەنجام دەدا و کادیرانی حیزب دەهاتن بۆ سەردانی کردنی هەڤاڵان و تا وای لێهات بوو بە سەنگەرێکی تووکمە تا ئەو کاتەی هەڤاڵان (م.س) یەکەم سەفەریان بۆ ئێران ئەنجامدا ، لەدرێژەی بیرەوەرییەکانی مام حەمید ڕەشاش شوێنی جوگرافی و ژمارەی ئەشکەوتەکانی بۆ دەست نیشان کردین دەڵێت: لە ماڵومەدا ئەشکەوتی زۆری تێدا هەبوو، بەڵام سێ ئەشکەوتی بەتەنیشت یەکەوەی لێبوو یەکێکیان بچووك بوو تەنیا جێگای سێ کەسی لێ دەبۆوە ئەوەبوو هەرسێ ئەندامەکەی مەکتەبی سیاسی لەناو دەخەوتن، هەرچەندە کە سەرەتا هاتین تەنیا خۆمان و چەکەکانمان بووین، مامۆستا برایم ئەحەمەد نەبێ بەتانیەکی لابوو ئەویشی لە ئەشکەوتە بچوکەکەدا ڕاخست و بۆخۆیان شەو لەسەری دەخەوتن ، بەڕاستی مامۆستا برایم پیاوێکی زۆر وورد بوو هەتا بڵێی پاك و خاوێن بوو ئەوەبوو ناوەوەی ئەشکەوتەکەی ڕازاندبۆوە بە ڕۆژنامەی کۆن داپۆشی بوو ، ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لەوێ ناوەکانی خۆیان گۆڕی هەریەکەو بە ناوێکی تر بانگمان دەکردن مامۆستا برایم ئەحمەد ناوی خۆی کردبوو بە مامۆستا قادر هەروەها نوری شاویس ببووە مامۆستا ڕەسول وە عەلی عەسکەرییش ببووە مامۆستا شەریف، مام حەمید ڕەشاش ئاماژەی بەوەدا نهێنیەك هەبوو بۆ ئەو کاتانەی کە میوانێك

بهاتبایە بۆ لایان ئەوە یەکسەر پێشمەرگەیەك لە خوارەوە دەهاتە لای ئەشکەوتەکان و دەیگووت (دەنگی تەیارە دێ) یەکسەر هەر هەمووان ئەوانەی لە وێدا ئامادە بوون بە تایبەتی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی دەچوونە ناو ئەشکەوتە بچوکەکە ئینجا میوانەکانیان دەهێنایە ناو ئەشکەوتە گەورەکە لەگەڵ پێشمەرگەکان میوانداریان دەکردن تاکو دەزانرا کە بۆ چی هاتوون، ئەگەر پێویست بوایە ئەوا ئەندامانی مەکتەبی سیاسیان دەبینی.

لە ئەشکەوتی ماڵومە بۆ وەرگرتنی دەنگ وباس و پەیوەندی کردن سێ تەتەر هەبوون لەنێوان مەکتەبی سیاسی لە ماڵومەو شاری سلێمانی جگە لەوانەش چەندین تەتەری تر هەبوون لەنێوان مەکتەبی سیاسی و ناوچەکانی تر ئەرکەکانی خۆیان بە جێ دەگەیاند، ئەو نامانەی کە تەتەرەکان دەیان هێنان و دەیانبردن شێوەی نامەکان چوکلێتی بوون، هەروەها ئەو نامانەی بۆ مەکتەبی سیاسی دەهاتن لەناو دووبەرگی پێچراوبوو، لەبەرگی یەکەم نووسرابوو بۆ حەمید رەشاش هەرکە نامەکانم دەکردنەوە لە بەرگی دووەم نوسرابوو(م س) منیش دەمگەیاندە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی. یەکەم پەیوەندی لە نێوان مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان و حکومەتی ئێران لەماڵومەوەوە بوو

مام حەمید رەشاش لە درێژەی بیرەوەرییەکانی خۆییدا ئاماژە بەم پەیوەندیە دەکات و دەڵێ: مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٢ بوو رۆژێك مامۆستا برایم ئەحمەد داوای سێ ووڵاغی لێکردم ووتی: پێویستمان پێیە، منیش هاتمە گوندی (درێ) سێ وڵاغم پەیداکردوو هێنام بۆ ئەشکەوتی ماڵومە ئەوەبوو عەلی عەسکەری و مامۆستا عومەر دەبابە لەگەڵ من واتە

(حەمید رەشاش) بەرە بەیانی ئەو رۆژە بەرێكەوتین بەرەو ماوەت هێشتا رۆژ هەڵنەهاتبوو گەیشتینە گوندی (ئاوە كورتیێ) ئەو شەوە لەماڵی مەلا ئەحمەد ماینەوەو نانی بەیانیمان خوارد و بەرێكەوتین بۆ سەر سنوور تا گەیشتینە سەر ئەو ئاوەی ئێران و عێراق لێك جیادەكاتەوە لەوێدا كاك عەلی عەسكەری و مامۆستا عومەر دەبابە چەكەكانیان دایەوە بە من و ئەوان لە ئاوەكە پەڕینەوەو بەرەو ئێران بەڕێ كەوتن تاكو گەیشتنە ناو مەخفەرەكەی سەرسنوور چاوم لێبوو ئینجا من گەڕامەوە، دوای ١٥ رۆژ ئەوان گەڕانەوە بۆ ماڵومە دیاربوو هەندێك دیارییان هێنابوو، بەڵام حكومەتی ئێران داوای كردبوو كە سكرتێری حیزب ببینێ بۆ ئەوەی گفتوگۆی لەگەڵ بكەن، ئەوەبوو مامۆستا برایم ئەحمەد شێوەی خۆی گۆڕی بۆ ئەوەی لەم رێیانە كەس نەیانناسێتەوە، ئەوەبوو خۆی ئامادە كرد ، تا ئەو كاتەی پیاوێك هات برای عەولا ئاغا بوو هەر ئەو شەوە مامۆستا برایم ئەحەمەدو براكەی عەولا ئاغا بەرێكەوتن بەرەو ئێران دووبارە ئەوانیش ١٥ رۆژیان پێچوو، هەر كەهاتنەوە مامۆستا دیاریەكی باشی هێنابوو دووباری ولاّغ تفەنگی برنەوی نوێی هێنابوو هەندێك یارمەتی و پارەو پووڵیشی هێنابوو تفەنگەكانی بە ئەمانەت لای من داناو منیش ژوورێكی بچووكم لەناو ئەشكەوتەكە دروست كردبوو تفەنگەكانم لەوێدا دانا، دوای سەفەرەكەی مامۆستا برایم و گەڕاینەوە، هەر هەموومان دڵخۆش بووین بەخێرهاتنەوەی مامۆستا برایم ئەحمەدمان كردو ئەویش چیرۆكێكی بۆ گێڕاینەوە، دیارە لەو كاتانەدا من پشیلەیەكم هەبوو بۆ مشك گرتن ڕامگرتبوو، چونكە ئەو ئەشكەوتە مشكی زۆربوو منیش ئەو پشیلەم بۆ ئەوە ڕاگرتبوو، مامۆستا برایم لەكاتی گەڕانەوەی پرسیاری ئەو پشیلەی لێكردم ووتی كاك حەمید پشیلكەت چۆنە

منیش سەرم سوڕماو ووتم مامۆستا خێرە پرسیاری پشیلەکەم لێ دەکەی ئەویش ووتی لەو گوندانەی سنوور کەمن پێدا چووم و گەڕامەوە باس باسی ئەو پشیلەیەو واش بلاّوبۆتەوە کە ئەم پشیلەی تۆ شۆڕش بۆ کاری تەتەری بەکاری دەهێنن نامە بۆ بنکەکانی پێشمەرگە دەهێنێ و دەبا، بۆیە داوات لێدەکەم ئەو پشیلەیە نەفەوتێنی، ئەوەبوو ئەو پشیلەی لای من مایەوە لە دواییدا دام بەهەڵۆی مامۆستا برایم ئەحمەد.

هەروەها لە درێژەی بیرەوەرییەکانی مام حەمید رەشاش ئاماژە بە کۆبوونەوەکانی مەکتەبی سیاسی دەکا لە ئەشکەوتی ماڵومە دەڵێت: ئەو دووساڵەی لە ئەشکەوتی ماڵومە بووین دوو کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی لێ ئەنجام درا. لەدوای ئەوەی پەیوەندیمان لەگەڵ ئێران پەیدا کرد، دەزگای بێتلیشمان لەناو شۆڕش پەیداکرد، بێتەلەکەی ئێمە ناوی (پیرمام) بوو زۆربەی بارەگاکانمان بێتەلیان هەبوو.. لەئەشکەوتی ماڵومەوە بۆ گوندی عیساوێ.

لەدرێژەی... بیرەوەرییەکانی مام حەمید رەشاش باسی گواستنەوەی مەکتەبی سیاسی لە ئەشکەوتی ماڵومەوە بۆ گوندی عیساوێ دەکات، مەکتەبی سیاسی پاش ئەوەی بڕیاریان دا بچنە گوندی عیساوێ من لە لایەن خۆمەوە داوای ئەوەم کرد ماوەیەك بگەڕێمەوە بۆ خوارەوە بۆ جەولەی پێشمەرگایەتی ئەوەبوو هاتمەوە گوندی حاجی قەلاّ زۆری پێ نەچوو مەکتەبی سیاسی بەدوای منیان ڕەوانەکرد بەزووترین کات بگەڕێمەوە بۆ مەکتەبی سیاسی لە عیساوێ هەر لەگەڵ گەیشتنی نامەکە من گەڕامەوە یەکسەر چوومە لای مامۆستا برایم ئەحمەد ووتم داواتان کردبوو بگەڕێمەوە فەرموو ئەوە هاتمەوە، ئەویش ووتی: بەنیازین ئەکادیمیای عەسکەری

بکەینەوە تۆش شارەزایی سەربازی باشت هەیە بۆیە ئێمە تۆمان دەست نیشان کردوە وەك بەرێوەبەری ئیداری ئەکادیمیەکەو لە هەمان کات وەك مامۆستایەك بۆ مەشقی سەربازی ئەوەبوو خولەکەمان کردەوە لە سەرەتا چل خوێندکارمان وەرگرت لە بەشی زانستی، زۆرمان ماندوو دەکردن جاری وا هەبوو خۆشمان بێزار دەبووین لە ڕاهێنانەکە، جگە لە مەشقی سەربازی شەوانیش وانەی سیاسیان بە خوێندکارەکان دەگووتەوە لای مامۆستا مەلا عەولاو چەند مامۆستایەکی تر هەر کە خولەکەش تەواو بوو هەموو خوێندکارەکان بە ئەفسەری پلە یەك دەرچوون.

بەر لەوەی مەکتەبی سیاسی بگوازرێتەوە بۆ عیساوێ هاتن چەند خانوێکی باشیان لێ دروست کرد دیاریکردنی عیساوێ گرنگی خۆی هەبوو یەکێك لەوانە شوێنەکەی کەوتبووە سەر سنووری ئێران، هەروەها دووشاخی بەرزیشی لێیەو بۆردومانی فرۆکەش نایگرێتەوە مەکتەبی سیاسی کە لەعیساوێ بوو گەرمە گەرمی کوردایەتی بوو، شۆرش پێشکەوتنی باشی بە خۆوە بینیبوو لەگەڵ ئەوەش دەنگۆی ئەوە پەیدابووبوو کە گوایە سەرۆك بارزانی لەگەڵ حکومەتی عەبدولسەلام رێکەوتووە کە یەك لایەنە ڕاگرتنی تەقەی ڕاگەیاندووەو نابێ کەس تەقە لە هێزەکانی حکومەت بکات، پاش ماوەیەك مەکتەبی سیاسیان نارد کەبەشداربن لەم گفتوگۆیە، ئەوەبوو مام جەلال و مامۆستا برایم ئەحمەدو نوری شاویس منیش لەگەڵ مەفرەیەك پێشمەرگە بەرەو ڕانیە بەڕێکەوتین، مەکتەبی سیاسی و مستەفا بارزانی نەگەیشتن بە یەك ئەوەبوو لەناو هێزی پێشمەرگە سەنگەر گوازتنەوە دەستی پێکرد هەرچی بارزنی بوو بەلای حکومەتی عێراقی دەچوو، باڵی مەکتەبی سیاسیش دەیان ووت ئێمە چەند ساڵە خەریکی شۆڕشین بۆ خەڵك، بۆیە

دەبێ هەموو شتێك بۆ خەڵك ئاشكرا بكەین ئەوە بوو چەندین جار هاتووچوو لە نێوانیان كرا، بەڵام بێسوود بوو خەڵك هاتنە بەینی هەردوو لا، بەڵام بێسوود بوو ئەوەبوو وەفدێكی گەورە لە شێخ و پیاوە ماقوڵان پێكهاتبوو لەبەر ئەوەی خەڵك نەیدەویست لێك بترازێن، دوای بەستنی كۆنفرانسی ماوەت ئەوەبوو مەكتەبی سیاسی بڕیاریدا بارزانی لەكارەكانی حیزب دوور بخەنەوە، كەواتە لە حیزب دەركرا، دوای ئەوە بارزانی وەفدێكی ناردە لای ئەندامانی مەكتەبی سیاسی كە پێكهاتبوون لە (عەبدولڕەحمان گۆمەشینی و ساڵح شێرە) ئەوانیش بە نائومێدی گەڕانەوە، ئەوەبوو زۆربەی ئەندامانی لێژنەی مەركەزی لای باڵی مەكتەبی سیاسی بوون بەشێكی كەمی لای بارزانی بوو، ئەوەبوو بارزانیش كۆنگرەیەكی بەست و بڕیاریدا ئەندامانی مەكتەبی سیاسی لە حیزب دەربكەن لێرەوە شۆڕشەكە بوو بە دوو لەت، لە دوای ئەوەش خەڵكێكی زۆر هاتەوە بەینیان، بەڵام بێسوود بوو ئەوە بوو هێزەكان كەوتنە ئامادە باشی، بەڵام مام حەمید رەشاش ئاماژەی بەوە كرد كە ئەو بڕیاری داوە باس لە شەڕەكان نەكا، چونكە ئازاری دەدا، ئەوەی راستیش نەبێ نایڵێت هەر ئەوەندە بەسە ئەوەی كردمان لە هەردوولا بۆ كورد نەبوو شەڕە كاوڵكارییەكە لە ١٩٦٣/٧/٢٤ دەستی پێكردو دوو لەت بوونەكە بووەماڵوێرانی بۆ كورد.

لەدرێژەی گێڕانەوەكانیدا مام حەمید رەشاش ئێمەی بردەوە گوندی ئاوەكورت كە كەوتبووە سەر سنووری ئێران و گوتی: كاتێك مەكتەبی سیاسی هاتە گوندی عیساوێ ئەوەبوو مامۆستا برایم ئەحمەد ماڵەكەی خۆی هێنایە گوندی ئاوە كورتێ لەگەڵ ماڵی مامۆستا نوری ئەحمەد تەها، هەروەها ماڵی مامۆستا مەلا عەولاش هەر لەو گوندە بوو لەگەل ماڵی سەدیقە

ئەفندی کە ئەو کاتە مامۆستا نوری ئەحمەد تەهاو سەدیقە فەندی هەردووکیان لێپرسراوی ئازووقەی گشتی شۆڕش بوون، کۆگاکانی ئازوقەکەش لەخوار گوندی ئاوە کورت بوو ئەو کاتەکە ڕیکەوتەکەی ١٩٦٤/٧/٢٤ بوو هێزی باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان بۆ دیوی ئێران پەڕینەوە ماڵەکانیشیان لەگەڵ خۆیان پەڕاندەوە، حەمید ڕەشاش و سێ پێشمەرگە ماوەی دوو مانگ لەسەر سنوور بەقاچاغی مانەوە.

دوای هەڵوەشانەوەو پارچە بوونی پارتی دیموکراتی بۆ دوو باڵ ئەوە منیش لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسی یەکێك لەو پێشمەرگانە بووم کە پەڕینەوە بۆ ئەو دیوی ئێران دەڵێ: کەپەڕینەوە لە سەر سنووری ئێران چووین بۆ شاری هەمەدان ئێمە ئەو کۆمەڵە پێشمەرگەیە ڕئیس کەمال موفتی و عومەر دەبابەو عەلی عەسکەریمان لەگەڵ بوو ، مامۆستا برایم ئەحمەد و مام جەلالیش لەتاران بوون ئێمە ئەو کۆمەڵە پێشمەرگەیە بۆ ماوەی دووساڵ لە هەمەدانماینەوە ئەو ماوەی لەوێ بووین زۆر ڕۆژگاری تاڵ و شیرینمان بەڕێکرد لەوێ تا ئەو نەورۆزە بوو کە لەهەمەدان ئەنجامماندا، کە نەورۆزێکی خۆشبوو چونکە ئێمە لەشۆڕشی ئەیلول دوو نەورۆزمان یاد کردەوە ئەوەی بێتواتە لەکاتی سەرەتای شۆرش بوو گوزەرانمان زۆر باش نەبوو، بەلام ئەو ماوەی لەهەمەدان ماینەوە نەورۆزێکی خۆشمان کردەوە بەر لەمانگێك پێش نەورۆز ئامادەکاریمان کردبوو مامۆستا خالید دلێر سەرپەرشتی ئاهەنەکەی دەکرد پرۆڤەیەکی باشمان کرد، ئەو کاتە من و مامۆستا جەعفەر عەبدولواحید هەردووکمان لە تیپی هەڵپەرکێ بووین و لەم ئاهەنگە بەشدار بووین، شۆرش ئامادەکاری باشی کردبوو خەڵکێکی زۆریان بانگهێشت کردبوو خەڵکەکی زۆری هەمەدانیش ئامادەببوون، حکومەتی ئێرانیش هۆڵێکی بۆ

دابین کردبووین، مامۆستا خالید دلێر شیعرێکی نوێی بۆ نەورۆز نووسیبۆوە لە هەمان کاتیش کردبووی بەسروودێکی زۆر خۆش و لانەوازە من دوو دێریانم لەبیرماوە (سالێکی تریش وا داهاتەوە * ڕۆژی نەورۆزی کورد هەلاتەوە * ئێمەش لەدوور وولاتەوە * بەگوڵی سووری ڕێی خەباتەوە) ئاهەنگەکە بەسروودی ئەی رەقیب دەستی پێکرد دوا بەدوای سروودەکە مامۆستا عومەر دەبابە ووتارێکی بەزمانی فارسی پێشکەش کردو لەدواییش بەزمانی کوردی خوێندیەوە، جگە لەپێشمەرگەکانمان خەڵکێکی زۆرمان بانگێشت کردبوو خواردنێکی زۆرمان دروست کردبوو، بەلام بەداخەوە لەم ڕۆژەدا پێشمەرگەیەکمان لەکاتی جێبەجێکردنی ئەرکەکانی کەوتە مەنجەڵی چێشتەکەو سووتاو شەهید بوو بەناوی (کاکەڕەش هەرزانی).

لەو ماوەیەی کە لە هەمەدان دوو پێشمەرگە لێمان تۆرا ببوون و جیاببونەوە ئەوەبوو خۆیان فرۆشت بوو بە ساڤاکی ئێرانی، ئیشیان بۆ ساڤاکی ئێرانی دەکرد هەستابوون توهمەی ئەوەیان بۆ دروست کردبووین گوایە ئێمە کۆمەنیستین واتە لە دژی حکومەتی شای ئێراندا کار دەکەین ئەوە بوو بۆ ماوەی دوو مانگ ئێمە چوار پێشمەرگەبووین پێك هاتبووین لە (بەندەو دکتۆرحەسەن و ئەنوەر جۆخین و شێخ عەزیز و خالید ئاژگەیی) لەولاتی ئێران دەریان کردین، لەسەر سنووری ئێران عێراق لەگوندی (موسەك) قاچاغی ولاتی ئێران و عێراق پارتی بووین، پاش ئەوە دوو مانگ لەو ناوچە ماینەوە لەگەڵ گەڕانەوەی هێزەکانمان بۆ عێراق ئێمەش گەیشتینەوە ناو هێزەکانمان، ئەوەبوو هێزەکان بە دوو قۆڵ گەڕانەوە یەکیان بەمەرزی حاجی ئۆمەران و ئەوەی تریان بە زوورگوێز ئەوەی حاجی ئۆمەران سەرکردەکانی لەگەڵ بوو لەوانە (عەلی عەسکەری و عومەر دەبابە و رەئیس

کەمال موفتی) ئێزەگەکەشیان لەگەڵ خۆیان هێنابۆوە، هەر لەم قۆڵەدا کە لەسنوور دێنە ژوورەوە تووشی شەڕێکی سەخت دەبن لە چیای کۆڕەك سیانزە پێشمەرگەی قارەمان لەو هێزەی ئێمە شەهید دەبێ لەوانە عەریف حەسەن توومەیی بوو، ئێزگەکەی مامۆستا عبدولخالق مەعروف لە هەمەدانەوە کێشەی نایەوە.

مام حەمید رەشاش لە درێژەی یادەوەرییەکانی خۆی لەهەمەدانەوە ئاماژە بەو ئێزگەیە دەکات ودەڵێ: کە لەهەمەدانەوە بووین خوالێخۆشبوو (عەبدولخالق مەعروف)یش لەوێ بوو بەراستی لەبواری تەکنیکاری زۆر بە سەلیقەو شارەزابوو لە بواری رادیۆش پسپۆربوو، رۆژێك مامۆستا لەبازاری هەمەدان ڕادیۆیەکی کۆنی بەرچاو دەکەوێت دەیکرێ و دەیهێنێتەو لەژووری ناوچەی دانابوو ئیشی لەسەرکرد تاوەکو کردیە ئێزگەیەکی بچووك کە لەناو هەموو هەمەدان دەتوانرا گوێی لێ ڕابگیرێ بەراستی بۆ ناوخۆی هەمەدان پە خشێکی باشی هەبوو چالاکی هونەری و بۆ کۆڕو کۆبوەنەوەکان زۆر سوودمان لێوەرگرتبوو جار جارەش گۆرانی داواکراوی لێ پێشکەش دەکرا، پاش ماوەیەك ئەوەبوو ئاشکرا بوو حکومەتی ئێران هاتن چوار دەورەیان گرت ئێزگەکەیان دەست بەسەرداگرت و بۆ خۆیان برد، مام جەلال وهەڤاڵەکانی لەبۆسەکەی گوندی نۆرێ رزگاریان بوو.

مام حەمید رەشاش ئاماژە بە چۆنیەتی رزگاربوونی هەڤاڵ مام جەلال و هەڤاڵەکانی دەکات و دەڵێ : پاش گەڕانەوەی هێزەکانمان لەهەمەدان ئێمە لە دۆڵە رەقە جێگیربووین لەوێدا سێ لە سەرکردەکانمان لە هێزەکەی ئێمە جیابوونەوە ئەویش ئەوانەبوون (نوری شاویس و عەلی عەبدوڵلا ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوون و نوری ئەحمەد تەها ئەندامی سەرکردایەتی) بوو،

لەدوای جیابوونەوەی ئەو سێ کەسە ماوەیەکی کەمی بەسەردا چووبوو کاتێك مام جەلال و هەڤاڵەکانی لەمیوانداری دەبن لە گوندی نۆریێ، شەو مەفرەزەیەك دێتە سەریان بەڵام عەباسی مامەندە ئاغا فریایان دەکەوێ و مەفرەزەکە غافیل گێردەکاو تا لەلایەکی ترەوە مام جەلال و عەلی عەسکەری وعومەر دەبابە و کاك حیلمی خۆیان دەرباز دەکەن ودەچنە گوندی خدران و لەوێشەوە بۆ گەورەدێ و لەوێشەوە خۆیان دەگەێننە ناو شاری سولێمانی ئەو کاتە مەحەمەدی حاجی تاهیر لێپرسراوی ناو شاری سلێمانی بوو ئەوەبوو مام هاتە ناو شاری سولێمانی و لەهێزەکەی ئێمە کە دووسەد پێشمەرگە بووین دابڕا، ئێمە لە دۆڵە ڕەقە ماینەوە بە ڕاستی بە دابڕانی مام جەلال لەم هێزە ئێمە پەشۆکاین دوای ئەوە پرسمان بە عەباس ئاغا کرد کە چی بکەین ئەویش ووتی پێویستە ئێوە نوێنەرێکتان بچێتە لای ئیدریس بارزانی ئەوەبوو هەڤالآن من و مەلا حەسەنیان دەست نیشان کرد بۆ چوونە لای، ئەوەبوو چووین بۆ لای ئیدریس بارزانی لە گەلاڵە دوو ڕۆژ لەوێدا ماینەوە خۆی نیشانی ئێمە نەدا ئێمە تەنیا بۆ ئەوە چووبوین پێی بلێین دەمانەوێ وەك پێشمەرگەیەك لەوێ بمێنینەوە بەئاگری کەس نەسووتێین، بەڵام هیچ وەڵامێکمان وەرنەگرتەوە، ناچار گەڕاینەوە بۆ دۆڵەڕەقە ، بەڵام ووتبووی کاك کەمال دێتە لاتان قسەی منی پێیە، ئێمەش داواکەی ئیدریس بارزانیمان ڕەتکردەوە.

کاك کەمال کە هات ووتی: ئەوە ئیدریس بارزانی دەڵێ ئێمە ئەو هێزەی ئێوە دابەش دەکەین بەسەر هەموو هێزەکان، ئێمەش ئەوەمان قبوڵ نەکرد و ووتمان ئێمە هێزێکین نامانەوێ لە یەکتر جیاببینەوە، هەر لەو کاتانە بوو نامەیەکی مام جەلال و هەڤاڵەکانیمان لەسلێمانی پێگەیشت بۆ من و عەریف

سلێمان هاتبوو كە لێی نووسرابوو ئێوە هێزەكانتان با هەر لای عەباس ئاغا بمێنێتەوە تا ئێمە ئاگادارتان دەكەینەوە لەهەر گۆڕانكاریەك و جووڵەیەك بەم هێزانە ئێوە حەوت پێشمەرگەتان بەفەرماندەیی حەمید رەشاش لای عەباس ئاغا بمێنێتەوە، لەلایەكی تریشەوە مام جەلال و هەڤاڵەكانی لەسلێمانی كەوتبوونە گفتوگۆ لەگەڵ حكومەت لەسەر بەیاننامەی بیست و نۆی حوزیرانی ساڵی ١٩٦٦ لەم بەیاننامەیە هاتووە كە بارزانیش بەشدار دەبێت لەم گفتوگۆیە، ئەوە بوو بارزانی ڕازی نەبوو بەو ڕێكەوتنەی بیست ونۆی حوزەیران.

مام حەمید رەشاش لە درێژەی بیرەوەرییەكانی ئاماژە بەوە دەكات دووبارە ئەم دوو باڵەی پارتی لێك بە دووركەوتنەوەو زیاتر لێكترازان، ئەوەبوو باڵی مەكتەبی سیاسی هێزێكیان كۆكردەوە و بۆ لای گوندەكانی قەواری و زەردە لیكاو و تیمار ڕۆیشتن لەوێدا كۆنفرانسێك بەستراو هێزێكی تر پێكهات بەناوی هێزی ڕزگاری لەژێر فەرماندەیی هەڤاڵ مام جەلال و لەبەكرەجۆ جێگیر بوون ئێمەش لەگەڵ رەئیس حەمەدەمین و خاڵە شێخ جەنگی و عەریف سولێمان ئەو كاتە لە قەڵادزێ بووین بەڕێكەوتین بۆ بەكرەجۆ هەر كە گەیشتین لەگەڵ ئەو هێزی رزگاری گەشتینەوە یەك، ئەوەبوو هێزەكە گەورەتر بوو، مام جەلال فەرماندەی هەموو هێزەكەی دەكردو بارەگای سەرەكیش لەبەكرەجۆ بوو ئیش و كارەكانی دابەش كرد، من بوومە ئەندامی ناوچەی پێشمەرگەو لێپرسراوی ئیدارەو جەبخانەی پێشمەرگە.

مام جەلال بەكرەجۆی كردبووە گۆڕەپانێك بۆ جۆشدانی خەباتی رزگاری خوازی نەتەوە چەوساوەكان و پەیوەندی بەستن بە شۆڕشەكانی جیهانەوە

ئەوەبوو چەندین شۆڕشگێری ئەریتیری هاتبوون لە بەکرەجۆ لای ئێمە مەشقی سەربازییان دەکرد کە من یەکێك بووم لەوانەی سەرپەرشتیم دەکردن و فێری بەکارهێنانی جۆرەها چەکمان دەکردن، ماوەی زیاتر لە ١٥ ڕۆژ لای ئێمە مانەوە لەدواییدا گەڕانەوە بۆ وولاتی خۆیان.

لەدرێژەی بیرەوەرییەکانی خۆی لە بەکرەجۆ رەشاش دەڵێ: هەر کە لەبەکرەجۆ جێگیر بووین هەر هەموومان خانەوادەکانی خۆمان هێنایە ئەوێ زۆربووین لەوان خاڵە شێخ جەنگی و شێخ شەرەف وشوکرڵلا و مەلا موساو تۆفیقی مەلا سەدیقی و ماڵە کاوانییەکان و بەندەو کۆمەڵێك پێشمەرگەی ڕۆژهەڵات بوو، کە قادری شەریفی سەرکردایەتی دەکردن، مام جەلال هەمووی خستبووە شانەی حیزبی، چونکە پێویست بوو لەشانەی حیزب کاربکەن، بۆ مێژوو دەیگێڕمەوە من لەشانەیەك بووم کە مام جەلال لەو شانەیە ئەندام بووە کە من لێپرسراو بوویمە لەبارەی ئازادی ڕادەربرین مام جەلال ئازادی تەواوی دابوو بەهەموو ئەو کەسانەی ڕەخنەیان هەبوو یان ڕای جیاوازیان هەبوو، لەبەردەم بارەگاکەی خۆی لەبەکرەجۆ تابلۆیەکی هەڵواسی بوو هەر کەسێك ڕەخنە یاخود پێشنیاری هەبێ دەتوانی زۆر بەئازادانە ڕەخنەکەی خۆی لەم تابلۆیە هەڵبواسێ، بۆ ئەوەی بگاتە مام جەلال تا ڕای زۆرترینی خەڵکەکە لەسەر بابەتە گۆڕانکاریەکان وەربگرێ، کار گەیشتبوە ئەوەی خەڵکەکە دەیانتوانی ڕەخنە لە خودی مام جەلال بگرن، بۆ نموونە جارێکیان من لەسەر سەفەرێکی مام ڕەخنەم لێی گرت لەسەر ئەوەی کە هاتەوە هەرچی کادیری عەسکەری هەبوو لەگەڵیان کۆبوەوە قسەی بۆ کردن، بەڵام لەگەڵ ڕابەرە سیاسیەکان هیچ کۆبوونەوەیەکی ئەنجام نەدا منیش لەسەر ئەوە ڕەخنەم لێی گرت و پێم وت جەنابی مام جەلال من ڕەخنەم

له‌جه‌نابت هه‌یه وه‌ك عه‌سكه‌ر له به‌رامبه‌رم وه‌ستاو وتی فه‌رموو ره‌خنه‌كه‌ت چییه، ووتم جه‌نابت ده‌ڵێی بناغه‌ی شۆڕش و پێشمه‌رگایه‌تی رێكخستنه، كه‌چی له‌گه‌ڵ هه‌ر هه‌موو عه‌سكه‌رییه‌كان كۆبوویه‌وه‌و ته‌نیا رابه‌ره سیاسیه‌كان نه‌بێ هیچ لێدوانت بۆیان نه‌بوو، گوتی ڕاست ده‌كه‌ی من هه‌ڵه بوویمه و داوای لێبوردنی لێكردم، مام حه‌مید ره‌شاش له‌م باره‌یه‌وه ده‌ڵێت: ئه‌وه‌یه گه‌وره‌یی مام جه‌لال هه‌تا ماوم له‌بیری ناكه‌م و شانازی پێوه ده‌كه‌م، نه‌ك من پێویسته هه‌موو كورد شانازی به‌و پیاوه مه‌زنه بكات.

· مام جه‌لال یارمه‌تی ئه‌و پێشمه‌رگانه‌ی ده‌دا كه هاوسه‌رگیریان ده‌كرد، حه‌مید ره‌شاش ئاماژه به‌لایه‌نێكی تری ژیانی تایبه‌تی پێشمه‌رگه‌كانی ناو به‌كره‌جۆ ده‌دات به‌تایبه‌تی ئه‌وانه‌ی ده‌یانویست پرۆسه‌ی هاوسه‌رگیری ئه‌نجام بده‌ن، له‌م باره‌یه‌وه ره‌شاش ده‌ڵێ: بۆ مه‌به‌ستی پشتگیری كردنی پێشمه‌رگه‌كان له‌كاتی هاوسه‌رگیریدا هه‌ڤاڵ مام جه‌لال یارمه‌تیه‌كی دیاری كردبوو بۆ ئه‌وانه‌ی كه هاوسه‌رگیری ده‌كه‌ن كه ئه‌ویش بڕی ٥٠ دیناری سویسری بوو كه ده‌درا به هه‌ر پێشمه‌رگه‌یه‌ك كه ژنی ده‌هێناو له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا فه‌رده‌یه‌ك شه‌كرو فه‌رده برنجێك و یه‌ك ته‌نه‌كه ڕۆنی زه‌یتی وه‌ك هاوكاری و پشتگیری كردن بۆ هێزی پێشمه‌رگه‌ی ده‌دا، هه‌روه‌ها ڕێنمایی ئه‌وه‌شی ده‌ركردبوو به‌هه‌موو شێوه‌یه‌ك ته‌قه‌كردن له‌ئاهه‌نگه‌كه‌دا قه‌ده‌غه بكرێت.

له‌درێژه‌ی بیره‌وه‌رییه‌كانی، مام حه‌مید ئاماژه به گه‌شه‌كردنی قه‌باره‌و ژماره‌ی هێزی پێشمه‌رگه ده‌دات و ده‌ڵێ: جگه له‌و هێزه‌ی كه له‌به‌كره‌جۆ هه‌مان بوو هێزێكی تریشمان له كه‌ركوك هه‌بوو به‌ناوی هێزی خه‌بات كه شه‌هید عه‌لی عه‌سكه‌ری فه‌رمانده‌ی ئه‌و هێزه بوو هه‌ر له‌هه‌مان كاتیش

مامۆستا عومەر دەبابە کە فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگە بوو ئەویش هەر لەکەرکوك دادەنیشت، بەڵام ئەو هێزەی لە بەکرەجۆ بوو تۆکمەترو پڕ چەکترو گەورەتر بوو، لەهەمان کاتیش مام جەلال فەرماندەیی دەکردن و لەنزیکەوە لەگەڵیان دەژیا.

لەدرێژەی یادەوەرییەکانیدا مام حەمید رەشاش ئاماژە بەهەندێك لەو ناوانە دەکات کە ئەو کاتە لەوێ ئامادەبوویەو لەهەمان کات هەندێکیان لێپرسراوەتیان هەبووە، دەڵێ: بمبورن ئەگەر هەندێك ناوم نەهێنابێ، چونکە بەڕاستی ئەوانەی ئێستا لەو کاتەدا لەبیرمن کە لەبەکرەجۆ بووین کۆمەڵێك سەر لق و سەر پەل هەبوون ئەوانەی ناوەکانیانم لەبیرە ئەوانەن (ئەحمەد عەبدولاّ کوردە کە پیاوێکی زۆر تێکۆشەر بوو هەروەها حەمەی فەرەج لەهەمان کات وەکیلی مام جەلالیش بوو عەریف محەمەدو سەید تاهیرو کوێخا عەبدولاّو کۆمەڵە کەسێکی تر...) بەکرەجۆ بارەگای سەرکردایەتیمان بوو ئیدارەی بەکرەجۆ لە سێ بەش پێکهاتبوو، بەشی یەکەمیان مالیە بوو کە کاك کەریم جەوهەر سەرپەرشتی دەکرد، هەروەها تۆفیقی مەلا سدیقیش لێپرسراوی بەشی خواردەمەنی بوو، منیش (حەمید رەشاش) لێپرسراوی تەقەمەنی بووم، هەروەها لێپرسراوی ئەندام ناوچەکانیش (ئەحمەد دادی) بوو لێژنەیەکیش هەبوو بۆ دابەشکردنی خانوو بەسەر پێشمەرگەدا.

هەروەها مام حەمید رەشاش لەدرێژەی یادەوەرییەکانی باس لە گۆڕەپانی مەشقی سەربازی بەکرەجۆ دەکاو دەڵێ: ئێمە گۆڕەپانێکی سەربازی باشمان هەبوو بۆ مەشقی سەربازی ئەوەبوو کۆمەڵە گەنجێك لە سلێمانیەوە هاتن بۆ ئێرە من مەشقی سەربازیم پێدەکردن لەوانەی کە لەبیرم ماون (حەمە چاوشین، شازاد سائیت، ڕوشدی عەلی سدیق، نەوشیروان مستەفا، گەلێکی

تر..)، ئێمە ماوەی سێ ساڵ لەبەکرەجۆ ماینەوە، دوای سێ ساڵ بە بڕیارێکی مەکتەبی سیاسی مام حەمید رەشاش ڕەوانەی هەولێر دەکرێتەوە مام حەمید رەشاش لەوێ دەبێتە فەرماندەی هێزی هەولێرو دەڵێ: من لە بڕیارەکە سەرەتا بە فەرماندەی هێزی هەولێر دەست نیشان نەکرابووم بەڵکو لەبڕیارەکەی مانگی هەشتی ساڵی ١٩٦٩ بە فەرمانی مەکتەبی سیاسی گوازرابوومەوە بۆ هەولێر، بەپێی ئەم بڕیارە من بەسەرپەشتیاری ئیدارەو ڕێکخستنی هێزی هەولێر لە شوێنی سەید مەجید دانرابووم هەر لەنوسراوەکە هاتبوو شەهید دکتۆر خالیدیش لە شوێنی مەلا عەولآ دانرابوو کرابوو بەفەرماندەی هێزی هەولێر، هەروەها شێخ لەتیف بەرزنجیش کرابوو بەلێپرسراوی ڕێکخستنەکانی هەولێر، دیارە هۆکاری ئەم ئاڵووگۆڕیەش، ئەوەبوو کە مەکتەبی سیاسی هەستی بە سستیەك کردبوو لە ناوچەی هەولێر، بۆیە ئەم بڕیارەیدا ئەم ئاڵوگۆڕییە بکرێ، ئەوەبوو من لەگەڵ سەید مەجید ئاڵووگۆڕکاریمان پێکراو، من ئەو ڕۆژە موچەی مانگی نۆشم لەگەڵ خۆم بردبوو بەسەریانم دابەشکرد، بەپێ ی ئەو زانیاریانەی من لە سەید مەجیدم وەرگرتبوو ئەو هێزەی هەولێر پەرش و بڵاوبوەوە بەسەر ناوچەکان بۆ نموونە پەلێك لە گوندی تەرجان کە ڕەشۆ سەر پەل بوو، لقێك لە گوندی گەزنە کە جەوهەر گەزنەیی سەر لقی بوو، لقێك لە مەخمور بوو ئەحمەد مەحمود سەر لقی بوو، باقرت، سەرگەڕان، بێستانە، پەلکانە، زۆری پێنەچوو شەهید دکتۆر خالیدیش هات، بەڵام ماوەیەکی کەم مایەوەو ڕۆیشت لەبەر ئەوەی بارودۆخەکەی بەدڵ نەبوو و گەڕایەوە بۆ بەغدا، ئەوەبوو ئیشوکاری فەرماندەی هێزەکە بە من ڕاسپێردراو منیش هێزەکەم کۆکردەوەو هەر لەسەرەتای هاتنم دژی شەڕی براکوژی بووم، دژی ئاژاوە نانەوەش بووم،

ئەوەبوو هێزەکەی خۆمانم لەدوو شوێن کۆکردەوە، چەند بارەگایەکمان هەبوو لەناو هەولێر چەند بارەگایەکمان لە گەڕەکی کوران هەبوو، من هێزی سەرەکیم لە قوشتەپە دانا، بنکەیەکیشم لەبێستانە دانا بەسەرپەرشتی شەهید محەمەد عەجەم، هەروەها لەم ماوەیە (محەمەد شێخە شلی) وەکو یاریدەدەر هاوکارم بوو، ئەو کاتە بارەگای لق لە لای گۆڕەپانی ئێستای شێخ مەحمود نەمر بوو لەهەولێر، لەبەر ئەوەی بەهاتنی من هەندێك سەرپەل و سەر لقەکانی هەولێر نیگەران بوون، بۆیە کارکردن بۆ من هەر وا ئاسان نەبوو، لەبەر ئەوەی من فەرمانەکانی حیزبم جێبەجێ دەکرد زۆر گوێم بەو ناکۆکیانە نەدەدا تەنیا خەریکی ئیش و کارەکانی خۆم بووم، ئەو ماوەیەی لەهەولێر بووم هیچ ناخۆشیەك ڕووی نەدا، هەولێر ئارام بوو دزی و جەردەیی و ڕێگری نەما، ئەو کاتەش کاك حەمەدەمین فەرەج پارێزگاری هەولێر بوو زۆر هاوکارمان بوو هەر بۆیەش سەرکەوتوو بووم، تاکو بەیانی ١١ی ئازار یەك پۆلیسی عەرەب لەشارەکانی کوردستان نەبوو.

لەبارەی بەیانی ١١ی ئازارەوە مام حەمید رەشاش بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ: لەگەڵ پەیدابوونی دەنگۆی بەیانی ١١ی ئازار بارودۆخەکە گۆڕا هەردوولا هێزەکانمان خۆیان دوور گرتبۆوە لەهەموو شەڕو ئاژاوەیەك، تاکو بەیانەکەی ١١ی ئازار خوێنرایەوەو لەبەیانەکە هاتبوو کە حوکمی زاتی بە گەلی کورد دەدرێت، ئێمە زۆر دڵخۆش بووین ئەوەبوو من و شێخ لەتیف بروسکەی پشتگیریمان نارد بۆ ئێزگەو تەلەفزیۆنی کەرکوك، بەڵام نەیانخوێندەوە، زۆری پێنەچوو پارێزگارەکانیان گۆڕی لەهەولێر حەمەدئەمین فەرەجیان گۆڕی بە خالید عبدولحەلیم کەیەکێك بوو لەئەندامانی سەرکردایەتی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، ئەوەبوو یاوەری کاك

(حەمەدەمین فەرەج)مان كرد بەرەو بەغدا تاكو توزخوماتو لەگەڵیدا بووین، لەكاتی گەڕانەوەمان بۆ هەولێر لەڕێگا لەبازگەی پردێ شێخ لەتیف و كۆمەڵە خەڵكێك ڕاوەستابوون چاوەڕوانی پارێزگاری نوێیان دەكرد ئێمەش لەگەڵ ئەوان ماینەوە تاكو لەوێدا پێكەوە پێشوازیمان لە خالید عەبدولحەلیم كردو هەندێك پۆلیسی عەرەبی لەگەڵ بوون وەكو پاسەوان، بۆ زانیاریتان لە پێش بەیانی ١١ی ئازار هیچ بنكەو بارەگایەكی حیزبی بەعس لەناو شارەكانی كوردستان نەبوو، ئەوەبوو لەلای پردێ سەیارەكانیان ڕاگرت و پۆلیسە عەرەبەكان دەستیان بەهۆسەی عەرەبی كردو دەیانووت (جاكی جاكی حیزبی بەعسی ئیشتراكی) لەگەڵ هاتنی ئەوان گرژییەك لە هەولێر پەیدابوو، هەروەها یەكێك لەخاڵەكانی بەیاننامەكەی ١١ی ئازار دەبوایە ئێمە هێزەكانمان لەناو شارەكان ببەینە دەرەوە، ئەوەبوو هێزەكانی حكومەت ویستیان شێخ لەتیف بگرن و زیندانی بكەن، بەڵام ئێمە نەماندا دەست و هەر چەندە هەندێك تەقەش كرا لەنێوان ئێمەو هێزەكانی حكومەت، ئێمە تێگەیشتین كە حكومەت دەیەوێ هێزەكانی ئێمە چەك بكا، بۆیە هێزێكی عەسكەرییان هێنایە ناو هەولێر ئەوەبوو بە بڕیاری پارێزگار دەورووبەری بارەگاكانی ئێمەیان بەهێزی عەسكەری دەورەدا داوای منیان كرد لەگەڵیان بچم بۆ لای پارێزگار منیش بۆ ئەوەی هیچ ڕوونەدات لەگەڵیان چووم، بەڵام ئەوان نیازیان خراپ بوو، چونكە لەگەڵ هاتنی ئەم هێزە عەسكەرییە هێڵی تەلەفۆنیشیان لەسەر بڕیبووین بۆ ئەوەی لەگەڵ سەركردایەتی هیچ پەیوەندییێكمان نەمێنێ، بارودۆخەكە تەنیا لەهەولێر بەم جۆرە بوو، لەلایەكی تریشەوە خەڵكیان هێنابووە بەر دەرگای بارەگاكانمان بەقسەی ناشرین و جنێودان لەدەورەمان دەسوڕانەوە، ئەوەبوو هەر كە گەیشتمە لای پارێزگار

ئەو زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکردم و منیش زۆر بێباکانە قسەم لەگەڵ کردو ئەو وتی بارودۆخەکە زۆر نالەبارەو من بەگوێی سەرۆك جاشەکانم کرد کە گوایە ئێوە پەشێوی دروست دەکەن بۆیە ئێمە هێزی عەسکەریمان هێنایە ناو شار، منیش وتم هەر شتێك ڕوویدات تۆ بەرپرسی یەکەمی لەبەر ئەوەی هێزەکەی ئێمە هەمووی چەکدارن ئەوەبوو خالید عەبدولحەلیم داوای یارمەتی کرد کە پێکەوە پلان دابنێین بۆ ئەوەی ئەم دۆخە کۆنترۆل بکەین، منیش ووتم ئێمە خەتی تەلەفۆنمان نەماوە بۆ ئەوەی لەگەڵ سەرکردایەتی قسە بکەین، چونکە من بڕیار لەسەرکردایەتی خۆم وەردەگرم، ئەویش گوتی باشە هەرچی بە ئێمە بکرێ دەیکەین، لەکاتی دەمەتەقەی نێوان من و پارێزگار، بەڕێوەبەری پۆلیسیش حوسێن شێروانی لەوێ ئامادە بوو گوتی کاك حەمید بەڕاستی خراپمان بەسەر هاتووە، منیش لەوەڵامدا وتم ئێمە حیزبین لەوەش خراپترمان بەسەرهاتووە لەناو نەچووین، ئەوەبوو ئەوێم بەجێهێشت کە گەڕامەوە تەلەفۆنەکانمان کرابۆوەو منیش یەکسەر پەیوەندیم بەمامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد کرد، ئەویش لە وەڵامدا وتی: لەگەڵ پارێزگار ڕێکبکەوەو هێزەکەت ببەوە بۆ بەکرەجۆ، لەگەڵ پارێزگار ڕێکەوتین (١٥) پانزە لۆری سەربازیمان بۆ هات هێزەکەمان بردە کەرکوك و سێ ڕۆژ لەوێ ماینەوە دوای چووین بۆ بەکرەجۆ.

پارێزگار خالید عەبدولحەلیم پیاوێکی ترسنۆك بوو زۆر دەترسا لەوەی لەنێوان هێزەکانی بارزانی و هێزەکانی ئێمە پێك دادان ڕووبدات، چونکە بارزانی وا لەگەڵ حکومەت ڕێك کەوتبوو تاکو هێزەکانی ئێمە لەشارەکان نەکشێتەوە هێزەکانی ئەوان نایەنە ناو شارەکان، ئەوەبوو منیش هەندێ چەکی زیادمان هەبوو لەمەشجەب تەسلیمی پارێزگارمان کرد هێزەکانیشمان

گەیشتە بەکرەجۆو چووم بۆ بەغدا موچە بێنم بۆ هێزەکە هەر کە گەیشتمە بەغدا لەوێش بێ متمانییەك پەیدا ببوو بەفەرماندەی هێزەکان، ئێمە لەو کاتەدا هێزێکمان لە قەلآدزێ بوو بەسەرکردایەتی شێخ عەبدولآی عەسکەری، مەکتەبی سیاسی منیان ڕاسپارد کە مووچەی ئەو هێزە دەبێ من بیبەم، من پارەکەم برد بۆ هێزەکەو دابەشم کردو سێ هەزار دینار زیاد بوو و پارەکەم ڕادەستی مامۆستا عولەما کردەوە، کە گەڕامەوە بەکرەجۆ هێزەکە بلأوەی پێکرابوو تەنیا هێزێکی کەم لەوێ مابۆوە یەکسەر ئەو هێزەمان بە بڕیاری مەکتەبی سیاسی بۆ کەلار گواستەوە، لەوێدا واتە لە بەکرەجۆ بەڕێز مام جەلال وتارێکی بەبۆنەی جەژنی نەورۆزدا، خەڵکەکە داوای لێکرد کە لەسەر ئەم بارودۆخە وتەی هەبێ ئەویش باسی دەقی بەیاننامەکەی کردوو گوتی بەیاننامەکە باس لە ئۆتۆنۆمی دەکا دیارە ئێمەش هەر داوای ئۆتۆنۆمیمان کردووە لەم کاتەدا وا باشە هێزەکانمان لەگەڵ باڵی بارزانی یەك بخەینەوە، ئەوەبوو هێزەکەی بەکرەجۆ گوێزرایەوە بۆ کەلار بەفەرماندەی مەلا عەولآ، پاش ماوەیەکی کەم ئەو هێزەی کەلاریش بلأوەی پێکراو، ئێمەش گەڕاینەوە شاری بەغداو هەر کەسە گەڕاینەوە سەر کارو وەزیفەی خۆمان.

مام جەلال یارمەتی دارایی ئەو پێشمەرگانەی دەدا کەئارەزووی ئەوەیان هەبوو هاوسەر گیری بکەن بەلأم باری ئابووری پیشمەرگەکان باش نەبوو بۆیە نەیان دەتووانی هاوسەرگیری بکەن ، حەمیدرەشاش لەم بارەیەوە دەلێ : بۆمەبەستی پشتگیری کردنی پێشمەرگەکان لەکاتی هاوسەرگیریدا هەڤاڵ مام جەلال یارمەتیەکی دیاریکراوی بۆ ئەو پێشمەرگانە دانابوو کە ئەویش بری پارەکە ٥٠ دیناری سویسری بوو لەگەل ئەوەشدا فردەیەك شەکرو فردە برنجێك و یەك تەنەکە رۆنی زەیتی وەك هاوکاری وپشتگیری

کردن بۆ هێزی پێشمەرگەی دیاری کردبوو ،لە هەمان کاتیشدا ڕێنمایی ئەوەشی دەرکردبوولەناو هێزی پێشمەرگە بە هەموو شێوەیەك تەق کردن لە ئاهەنگەکاندا قەدەغە بکرێت بەتایبەتی لە ئاهەنگی هاوسەرگیریدا . لە درێژەی بیرەوەرییەکانی مام حەمید لەم گەشتەیدا کە لەگەل بەندە هاوو سەفەر و بووین بۆ تووله ڕێیەکانی کوردایەتی ئاماژە ی بە قەبارە و ژمارەی هێزی پێشمەرگە دەدات و دەڵێ : هێزی پیشمەرگە تەنیا لە و پێشمەرگانە پێك نەهاتبوو کە لەبەکرە جۆدا ئامادەییان هەبوو لە هەمان کات هێزێکی تری پیشمەرگەمان لە ناو شاری کەرکوك هەبوو بەناوی هێزی خەبات کە شەهید عەلی عەسکەری فەرماندەی ئەو هێزە بوو هەر لە هەمان کاتدا مامۆستا عومەر دەبابە کە فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگە بوو ئەویش هەر لە کرکوك دادەنیشت ، بەلأم ئەو هێزەی لە بەکرە جۆ بوو تۆکمە تربوو لەهەمان کاتیش پرچەکترو گەورەتر بوو .لەهەمان کاتیشدا لە ژێرفەرماندەیی مام جەلال بوون هەروەها مام زۆر لە نزیکەوە ش لەگەڵ ئەم هێزەدا دەژیا ، لەدرێژەی گەشتەکەی بەناو یادەوەرییەکانیدا مام حەمید رەشاش ئاماژە بەهەندێك لەوکەس و ناوانە دەکات کە ئەوکات لە وێدا ئامادەبووینە و لەهەمان کات هەندێکیان لێپرسراوەتیان هەبووە دەڵێ : براینەدەبێ بەگەورەیی خۆتان بم بوورن ئەگەر هەندێك ناوم نەهێنابێ برواتان هەبێ بە ئەنقەست نی یە تەنیا تەمەنەو پیریە ، ئەوانەی ئێستا لەو کاتەدا دێنەوە خەیالّم و لە بیرم ماوون کە لە بەکرە جۆ پێکەوە بووین کۆمەڵێك سەرلق و سەر پەڵ هەبوون ئەوانە کەناوەکانی هەندێکیانە ( ئەحمەد عەبدوللأ کوردە کە پیاوێکی زۆر تێکۆشەر بوو هەروەها حەمەی فەرەج لەهەمان کات وەکیلی مام جەلالیش بوو عەریف مەحەمەد و سەید تاهیرو کویخوا عەبدوللأو کۆمەڵە کەسێکی تر..) بەراستی بەکرە جۆ بارەگای سەرکردایەتیمان بوو

ئیداره له بەکره جۆ له سێ بەش پێك هاتبوو ، یەکەمیان مالیه و دارایی بوو که کاك کەریم جەوهەر سەرپەرشتی دەکرد هەروەها توفیقی مەلاسەدیقش لێپرسراوی بەشی خواردەمەنی بوو منیش (حەمید رەشاش) لێپرسراوی تەقەمەنی بووم هەروەها لێپرسرا وی ئەندام ناوچەکانیش ( ئەحمەد دادی ) بوو هەروەها لەهەمان کاتیش لێژنەیەك هەبوو بۆ دابەش کردنی خانوو بۆ جێ نیشین کردنی پێشمەرگە دا. هەروەها مام حەمید رەشاش لەم گەشتەی یادەوەرییەکاندا باس له بەئەکادیمی کردنی هێزی پێشمەرگە دەکا دەلێ : گۆرپانی مەشقی سەربازی باشمان هەبوو له بەکرەجۆ بۆ مەشقی سەربازی مەبەستمان بوو لاوەکانمان شارەزایین هەبێ له جۆرەکانی چەك هونەری شەرکردن لەسەر داوای هەڤاڵ مام جەلال ئەوەبوو کۆمەڵە گەنجێك له سلێمانیەوه هاتن بۆبەکره جۆ ئەوەی له هونەری سەربازی شارەزایی پەیدا بکەن من لەوێدا وەکو مامۆستایەك مەشقی سەربازیم پێ دەکردن لەوانه ی که لەبیرم ماون ( نەوشیروان مستەفا بوو حەمه چاوشین ، شازاد سائیت ، روشدی عەلی سدیق ، گەلێکی تر ..) بەڵام بەداخەوه تەنیا ئەو ناوانەم لەیاد ماوه ، بەراستی بەکره جۆ بۆ ئێمه ببوه مەملەکەتی کوردایەتی بیری تیژی کوردایەتی هەرلەبەرئەوەش بوو ئێمه ئەوهێزه بۆ ماوەی سێ ساڵ لەبەکره جۆدا ماینەوه . دوای سێ ساڵ به بریارێکی مەکتەبی سیاسی مام حەمید رەشاش رەوانەی هەولێردەکرێتەوه مام حەمید رەشاش لەوێ دەبێته فەرماندەی هێزی هەولێرو دەڵێ : من له بریارەکه سەرەتا به فەرماندەی هێزی هەولێر دەست نیشان نەکرابووم بەڵکو لەبریارەکەی مانگی هەشتی ساڵی ١٩٦٩به فرمانی مەکتەبی سیاسی گۆزرابومەوه بۆ هەولێر بەپێ ی ئەم بریاره من به سەرپەشتیاری ئیدارەو رێکخستنی هێزی پێشمەرگەی هەولێر له شوێنی هەڤاڵ سەید مەجید دانرا بووم هەر لەو

نووسسراوەکە هاتبوو شەهید دکتۆر خالید یش لە شوێنی مەلا عولا دانرابوو کرابوو بە فەرماندەی هێزی هەولێر . هەروەها شێخ لەتیف بەرزنجیش کرابوو بە لێپرسراوی ڕێکخستنەکانی هەولێر ، مام حەمید رەشاش لەم گەشتەیدا بۆمان باسی بیرەوەریە خۆش و ناخۆشەکان دەگێڕێتەوە زۆر بە ڕاستگۆیی هۆکاری ئەم ئالوگۆڕیەشمان بۆ دەگێڕێتەوە پاش ئەوەی کە مەکتەبی سیاسی هەستی بە سستی یەك کردبوو لە ناوچەی هەولێر بۆیە ئەم بڕیارەی دا کە ئەم ئالوگۆڕییە بکرێ لە هەولێر، ئەوەبوو من لەگەل سەید مەجید ئالوگۆڕکاریمان پێکرا کە منیان ڕەوانە کرد موچەی مانگی ٩ یان پێ ڕەوان کردم ئەوەبوو هەر کە گەیشتمە هەولێر موچەکەم بەسەریان دابەش کرد . بەپێ ی ئەو زانیاریانەی من لە سەید مەجیدم وەرگرتبوو ئەو هێزەی هەولێر پەرش و بلاوببۆوە بەسەر ناوەچەکان بۆ نموونە پەلێك لە گوندی تەرجان کە کاك رەشۆ سەر پەلْ بوو لقێك لە گوندی گەزنە کە جەوهەرگەزنەیی سەر لقی بوو ، لقێك لە مەخمور بوو ئەحمەد مەحمود سەر لقی بوو ، باقرت ، ،سەرگەران ، بێستانە ، ،پەلکانە . بەراستی هێزەکەمان بلاوببۆوە زۆری پێ نەچوو شەهید دکتۆر خالیدیش هات بۆ ئەوەی کێشەکان چارەسەر بکا بەلآم ماوەیەکی زۆر کەم مایەوە رۆیشت بارو دۆخەکەی بەدلْ نەبووکە گەرایەوە بۆ بەغدا ئەوەبوو ئیش و کاری فەرماندەی هێزەکەی هەولێر بە من (حەمید رەشاش ) ڕاسپێردرا منیش هێزەکەم کۆ کردەوە وهەر لەسەرەتای هاتنم دژی شەری برا کوژی بووم دژی ئاژاوە نانەوەش بووم ئەوەبوو هێزەکەی خۆمانم لە دوو شوێن کۆکردەوە ، چەند بارەگایەکمان هەبوو لەناو هەولێر چەند بارەگایەکمان لە گەرەکی کوران هەبوو ، من هێزی سەرەکیم لە قوشتەپە دانا بنکەیکیشم لە بێستانە دانا بەسەرپەرشتی شەهید محەمەد عەجەم هەروەها لەم ماوەیە (محەمەد شێخە شلی) وەکو یاریدەدەر هاوکارم

بوو ئەو کاتە بارەگای لق لە لای گۆڕپانی ئێستای شێخ مەحمود ئەمر بوو لەهەولێر ، لەبەر ئەوەی بەهاتنی من هەندێك سەرپەڵ و سەر لقەکانی هەولێر نیگەران بوون بۆیە کار کردن بۆمن هەر وا ئا سا ن نەبوو ،بەڵام من فرمانەکانی حیزبم جێ بەجێ دەکرد زۆر گوێم بەو ناکۆکیانە نەدەدا تەنیا خەریکی ئیش و کارەکانی خۆم بووم، ئەو ماوەی لە هەولێر بووم هیچ ناخۆشیەك ڕووی نەدا هەولێر ئارام بوو دزی و جەردیی و ڕێگری نەما ئەو کاتە کاك حەمەدەمین فەرەج پارێزگاری هەولێر بوو هەر زۆرزوو پەیوەندییم پێوە کردبۆ ئەوەی هاوکاریم بکات ئەوەبوو بەراستی زۆر هاوکارمان بوو دەتوانم بلێم هەر بۆیەش سەرکەوتوو بووم . تاکو بەیانی ١١ی ئازار لە هەولێر ماینەوە ، هەرچەندە لە ددوای بەیانەکە تەرازووی هێز گۆرا و هاوسەنگیەکە تێك چوو ، لەم بارەیەوە لە گەشتەکەی مام حەمید بە توله ڕێیەکانی کوردایتیدا بۆمان دەگێرێتەوە دەڵێ : تا بەیانی ١١ی ئازار یەك پۆلیسی عەرەب لە شارەکانی کوردستان نەبوو ، لە گەل پەیدابوونی دەنگۆی بەیانی ١١ی ئلزار بارو دۆخەکە گۆرا هەردولا هێزەکانمان خۆیان دوور کرد بۆوە لە هەموو شەرو ئاژاوەیەك ،تاکو بەیانەکە ی ١١ی ئازار خوێنرایەوە و لەبەیانەکە هاتبوو کە حوکمی زاتی بە گەلی کورد دەدرێت ئێمە زۆر دڵخۆش بووین ئەوەبوو من و شێخ لەتیف بروسکەی پشتگیریمان نارد بۆ ئیزگە و تەلەفزیۆنی کەرکوك ، بەڵام نەیان خوێندەوە ، زۆری پێنەچوو پارێزگارەکانیان گۆری لە هەولێر حەمەدئەمین فەرەجیان گۆری بە خالید عبدول حەلیم کەیەکێك بوو لە لە ئەندامی سەرکردایەتی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی ، ئەوەبوو یاوەری کاك (حەمەدەمین فەرەج) مان کرد بەرەو بەغدا تاکو تورخوماتو لە گەلی بووین ، لەکاتی گەرانەوەمان بۆهەولێر لەڕێگا لەبازگەی پردی شێخ لەتیف و کۆمەڵە خەڵکێك راوەستابوون

چاوەروانی پارێزگاری نوێیان دەکرد ئێمەش لەگەل ئەوان ماینەوە تاوەکو لەوێدا پێکەوە پێشوازیمان لە خالید عەبدول حەلیم کردو هەندێك پۆلیسی عەرەبی لەگەل بوون کە یاوەریان دەکرد بۆ زانیاریتان لە پێش بەیانی ١١ی ئازار هیچ بنکەو بارەگایەکی حیزبی بەعس لە ناو شارەکانی کوردستان نەبوو ، ئەوەبوو لەلای پردێ سەیارەکانیان راگرت و پۆلیسە عەرەبەکان دەستیان بە هۆسەی عەرەبی کردو دەیان ووت ( جاکی جاکی حیزبی بەعسی ئیشتراکی ) بۆیە لە گەل هاتنی ئەوان گرژییەك لە هەولێر پەیدابوو . چونکە یەکێك لە خالەکانی بەیاننامەکەی ١١ی ئازار دەبوا ئێمە هێزەکانمان لەناو شارەکان ببینە دەرەوە ، ئەوەبوو هێزەکانی حکومەت ویستیان شێخ لەتیف بگرن و زیندانی بکەن ، بەلام ئێمە نەمان دا دەست و هەرچەندە هەندێك تەقەش کرا لەنێوان ئێمەو هێزەکانی حکومەت ، ئێمە تێگەیشتین کە حکومەت دەیەوێ هێزەکانی ئێمە چەك بکا بۆیە هێزێکی عەسکەرییان هێنایە ناو هەولێر ئەوەبوو بە بریاری پارێزگار دەورو بەری بارەگاکانی ئێمەیان بەهێزی عەسکەری دەورە دا و داوای منیان کرد لەگەلیان بچم بۆلای پارێزگار منیش بۆ ئەوەی هیچ روو نەدات لەگەلیان چووم بەلام ئەوان نیازیان خراپ بوو چونکە لەگەل هاتنی ئەم هێزە عەسکەرییە هێلی تەلەفۆنیشیان لەسەر بریبووین بۆ ئەوەی لەگەل سەرکردایەتی هیچ پەیوەندێکمان نەمینێ ، بارو دۆخەکە تەنیا لە هەولێر بەم جۆرە بوو ، لە لایەکی تریشەوە خەلکیان هێنابووە بەردەرگای بارەگاکانمان قسەی ناشرین و جنێودان لەدەورەمان دەسوڕانەوە ئەوەبوو هەرکە گەیشتمە لای پارێزگار ئەو زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکردم ئەوبوو زۆر بێ باك قسەم لە گەل کرد و ئەو ووتی بارودۆخەکە زۆر نالەبارە و من بەگوێ ی سەرۆك جاشەکانم کرد کە گوایە ئێوە پەشێوەی دروست دەکەن بۆیە ئێمە هێزی عەسکەریمان هێنایە ناو

شار ، منیش ووتم هەرشتێك رووبدات تۆ بەرپرسی یەکەمی لەبەر ئەوەی هێزەکەی ئێمە هەمووی چەکدارن ئەوەبوو خالید عەبدول حەلیم داوای یارمەتی کرد کە پێکەوە پلان دابنێین بۆ ئەوەی ئەم دۆخە کۆنترۆل بکەین منیش ووتم ئێمە خەتی تەلەفۆنمان نەماوە بۆ ئەوەی لەگەڵ سەرکردایەتی قسەبکەین چونکە من بریار لە سەرکردایەتی خۆم وەردەگرم ئەویش گووتی باشە هەرچی بە ئێمە بکرێ دەیکەین ، لەو دەمەتەقەی نێوان من پارێزگاربەرێوەبەری پۆلیسیش حوسین شێروانی لەوێ ئامادە بوو گووتی کاك حەمید بەراستی خراپمان بەسەر هاتووە منیش لە وەڵامدا ووتم ئێمە حیزبین لەوەش خراپترمان بەسەرهاتووە لە ناونەچووین ، ئەوەبوو ئەوێم بە جێهێشت کە گەرامەوە تەلەفۆنەکەی ئێمە خەت گەرابۆوە بۆیە منیش یەکسەر پەیوەندیم بە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد کرد و بارو دۆخەکەم بۆ شی کردەوە ئەویش لە وەڵام ووتی : لەگەڵ پارێزگاری نوێ رێك بکەوەو هێزەکەت کۆبکەوەو بیبەوە بۆ بەکرە جۆ ، لەگەڵ پارێزگار رێکەوتین ئەوەبوو (١٥) پانزە لۆری سەربازیمان بۆ ئامادە بکەنن ئەوانیش هێنایان هێزەکەمان بەو لۆریانە بردە شاری کەرکوك تەنیا سێ رۆژ لەوێ ماینەوە لە دوای هێزەکەمان گواستەوەو چووین بۆ بەکرە جۆ . لەسەر کرۆکی رووداوەکانی کوردستان لەم ماوەیەدا بەتایبەتیەش رووداوەکانی ئەو کات لە شاری هەولێر بەتایبەتی دوای ئەوەی مام حەمید کە پارێزگار خالید عەبدول حەلیم دەبینێ دەڵێ :پارێزگار پیاوێکی زۆر ترسنۆك بوو زۆر لەوە دەترسا لە لەنێوان هێزەکانی بارزانی هێزەکانی ئێمە پێك دادان روو بدات ، چونکە بارزانی وا لەگەڵ حکومەت رێك کەوتبوو تاکوو هێزەکانی ئێمە لەشارەکان نەکشێتەوە هێزەکانی ئەوان نایێنە ناو شارەکان پاش ئەوەی من پارێزگارخالیدم بینی لە نیازەکانی ئەو گەیشتم کە دەیوویست بە ناراستەو

خۆ ئێمە چەك بكات ئەوەبوو هەندێ چەكی زیاد هەبوو لە مەشجەب بارەگا منیش ئو چەكانەم تەسلیمی پارێزگار كردەوە لەدوای ئەوەی هێزەكانیشمان گەیشتەوە بەكرە جۆ و چووم بۆ بەغدا موچە بێنم بۆ هێزەكە هەركە گەیشتمە بەغدا لەوێش بێ متمانییەك پەیدابببوو بە فەرماندەی هێزەكان ، ئێمە لەو كاتەدا هێزێكمان لە قەڵادزێ بوو بە سەركردایەتی شێخ عەبدوللای عەسكەری ، ئەوەبوو مەكتەبی سیاسی منیان راسپارد كە مووچە ئەو هێزە ببەم ، ئەوەبوو من پارەكەم برد بۆ هێزەكە و لەوێدا دابەشم كرد ئەوەبوو سێ هەزار دینار لە پارەكە زیاد بوو ئەوەبوو پارەكەم رادەستی مامۆستا حولما كرد . دوای ئەوە گەرامەوە بۆ بەكرە جۆ هەر كە گەرامەوە هێزەكەی ئەوەێ بلأوەی پێكرابوو تەنیا هێزێكی كەم لەوێدا مابۆوە یەكسەر ئەو هێزەمان بە بریاری مەكتەبی سیاسی بۆ كەلار گواستەوە بەلأم لەوێدا واتە لە بەكرە جۆ بەرێزهەڤاڵ مام جەلال ووتارێكی بەبۆنەی جەژنی نەورۆز بۆ خەڵكەكە داو داوای لێكرد كە لەسەر ئەم بارودۆخە ووتەی هەبێ ئەویش باسی دەقی بەیانامەكەی ١١ی ئازاری كردوو گووتی بەیانامەكە باس لە ئۆتۆنۆمی دەكا دیارە ئێمەش هەر دواوای ئۆتۆنۆمی دەكەین لەم كاتەدا وا باشە هێزەكانمان لەگەل باڵی بارزانی یەك بخەینەوە، ئەوەبو هێزەكەی بەكرەجۆ گوێزرایەوە بۆ كەلار بە فەرماندەی مەلا عولاْ پاش ماوەیەكی كەم ئەو هێزەی كەلاریش بلأوەی پێكراو ، ئێمەش گەراینەوە شاری بەغداو هەركەسەمان گەرایەوە سەر كارو وەزیفەی خۆمان.

## مام حەمید
## بۆ ماڵی عەباس ئاغا نووسراوە

**کورتەیەك لەبارەی چاکە و خانەدانی و کوردپەروەریی عەباسی مامەند ئاغای ئاکۆیان**

عەباسی مامەند ئاغا سەرۆکی عەشیرەتی ئاکۆ بوو، سنووری دەسەڵاتەکەی لە ناوچەی قەزای ڕانیە تا دەگاتە حاجی ئۆمەران بوو و عەشیرەتی مەندەمۆرە و بۆڵی و بابۆڵییش سەر بە عەباس ئاغا بوون. عەباس ئاغا لە هەموو ڕوویێکەوە یەکێکە لە ئاغا هەرە ناودارەکانی کوردستان. هەموو ئەو حکومەتە یەك لە دوای یەکانەی کە لە عێراق هاتوونەتە سەر کار، ڕێزی تایبەتیان بۆ عەباس ئاغا هەبووە. ئەو پیاوە ئەوەندە سەربڵند بوو لە هەموو کوردستاندا بەناو و دەنگ دەناسرا و قەتیش چەکی جاشایەتیی دژی میللەتەکەی خۆی هەڵنەگرت. من بۆیە باسی ئەو پیاوە مەزنە دەکەم، چونکە لە چەند قۆناغی جیاجیادا خزمەتی لێقەوماوان و شۆڕش و پێشمەرگە و سەرکردە و پێشمەرگەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی کردووە، جا لەبەر ئەوە من ماوەیەکی زۆر لە ناوچەکە و لەگەڵ بنەماڵەکەیان ژیاوم و شارەزایی باشم هەیە لە سەریان، وام بەباشزانی ئەو زانیاریانە وەکو خۆی بۆ مێژوو باس بکەم، هەرچەندە من وەکو وەفادارییەك لە بیرەوەرینامەکەی خۆمدا باسی ئەو پیاوە سەربەرزەم کردووە، بەڵام ئەم نووسینەم بۆ منداڵەکانی عەباس ئاغایە. جا ئەگەر چاکە لەبەرچاو بێت دەبێ ئەوانەی شارەزای عەباس ئاغا بوون لە بیرەوەرییەکانیاندا عەباس ئاغا لەبیر

نەکەن، لەبەر ئەوەی دیوەخانی عەباس ئاغا لە کاتی تەنگانە و ترسی حکومەتەکانی عێراق جێگای حەوانەوەی بەشی هەرە زۆری سەرکردەکان بوو.

ئێستا دێمە سەر باسی ناسین و کردەوەکانی عەباس ئاغا. سەرەتای ناسین و چاوپێکەوتنم لە ساڵانی ١٩٥٩ تا ١٩٦١ ، من سەرباز بووم لە فەوجی سێی لیوای (٣)، ئەو کاتە چەند سەربازێکی گوندی سەرکەپکان و دۆڵەڕەقە لای من سەرباز بوون، زۆر باسی چاکە و پیاوەتی و دەسەڵاتی عەباس ئاغایان بۆ دەکردم، من ئەو کاتە ئەندامی پارتی بووم. لە سەرەتای ساڵی ١٩٦١ دەنگ و دۆڵ بڵاو بووەوە کە ئاغا ناودارەکانی ناوچەی ڕانیە و کۆیە و ناوچە ی سلێمانی دژی عەبدولکەریم خەریکی کۆکردنەوەی هێزن و بە نیازی ئەوەن شۆڕش بکەن. ئەو ئاغایانەی بە گەرمی باسیان دەکرا لە رووی هێز و دەسەڵات بریتیبوون لە: (١–عەباس مامەند ئاغا ، سەرۆکی عەشیرەتی ئاکۆ" ٢– سمایل سواراغا، سەرۆکی عەشیرەتی بلْباس" ٣– لە ڕوی دەوڵەمەندی و پارەداری باسی شێخ حوسێنی بۆسکین" ٤– کوێخا سمایلی تەلان" ٥– کاکەزیادی کۆیە" ٦– عەزیز ساڵح ئاغای خەرابە" ٧– باسی مینە ئاغای ڕایەتیش دەکرا). ئەو دەنگوباسانە ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر بڵاودەبوونەوە. ئەو قسانە و ئەو دەنگوباسانە و چالاکیی ڕیکخستنەکانی حزب یەکتری دەگرتەوە. کورد لە جۆشوخرۆشدابوو، لەو سەروبەندەشدا بوو کە مەلا مستەفا و عەبدولکەریم لێك توورە بوون و مەلا مستەفا بە توورەییەوە گەڕایەوە ناوچەی بارزان. لە پاش گەڕانەوەی بارزانی، میرانی سەدیق بەگ لە ڕۆژی ١٩٦١/٢/١٨ کوژرا و کوشتنەکەی بە مل کاوانییەکاندا هات و کاوانییەکان چوونە شاخی سەفین و وەکو مەفرەزەیەکی سەرەتایی لە

پاشان هێزەکانی عەشائیری لە ناوچەی ڕانیە و کۆیە و دەربەندیخان و دەربەندی بازیان ڕێگاکانیان گرت و لە حکومەتی عەبدولکەریم عاسیٚ بوون. حکومەت هەوڵی دا لە ڕێگای گفتوگۆوە بڵاوە بە هێزەکانی عەشائیر بکات، بەڵام ئەو گفتوگۆیە سەری نەگرت، جا حکومەت هەوڵیدا لە ڕێگای بەکارهێنانی هێزی عەسکەری بڵاوە بە جووڵانەوەی عەشائیری بکات، ئەوە بوو حکومەت لیوای (٣)ی تەرخان کرد بۆ سەرکوتکردن و بڵاوەپێکردنی جووڵانەوەی عەشائیری بەم شێوەیە: (١- فەوجی یەك بۆ دەربەندیخان" ٢- فەوجی دوو بۆ دەربەندی بازیان" ٣- فەوجی سیٚ کە من لەگەڵ ئەو فەوجەدا بووم بۆ ناوچەی کۆیە و ڕانیە) جا لە بەرەبەیانی ڕۆژی ١٩٦١/٩/١١ هەر سیٚ فەوجەکە بە پاڵپشتی فڕۆکە و تۆپی گەورە چوونە سەر هێزەکانی عەشائیری. هێزی عەشائیری توانای بەرگری نەبوو، لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا ئەو هێزە گەورەیەی عەشیرەتەکان بە یەکجاری بڵاوەیان کرد و چوونەوە ماڵەکانی خۆیان و لە هەمان کاتیشدا چەند ئەندامێکی سەرکردایەتیی حزبیش فەرمانی گرتنیان هەبوو و لەگەڵ هێزەکانی عەشیرەتەکان بوون، وەکو: (١-مام جەلال" ٢- کاك عومەر دەبابە" ٣- کاك عەلی عەبدوڵڵا" ٤- مەلا عەوڵا" ٥- شەمسەدین موفتی). ئەو سەرکردانە هەر یەکەو بنکەیەکی بچوکی چەند کەسیان لە ناوچەکاندا هەبوو، وەکو: بنکەی چەمی ڕێزان هی مام جەلال" بنکەی گوندی پاشقۆتەڵ هی کاك عومەر دەبابە و لە شاخی سەفینیش هێزێك هەبوو بە سەرکردایەتیی مەلا عەوڵا و شەمسەددین موفتی. ئەوە سەرەتای شۆڕسی ئەیلولە و شێوەی سەرهەڵدانەکەیەتی. ئێستا دەگەڕێمەوە سەر باسی عەسکەری و حکومەت، ئەو گروگیفەی هێزی عەشائیری نەما و حکومەت دڵنیا بووتەقە لە

کوردستاندا ئەما و ئێمە فەوجەکەمان لە شاری کۆیە بوو، لە ڕۆژی ١٩٦١/٩/١٥ سریەیەك لە فەوجەکەی ئێمە بە بێ ترس و بێباکانە بە سەرکردایەتیی (عەقید کافی) چووینە ڕانیە، لە ڕانیەش چووینە گوندی بۆسکێن، کاتی توتن ڕنین بوو، پێش ڕۆژئاوابوون لە گوندی بۆسکێن گەڕاینەوە بەرەو ڕانیە، لە نزیك گوندی سەیداوە لە شاخی کێوەڕەش تەقەمان لێکرا، ئێمەش لە لۆرییەکان دابەزین و هەندێك تەقەمان کرد، بەڵام خۆمان ڕانەگرت و لۆرییەکانمان بەجێهێشت و بە پێیان گەڕاینەوە ناو مەرکەزەکەی ڕانیە. لەناو مەرکەزەکەی ڕانیە، ئێمەی ئەندامانی حزب بڕیارماندا ئەگەر بەیانی واتە ڕۆژی ١٩٦١/٩/١٦هێزی عەسکەری هات و لەگەڵ هێزی عەشائیری بووە شەڕ، هەموومان خۆمان و چەکەکانمان بچینە پاڵ هێزەکانی عەشائیری، جا بۆ ڕۆژی ٩/١٦ هێزمان بۆ هات و تا بەرەبەری ڕۆژئاوابوون لە کێوەڕەش شەڕ بوو. من ئەو ڕۆژە بە خۆم و ڕەشاشەکەمەوە چوومە ناو هێزی عەشائیری. ئەو هێزە بە سەرکردایەتیی شێخ حوسێنی بۆسکێن لەگەڵ ئاغاکانی ناوچەی مەرگە و پشدەر بوو. من لە عەسکەری لەو فەوجەی خۆماندا لێپرسراوی حزب بووم و هە ر بە بیروباوەڕی کوردایەتی و پێشمەرگایەتی فێرارم کرد، بەڵام بەداخەوە جەنابی شێخ حوسێن تەماعی لە ڕەشاشەکەم کرد و چەکی کردم، بۆیە من بە شێخ حوسێنم گوت ڕۆژێك دێت بە دەستی خۆم ڕەشاشەکەمت لێ وەردەگرمەوە. من نووسینەکەم لەسەر عەباس ئاغا بوو، بەڵام ماجەرای ئاسینەکەم وای خواست ئەو قسانەش بکەم.

جا لە پاش چەککردنم، شەو بوو لە گوندی بۆسکێن خەریکی نانخواردن بووین، قاسیدێك لەلای عەباس ئاغاوە هات، بە لۆرییێکی عەسکەری لەو لۆریانەی کە ئێمە بەجێمان هێشتبوون، ئەو قاسیدەی لۆرییەکەی دەهاژوا

پێشتر سەرباز بوو لەلای من، لەو جێگایە منی ناسییەوە، ئەوە بۆ من زۆر باشبوو. عەباس ئاغا داوای لە شێخ حوسێن کردبوو بەو لۆریە بێنە سەرکەپکان. جا لە پاش نانخواردن شێخ و چەند چەکدارێك و من سواری لۆریەکە بووین بەرەو گوندی سەرکەپکان بەڕێکەوتین. لە ڕێگا کوڕە شوفێرەکە باسی منی بۆ شێخ حوسێن کردبوو، بەڵام شێخ چەکەکەی هەر نەدامەوە.

ئێستا دەگەڕێمەوە سەر باسەکەی خۆم و عەباس ئاغای ڕەحمەتی. من لەبەرئەوەی ئەوەندە ناوی عەباس ئاغام بە چاکە و کوردپەروەری بیستبوو بە ئاوات بووم عەباس ئاغا ببینم. کە گەیشتینە سەرکەپکان شەو داهاتبوو، دیتم لەشکرێکی زۆر لە سەرکەپکان بوو، هەرچەندە غەمبار بووم، بەڵام کە ئەو لەشکرەم دیت ئەوەندە خۆشحاڵبووم، زۆر ماندوو بووم، لە بن کەپرەکە ڕاکشام، ئەوەندەی نەبرد چەکدارێك هات گوتی کاکی عەسکەر هەستە وا کاك عەباس دێتە لات، من زۆر زۆرم پێخۆش بوو، هەستامەوە و خوالێخۆشبوو عەباس ئاغا هاتە لام، کە چاوم بە عەباس ئاغا کەوت هەموو ئەو باسانەم بەبیر هاتنەوە کە باسیان دەکرد. کاك عەباس گوتی کاکی عەسکەر ماندوو نەبی و بەخێر بێیت، منیش وەڵامم دایەوە. گوتی کاکی عەسکەر چما تەقەت لە لەشکری کورد کردووە؟ گوتم ئاغا من تەقەم لە لەشکری کورد نەکردووە، من ئەندامی حزبم، بۆ کوردایەتی هاتووم. عەباس ئاغا گوتی فڵان باسی تۆی بۆ من کردووە، بەڵام شێخ حوسێن وا ناڵێ. من گوتم شێخ غەدری لە من کردووە و ڕەشاشەکەی لێ سەندووم. گوتی با جارێ وا بێ تۆ بەخێر بێیت. من داوام لە کاك عەباس کرد گوتم ئەگەر چەکداری حزب هەبن من حەز دەکەم بچمە لای ئەوان. جا چەکدارێکی لەگەڵ ناردم و چوومە بنکەی

پاشقۆتەڵ. ئەو بنکەیە سەر بە ئەندامانی ناوچەی ڕانیەوە بوو، ئەو کەسانەی لەو بنکەیە بوون ئەمانە بوون: (١-سەدیقەفەندی" ٢-تۆفیقی مەلا سەدیقی" ٣عەبدولڕەحمان ڕووتە" ٤- میرزا باپیر" ٥- عەزیزی فەقێ سمایلی"٦- ئەمینە کوێر). هەر ئەوەندەم لەبیرە.

هەر ئەو ماوەیەش بووماڵی عەباس ئاغا لە ترسی فڕۆکە گواستیانەوە و چوونە ناو ئەشکەوتی عەلی کاوانی. ئێمە گوتمان هێزی عەشائیری بڵاوەی کردبوو، بەڵام چەند ئاغایەك لە لای عەباس ئاغا مابوونەوە، لە پاشان ئەوانیش بڵاوەیان کرد، هەر ئێمە و عەباس ئاغا لە دۆڵەڕەقە مابووینەوە. لە دەورووبەری ١٩٦١/١١/١٥ ئەو هێزەی سەفین کە ژمارەیان (٢٠٠) کەس دەبوو، لە سەرما و لەبەر بێ بەرگی لە برسان و لەبەر بێ فیشەکی (سەفین)یان چۆڵکردو هاتنە دۆڵەڕەقە. جا لێرەدا چاکە و پیاوەتی و کوردپەروەریی عەباس ئاغا دەردەکەوێت. عەباس ئاغا ئەو (٢٠٠) کەسەی لەسەر گوندەکانی خۆیدا دابەش کرد و (٢٠) کەسیشی لە ماڵی خۆی دانا. خۆ ئەگەر عەباس ئاغا نەبووایە ئەو هێزەی ئێمە لە ناوچەکانی دیکەی کوردستان جێگایان نەدەبووەوە، لەبەر ئەوەی چالاکیی چەکداری لە کوردستاندا نەمابوو، خەڵك باوەڕی بەوەی نەبوو شۆڕش زیندوو دەبێتەوە. جا ئەو ٢٠٠ پێشمەرگەیە لە لای عەباس ئاغا بەخێو کران تا ئەو کاتەی پارەکەی ڕێگای کۆیە گیرا و لە پاشان لە گوندی ڕێزینە، ناوی دەستە و پەل و لق داندرا، کاتیش بەرەو بەهار دەچوو. لە مانگی ٣ی ١٩٦٢ پێشمەرگە دەستی بە چالاکی کرد و عەباس ئاغاش خاوەنی چەکدارێکی زۆر بوو، وەکو عەشیرەت لە هەموو کاتێکدا ئامادە بوو بۆ یارمەتیی پێشمەرگە. عەباس ئاغا ئەوەندە پیاوێکی زانا و سیاسی بوو لەگەڵ هەموو کەسێك دەگونجا. لەگەڵ

عەشیرەتەکانی دەورویەری خۆیدا دۆستایەتی و هاوکارییێکی باشی هەبوو، بە ژن و ژنخوازی لەگەڵ سمایلی سواراغای سەرۆکی عەشیرەتی بڵباس زاوا و خەزوور بوو، لەگەڵ ئەنوەر بەگی بێتواتەی عەشیرەتی خۆشناوان زاوا و خەزوور بوو، لەگەڵ جەلال بەگی میر حەمەدەمینی دەرگەڵە زاوا و خەزوور بوون و لەگەڵ کاك ئەحمەدی دۆڵی خانەقاش زاوا و خەزوور بوون، بۆیە عەباس ئاغا لەلای عەشیرەتەکانی دەورویەریشدا خۆشەویست بوو. لەناو عەشیرەتی خۆشیدا زۆر خۆشەویست بوو، کەس نەبوو سوێند بەسەری کاکەباس نەخوا. لە ڕەمەزانی ١٩٦٢، ئەو هێزەی هەمانبوو کە ژمارەیان (٢٠٠) پێشمەرگە بوو، کراین بە دەوو بەش، بەشێك بۆ لیوای سلێمانی بە سەرکردایەتیی (مام جەلال). بەشەکەی دیکەش بە سەرکردایەتیی کاك (عومەر دەبابە و مەلا عەوڵا) بۆ لیوای هەولێر. من بە بەر ئەو بەشە هێزەی لای سلێمانی کەوتم و لە دۆڵەڕەقە دوور کەوتمەوە. شۆڕش بە خەبات و دەست و قامی ئەو (٢٠٠) پێشمەرگەیە سەری هەڵدایەوە و زیندوو بووەوە. لەساڵی (١٩٦٣) بەشی زۆری ناوچەکان ئازاد کران و شۆڕش لەوپەڕی بەهێزیدا بوو. لە ساڵی (١٩٦٤)دا دووبەرەکی و شەڕی براکوژی دەستیپێکرد، لەبەر شەڕی براکوژی باڵی (م.س) چوینە ئێران و لە ویشە وە بو هەمەدان. لە ساڵی (١٩٦٦) لە ئێران گەڕاینەوە، لە پاش گەڕانەوەماندا دووبارە عەباس ئاغا بووە پشت و پەنای هێزەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی. ئێمە باسی وردەکارییەکانی گەڕانەوەمان ناکەین، هەر ئەوەندەی دەڵێم بارزانی و مەکتەبی سیاسی ئێمە لەگەڵ یەکتر بە فێڵ بوون، بۆیە هێزەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتیش خۆیان هاوێشتەوە بن باڵی عەباس ئاغا. ئەگەر وایان نەکردبا نە سەرکردەکان دەمان و نە هێزەکەش دەما، لەبەر

ئەوەی ئەو کاتە هەم حکومەت و هەم بارزانی لە بارەی شەڕکردن خۆیان لە عەباس ئاغا لادەدا. لە پاش گەڕانەوەمان، بارەگای ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لە دۆڵەڕەقە لە گوندی سپیاو بوون. ئێمەش وەکو پێشمەرگە بە فەرمانی حزب ناومان لە خۆمان نابوو هێزی عەباس ئاغا. ئازوقەمان لە عەباس ئاغا وەردەگرت. ئەو کاتە خەڵکێکی زۆر دەربەدەر ببوون و لە ناوچەی دۆڵەڕەقە بوون و عەباس ئاغا دەی ژیاندن. مانگانەماڵەکان لە ماڵی عەباس ئاغا ئازوقەیان وەردەگرت، یەکێك لەو ماڵانە ماڵی من بوو. عەباس ئاغا هەموو ماڵ و سەروەتی خۆی لە ڕێگای کوردایەتی و پیاوەتی سەرف کرد. هەردەم دیوەخانەکەی پڕ بوو لە مێوان. جا دووبارە لە پاش گەڕانەوەمان، دووبەرە کی سەری هەڵدایەوە و کار گەیشتە ئەوەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی شەو لە گوندی نۆڕێ لەگەڵ عەباس ئاغا لە ماڵێك مێوان بوون، شەو مەفرەزەیەکی چەکداری بارزانی بۆ گرتنی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی هاتبوون، بەڵام عەباس ئاغا ئەوانی ڕزگار کردن و نەیهێشت بکەونە دەستی بارزانییەکان. جا پاش هەڵاتنی ئەوان بەیانی ڕێککەوتنی ٢٩ی حوزەیران دەرچوو. بەداخەوە لەو کاتە ناسکەدا عەباس ئاغا نەخۆش کەوت، ئەو کاتەش دکتۆر لە ناوچەکە نەبوو، هەر فازڵ شوانی هەبوو، ماڵی لە گوندی بەردانگە بوو، ئەویش دکتۆر نەبوو، جارویار سەردانی عەباس ئاغای دەکرد. جا دووبارە باڵی مەکتەبی سیاسی بە هاوکاری حکومەت هێزی ڕێکخست و شەڕی براکوژی دەستپێکردەوە. ئەو هێزەی ئێمە کە لە هەمەدان گەڕابووینەوە چوونەوە پاڵ هێزی باڵی مەکتەبی سیاسی، بەڵام بە فەرمانی مەکتەبی سیاسی من هەر لەلای عەباس ئاغا مامەوە، عەباس ئاغاس ئاگادار بوو. عەباس ئاغا بە دڵ لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسیدا بوو. ئێمە ئەو

(١٠) کەسەمان لەناو گوندی سەرکەپکان بارەگامان هەبوو، خواردنمان لە ماڵی عەباس ئاغاوە دەهات، بەڵام بەداخەوە عەباس ئاغا تووشی نەخۆشیێکی کاریگەر بوو، حکومەتی عێراق فڕۆکەیەکی هەلیکۆپتەری بۆ ناردە گوندی دێریێ بۆ گواستنەوەی عەباس ئاغا بۆ نەخۆشخانەی عەسکەری لە بەغدا. من ئەو قسەیەی عەباس ئاغام لە بیر ناچێت کە لەناو فڕۆکە بوو ئێمەش دەورمان لێدابوو، عەباس ئاغا بە براکانی و کوڕەکانی گوت زۆر ئاگاتان لەو (١٠) پێشمەرگانەی حزب بێت، تا نانەکتان مابێت لەگەڵیاندا بکەنە دوو پارچە، جا کوڕەکانی عەباس ئاغا بە قسەی باوکیان کرد. بایز ئاغا و سوارئاغا لە پاش بەیانی ١١ی ئازار ماڵیان لە بەغدا بوو. با بێینەوە سەر باسی عەباس ئاغا، لە پاش چوونی بۆ بەغدا هەموو عەشیرەتەکە تارماییەکی ڕەش و غەمبار کەوتە سەریان، بەداخەوە لە پاس ١٥ ڕۆژ هەر بە فڕۆکە تەرمەکەیان هێنایەوە. مردنی عەباس ئاغا کارەساتێکی گەورە بوو بۆ هەموو عەشیرەتەکە و بۆ ئێمەش. جا لە پاش مردنی عەباس ئاغا، مەلا مستەفا لێژنەیەکی پێکهێنا بۆ پاراستنی سەروەت و سامانی ماڵی عەباس ئاغا. ئەو لیژنەیە پێك هاتبوون لە: (مەلا ئەسعەد و مەلا عوسمانی پڵنگان و کاك محمەمەد)، دوای سەرژمێریکردنی سەروەتی عەباس ئاغا دەرچوو عەباس ئاغا خاوەنی (٣٠٠٠) سێ هەزار دینار بوو. لەبەر ئەوەی عەباس ئاغا خاوەنی پارە و پوول نەبوو، هەموو سەروەت و داهاتەکەی لە ڕێگای پیاوەتی و یارمەتی سەرف دەکرد. لە پاش مردنی عەباس ئاغا، بایز ئاغا لە جێگای باوکی بووە ئاغا، ئێمەش وەکو خۆی هەر لە گوندی سەرکەپکان بووین. هێزەکانی بارزانی هەوڵیان دەدا لێمان بدەن، لێشیان داین، مەلا موسایان بریندار کرد، لە پاش بریندارکردنی مەلا موسا خۆمان داوامان لە

بایز ئاغا کرد کە بڕیاردرا بچینەوە ناو هێزەکانی خۆمان و سواراغا بە سەیارەی خۆیان ئێمەیان گواستەوە بۆ ڕانیە. خوالێخۆشبوو عەباس ئاغا لە ساڵی ١٩٢٣ لە کوردستانی ڕۆژهەڵات لە ناوچەی سندوس لە گوندی گۆناوە لە دایك بووە، بەداخەوە ئەو پیاوە مەزن و ناودارە لە کاتێکی ناسك لە ڕۆژی ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٦٦ لە نەخۆشخانەی ڕەشیدی عەسکەری لە بەغدا کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی پاشقۆتەڵ بە خاك سپێردرا.

مردنی عەباس ئاغا خەسارەتێکی گەورە بوو بەتایبەتی بۆ عەشیرەتەکەی، لەناو عەشیرەت لە هەموو ماڵێکدا شین و گریان بوو، پرسەکەشی لە گوندی سەرکەپکان بوو. هەزاران ڕەحمەت لە گۆڕەکەی.

ناوی ئەو پێشمەرگە دێرینانەی هەولێر لە ساڵی (١٩٦٤) چوونە هەمەدان:

١-حەمید حوسێن (حەمید ڕەشاش)

٢-عەریف سلێمان

٣-مەلا حەسەن بندیان

٤-عوسمان بندیان

٥-وەستا ڕەحمان هەریری

٦-ئەنوەر جۆخین

٧-سەعید مەسیفی

٨-عەریف حەسەن توتمەیی

٩-د. حەسەن ئیسماعیل

١٠-د. حوسێن ئیسماعیل

١١-ئەحمەد پایسکلچی

١٢-عەلی حاجی قادر

١٣-کەمال خدر نەجار

١٤-بەهرام سادق

١٥-مستەفا ڕابەر

١٦-جەعفەر عەبدولواحید

١٧-خالید دلێر

١٨-موحسین سلێمان

١٩-حەمید سووری

٢٠-ئیبراهیم سووری

٢١-عەبدولڕەقیب یوسف

٢٢-سیامەند محەمەد

٢٣-عەبدوللا مامە

٢٤-ئەحمەد شەنەغە

٢٥-مام شەوکەت (دای شەوکەت)

٢٦-کاکەڕەش گرزانی (شەهید بوو)

٢٧-قادر خەبات

٢٨-کەریم عەلی ناسراو بە کەریم هەنووکە

٢٩-مەجید کوردە

٣٠-عەریف حەوێز کوردە

٣١-غازی عەلی

٣٢-سەعید یەحیا

٣٣-خالید ئاشگەیی

٣٤-جەوهەر محەمەد حەمەد

٣٥-محەمەد تەها خۆشناو

٣٦-ئەنوەر حەمید محەمەد

٣٧-حەمەدەمی مەلا خەلیل

٣٨-ئیسماعیل سەرهەنگ

٣٩-سلێمان (برازای عەمەر دەبابە)

٤٠-عەبدوڵلا کوێخا قادر

٤١-سەید ئیبراهیم شێتە

٤٢-عەبدولخالق مەعروف

٤٣-مەلا مووسا حامد داشور

٤٤-ئەکرەم محەمەد

٤٥-سەید مستەفا گۆمەشینی

٤٦-قادر توتمێ

٤٧-زاهیر قەساب

٤٨-جەمیل شێخۆ

٤٩-مستۆ عەلی

٥٠-عەلۆ حوسێن

٥١-شێخ محەمەد

٥٢-بەکر خۆشناو

٥٣-خالید عەزیز تەرجانی.

## بەشی دووەمی قسە خۆشەکانی
## دەروێش قادر ناسراو بە قالە دیگەڵ

لەناو دانیشتووانی گوندەکانی ١٢ دێی دۆڵێ باسیان دەکرد دەیانگوت دەروێشەکانی شێخ محەمەدی کاپیلۆن هەر یەکەو بە شتێك تووڕە دەبوون، جا هەندێکیان جوێنیان دەدا، هەندێك بە جۆرە قسەیەك پاشەوپاش دەکشانەوە، وەك دەروێش ساڵەڕەش، هەندێکیان بە ناوی تەماتە تووڕە دەبوون، یان بە ناوی باینجان و شتی دیکەش. شێخ محەمەدی کاپیلۆن شێخێکی دیار و ناوداری ناوچەکە بوو، زۆر خۆشەویست بوو. ئێمە باسەکەمان لەسەر نوکتەکانی دەروێش قادرە، لە بەشی دووەمدا باسی چەند نوکتەیەکی تازە دەکەم. لە بەشی یەکەمدا گوتمان دەروێش قادر بە چوار شت، یان با بڵێین ناوی چوار شت تووڕە دەبوو، جوێنی بە هەر کەسێك دەدا ناوی ئەو چوار شتەی هێنابایە، بەڵام لە کاتی شۆڕشی ئەیلول ناوی شتی دیکەش زیاد ببوون. ئەو ناوانەی دەروێش قادر پێیان تووڕە دەبوو ئەمانە بوون: ١–ناوی گوندی دێگەڵ" ٢–ناوی گوندی بانەلە" ٣–وشەی کێشامەوە" ٤–میاوەی پشیلە" ٥–عومەر دەبابە عەرەبی نازانێت" ٦–مام جەلال کەچەڵە، ئەمانەی خوارەوەش نوکتەی بەشی دووەمن:

١–ڕۆژێك ئەسعەد و ڕەئووف دەچنە سەردانی دەروێش قادر، ئەو دوو کوڕە زۆر گەمە و گاڵتەیان لەگەڵ دەروێش قادردا دەکرد. ئەو ڕۆژە کە دەچنە ماڵی دەروێش قادر زۆری تووڕە دەکەن. دەروێش قادر لە تووڕەییان

حاڵ دەگریٚ و زەرگەکەی دەردەهێنێت و زەرگەیەك لە گووپی خۆی دەدات، دەرگایماڵەوەش لەسەر ئەسعەد و ڕەئووف قەپات دەکات. ئەسعەد و ڕەئووف زۆر دەترسن، بە دەروێش قادر دەڵێن تۆبە جارێکی دیکە واناکەین، دەروێش بە خۆی  وبە زەرگەکەیەوە دێت و دەچێت و دەڵیٚ تۆبەی چی من ئەمڕۆ دایکی هەردووکتان دەگێم. ئەسعەد لە ترسان خۆی لە پەنا لانکەکە نابوو، ڕەئووفیش لە ترسان سەری بردبووە ناو کولانگەی خانووەکە هەوڵی دەدا هەڵبێت، بەڵام بە کولانکەکەوە نەدەچوو. منیش بە ڕێکەوت چوومە گوندو چوومە ماڵی دەروێش قادر، لە دەرگام دا خێزانەکەی دەروێش دەرگای کردەوە و گوتی بە خوای چاکبوو هاتی، وەرە بگە پێیان. دەرگامان کردەوە، ئەسعەد لە پەنا لانکەکە دەپاڕایەوە، ڕەئووفیش هاواری دەکرد دەروێش تۆبە. دەروێش قادر کە منی بینی بە زەرگەوە بۆ لای من هات، گوتی کاك حەمید من ئەمڕۆ دایکی ئەسە و رەفەت بۆ دەگێم. منیش دەروێشم گرت، ئەسعەد و ڕەئووف لە ترسان ئارەقەیان کردبوو. دەروێش زەرگەکەی لە گووپی خۆی دەرهێنا. هێور بوونەوە.

٢- جارێك مامۆستا ئیبراهیم سەفەری کرد، لە گەڕانەوەی مسەجەلێکی بچوکی لەگەڵ خۆی هێنابوو. دەروێش قادر قەت مسەجەلی نەدیبوو. ڕۆژێك ئەسعەد چووە لای دەروێش قادر، دوو بە دوو زۆر قسە دەکەن، دەروێش قادر باسی بەسەرهاتێکی خۆی دەگێڕێتەوە، بە ئەسعەد دەڵیٚ ئەوە بۆ کەسی نەگێڕیەوە. ئەسعەد دواتر باسەکەی بۆ من گێڕایەوە، باسەکە ئەوەندە خۆش بوو بە ئەسعەدم گوت برۆ بانگی دەروێش قادر بکە. ئەسعەد چوو دەرویش قادری هێنا، هەر من و دەروێس و ئەسعەد بووین، لە بنەبانی ئەشکەوت دانیشتین، بنەبانی ئەشکەوتەکە کەمێك تاریك بوو، منیش

مسەجەلەکەی مامۆستام هێنا شاردمەوە، دەستمان بە قسان کرد و من مسەجەلەکەم کردەوە، دەروێش قادرمان ناچار کرد باسەکەی خۆی بگێڕێتەوە، منیش هەموو قسەکانیم تەسجیل کرد کە هاتینە دەرێ مامۆستا ئیبراهیم لەگەڵ خدر لەناو دەرگا بوون. لە پاشان هەموومان دانیشتین، خدر ڕادیۆیەکی هەبوو، منیش بە خدرم گوت ئەو ڕادیۆیەم بدێ بزانم دەنگوباس چییە، لە جیاتی ڕادیۆیەکە بکەمەوە مسەجەلەکەم کردەوە، کە مسەجەلکە قسەی کرد مامۆستا ئیبراهیم بە دەروێش قادری گوت دەروێش ئەمە دەنگی تۆیە، دەروێش قادر ڕووی کردە خدر و گوتی خلە دایکت بگێم من لە بنەبانی ئەشکەوتەکە قسەم کرد کوێڕا ئەم ڕادیۆیەی تۆ ناردیە بەغدا و قسەکەی من لێدەدەنەوە.

٣- ڕۆژێك براکانی دەروێش قادر هاتنە بنکە شکاتیان لە دەروێش قادر کرد و گوتیان دەروێش قادر هەندێك بنەداری مولکی ئێمەی بۆ خۆی لاداوە. دارەکان داربەڕوو بوون، ساڵانە بۆ ماڵات گەڵای دارەکانیان دەبڕینەوەو چرۆکەیان دادەنا بۆ زستان بەو چرۆیەیان دەگوت جێگەڵ، جێگەڵ زۆر لە دێگەڵ نزیکە. منیش لەگەڵ دەروێش قادر و براکانی چووینە شوێنەکە و کەسمان لە ترسیی جوێندانی دەروێش قادر نەماندەوێرا بڵێین ئەم دارانە جێگەڵی کامتانە، بە دەروێس قادرم گوت دەروێش من دەتوانم بڵێم ئەم دارانە جێی گەڵی کێن؟ گوتی بەڵێ، ئەوجا بە سەربەستی قسەمان کرد.

٤- جارێك مام جەلال لە بنکە بوو، خوالێخۆشبوو مەلا ناسیح هاتە لامان. مەلا ناسیح دەروێش قادری نەدەناسی، مام جەلال بە مەلا ناسیحی گوت مەلا ئەو ناحیەیەی لە نێوان هەولێر و کۆیە ناوی چییە؟ مەلا گوتی دێگەڵە. دەروێش قادر بە مەلا ناسیحی گوت دایکت بگێم، مەلا گوتی ئەوە چییە ! !

٥- جارێك من و عەلی مام ڕەزا چووینە ماڵی دەروێش قادر، لە پاش چاخواردنەوە داوامان لە خێزانەکەی دەروێش قادر کرد بە دەروێش قادر بڵێ دێگەڵ، خێزانەکەی ئەوەندە ژنێکی باش و خانەدان بوو گوتی ئاخر جنێو بە منیش دەدات، ئێمە وامان دەزانی جنێو بە خێزانەکەی نادا، بەڵام لەبەر خاتری ئێمە ژنەکەی بە دەروێش قادری گوت دەروێس بانەلە، دەروێش قادر جنێوی بە خێزانەکەی خۆشی دا.

هیوادارم ئەم بابەتەش جێی ڕەزامەندی خوێنەران بێت.

***

## ( حەمید حوسێن تەها ) ناسراو بە ( حەمید ڕەشاش )
## خۆی سەربردەی ژیانی خۆی دەگێڕێتەوە

من ناوم حەمید حوسێن تەها مەولوودە، ناسراوم بە حەمید ڕەشاش، بە عەشیرەت خۆشناوم، خەڵکی گوندی بالیسانم، لە بەرەبابی میروسووم، دایکم ناوی (سەید ڕەحمە)یە، لە کاتی خۆی لە گوندی بالیسان باپیرم لە ناوبژیکردنی شەڕێکی گەورەدا کوژراوە و چوار کوڕی لەپاش بەجێ ماون بە ناوەکانی (حەسەن، حوسێن، فەقێ و ئەحمەد). کوڕەکانی بە نیازی تۆڵەسەندنەوە، لەگەڵ دایکیان لە گوندی بالیسان بار دەکەن و دەچنە وراتی کویە. جا نازانم لە دوای بارکردنیان لە گوندی بالیسان تۆڵەی باوکیان دەکەنەوە یان نا. کوڕەکان لە وراتی کۆیە بۆ کاسبی بڵاوەی دەکەن، باوکم دەچێتە گوندی قەیباشی خوار شارۆچکەی پردێ و لەوێندەریش ژن دەهێنێت و بە قسەی دایکم و باوکم من لە ساڵی (١٩٣١) لە گوندی قەیباش لەدایك بووم. پاشان باوکم لە گوندی قەیباش بار دەکات و دەچێتە گوندی قەرەبەگ، ئەو گوندە لە سەرەوەی پردێیە. من لە گوندی قەرەبەگ دونیام بە بیر دێت. تەنیا هەر یەك برا و یەك خوشکم هەبوو. هەر لە گوندی قەرەبەگ براکەم بووە سەرباز، بەڵام هەر چوار مانگ سەربازی کرد و لە سەربازی فیراری کرد، جا لەبەر فیرارکردنی براکەم لە گوندی قەرەبەگ بارمان کرد و چووینە گوندی قوچە بلباس. ئەو کاتە من تەمەنم شەش ساڵ بوو دایکم نەخۆش کەوت و کۆچی دوایی کرد، لە پاش مردنی دایکم

خوشکەکەشم بۆ براکەم بە ژن بە ژنە درا و من و باوکم بێ کابانماینەوە، براژنەکەم لەگەڵمان ئیدارەی نەکرد و من و باوکم بە هۆی بێ کابانییەوە تووشی ناخۆشی و دەردەسەری بووین. ئەو کاتەش کاتی فەقیری و هەژاری بوو، باری ژیانمان زۆر ناخۆش بوو. من لە تەمەنی (٩) ساڵیدا بووم کە باوکیشم کۆچی دوایی کرد. ئەو قسانەی باوکمم قەت لەبیر ناچن کە بە منی دەگوت لە پاش من تۆ تووشی دەردەسەری و دەربەدەری دەبیت و دەکەویە ژێر چەپەڵۆك. قسە کە شی ڕیك وابوو. ئەوە بوو لە پاش مردنی باوکم بە ناچاری چوومە لای براکەم و بەردەستی براژنە غەدارەکەم. براکەم لە تەمەنی دە ساڵیدا منی کردە شوان. لە گوندی عەلیاوە. جا لە تەمەنی دە ساڵیمدا دەربەدەر بووم. لەو ماوە دووروودرێژەی کە دەربەدەر بووم، زۆر لە ناوچەکانی کوردستان گەڕام بۆ شوانی و ڕەنجبەری و کاسبی بۆ بژێوی ژیان و مانەوەی خۆم. جاری واش هەبووە ساڵەکەی نەهات بووە، بە نان و زگ ڕەنجبەریم کردووە. من لە ژیانی دەربەدەریمدا هەموو جۆرە کاسبیە کم کردووە. جاروباریش دەهاتمەوە ناو شار بۆ کاسبی، لەناو شاریشدا سەربەرزانە هەموو جۆرە کاسبیە کم دەکرد. بەم شێوەیە لەگەڵ دەربەدەری و چەرمەسەری و هەژاریدا بەردەوامبووم تا ساڵی (١٩٥٣)، لە کاتی هەرای جووتیار و ئاغاکانی دەشتی هەولێر لە گوندی (شەعەل) سەپان بووم، حکومەت کوڕە فەلاحەکانی گوندی شەعەلی گرت و منیش لەگەڵ کوڕە فەلاحەکان گیرام و بوومە سەرباز، لە کۆڵ ڕەنجبەری بوومەوە، ئەوەم زۆر لا خۆشبوو. لە ساڵی (١٩٥٥) ماوەی سەربازی ئیجباریم تەواو کرد و بە قسەی براکەم لە عەسکەری دەرچووم و هاتمەوە هەولێر، بەڵام ساڵی ١٩٥٥ ساڵیکی ئەوەندە وشکەساڵی و نەهات بوو، کاسبی نەبوو، ئیش وکار نەبوو،

بەناچاری دووبارە بوومەوە سەربازی (متەوەع) واتە سەربازی بە پارە، مووچەکەم (٥) دینار بوو، لە مووسڵ لە لیوای (٥)ی مووسڵ بووم. ساڵی ١٩٥٦ هەستی کوردایەتی سواری سەرم بوو، لە ڕێگای هەڤاڵێکمەوە بە ناوی نائیب عەریف یاسین جوامێر چوومە ناو ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان. لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٧ ژنم هێنا و بوومە خاوەن ژن و ماڵ و پلەکەشم نائیب عەریف بوو. لە ساڵی ١٩٥٩ کەمێك پێش جووڵانەوەی شەواف من لەسەر داوای خۆم گوازرامەوە بۆ هەولێر بۆ فەوجی (٣)ی لیوای سێ. لە ساڵی ١٩٦٠ بوومە لێپرسراوی حزب لە فەوجەکەی خۆمان، لە ڕۆژی ١١ی ٩ی ١٩٦١ فەوجەکەی ئێمە چووە شاری کۆیە بۆ سەرکوتکردنی جووڵانەوەی عەشائیری. ڕۆژی ١٤ی ٩ی ١٩٦١ دوو سریە عەسکەر چووینە شاری ڕانیە، لە شاری ڕانیە لە بناری کێوەڕەش ڕۆژی ١٦ی ٩ی ١٩٦١ لەگەڵ لەشکری شێخ حوسێنی بۆسکینی تووشی شەڕ بووین. من خۆم و ڕەشاشەکەم چوومە ناو ریزی پێشمەرگەی کوردستان. لە ماوەی دەربەدەری و لە ماوەی عەسکەری و لە ماوەی پێشمەرگایەتیدا سەرانسەری کوردستان گەڕام، لەبەر ئەو هەموو گەڕان و سووڕان و دەربەدەری و هەژاری و بێکەسییە نەمتوانی نە لە مەکتەب نە لە حوجرەی فەقێیان بخوێنم، هەر خۆم بە هەوڵ و کۆششی خۆم فێری ئەم خوێندەوارییە خۆڕسکە کردووە. ڕۆژانی خۆشیم نەبووە هەر ناخۆشی بووە، هەندێکجار لەناو خۆشیش ناخۆشی هەیە و لەناو ناخۆشیش خۆشی هەیە، جا من لەناو ئەو هەموو خۆشی و ناخۆشی و دەربەدەریانەدا سوودێکی زۆرم وەرگرتووە، هەندێك کەس بە دەربەدەری کز و کۆر و زەینکۆر دەبن، بەڵام من خوا و ڕاستان ئەوەندە زەینم ڕوونە هەر لە ڕۆژی دنیام وەبیردادێت و تا ئێستا هەموو قسە

و باس و خواس و کەلەپووری کوردەواری و دابونەریتی کوردەواریم لە بیر ماوە. لەبەر ئەوەی هەموو کردەوەکانی خۆمن، بۆیە ئێستا وا بە سەربەستی و بێباکانە باسی کەلتوور و کەلەپووری کوردەواری دەکەم و دەیاننووسم و بڵاویان دەکەمەوە، هیوادارم ئەم هەوڵدانەم بۆ خزمەتی گەلەکەم هەژمار بکرێت.

با بگەڕێمەوە سەر باسی سەر و سەربردەکەم. من پێشتر باسی ئەوە کرد و گوتم ١٩٦١/٩/١٦ یەکەم سەرباز بووم لە لیوای هەولێر خۆم و ڕەشاشەکەم چوومە ناو ریزی پێشمەرگەی کوردستان، ئەم نازناوەی حەمید ڕەشاشیش لە مانگی ١١ی ١٩٦١ لە گوندی شیوەشان بەڕێز مام جەلال بۆ منی دانا، لەبەر ئەوەی لەناو هێزی پێشمەرگە هەر تەنیا ئەو ڕەشاشەمان هەبوو.

لێرەدا پێویستە هەندێك باسی قۆناغەکانی پێشمەرگایەتیش بکەین. من لە ماوەی پێشمەرگایەتیدا لە سەرەتای ١٩٦٢دا بوومە یاریدەدەری سەرپەل، سەرپەلەکەم خوالێخۆشبوو حەمید کاوانی بوو. لە مانگی ٣ی ١٩٦٢ لەسەر داوای بەڕێز مام جەلال گوازرامەوە بۆ چەمی ڕێزان، لەگەڵ مام جەلال بەشداریی هەموو شەڕەکان و ڕزگارکردنی ناوچەکانی شارباژێر و ناوچەی شلێر و ناوچەی ماوەت و سوورداش و قەشقۆڵی و زۆر جێگای دیکەم کردووە. لە مانگی ٦ی ١٩٦٢ بە فەرمانی مام جەلال بوومە سەرۆکی پاسەوانی مەکتەبی سیاسی، هەر لە ١٩٦٢ بە فەرمانی مەکتەبی سیاسی بوومە لێپرسراوی بارەگای مەکتەبی سیاسییش لە ئەشکەوتەکەی گوندی مالوومە لە دۆڵی جافایەتی. ساڵی ١٩٦٣ لەسەر داوای خۆم گوازرامەوە بۆ حاجی قەڵا و بوومە سەرپەل. لە زستانی ١٩٦٣ دووبارە لەسەر فەرمانی مەکتەبی سیاسی گوازرامەوە بۆ بارەگای مەکتەبی سیاسی و بوومە

لێپرسراوی ئیداره‌ی ئه‌كادیمی شۆڕش له‌ هه‌مان كاتیش مامۆستای مه‌شق بووم.

له‌ ساڵی ١٩٦٤ له‌به‌ر شه‌ڕی براكوژی له‌گه‌ڵ باڵی مه‌كته‌بی سیاسی چووینه‌ هه‌مه‌دان. له‌ مانگی ٧ی ١٩٦٤ بۆ ماوه‌ی ساڵێك له‌ هه‌مه‌ دان بووین. ساڵی ١٩٦٦ له‌ هه‌مه‌دان گه‌ڕاینه‌وه‌، به‌پێی ڕێككه‌وتن له‌گه‌ڵ بارزانی. ساڵی ١٩٦٧ له‌نێوان هێزه‌كانی بارزانی و باڵی مه‌كته‌بی سیاسیدا بووه‌ شه‌ڕی براكوژی. من به‌ فه‌رمانی مه‌كته‌بی سیاسی له‌گه‌ڵ ٨ پێشمه‌رگه‌ بۆ كاری حزبی له‌ دۆڵه‌ ڕه‌قه‌ لای عه‌باس مامه‌ند ئاغا ماینه‌وه‌. له‌ ساڵی ١٩٦٨ به‌ فه‌رمانی مام جه‌لال چووینه‌ به‌كره‌جۆ، بوومه‌ لێپرسراوی ئیداره‌ له‌ به‌شی ته‌قه‌مه‌ نی له‌ هێزی ڕزگاری. له‌ ١٩٦٩ به‌ فه‌رمانی مه‌كته‌بی سیاسی بوومه‌ فه‌رمانده‌ی هێزی هه‌ولێر، پاش به‌یانی ١١ی ئادار هێزه‌كانی باڵی مه‌كته‌بی سیاسی بڵاوه‌یان پێكرا و به‌ پێی ڕێككه‌وتن باڵی مه‌كته‌بی سیاسی و پارتی تێكه‌ڵ بوونه‌وه‌. له‌ ساڵی ١٩٧٧ من چوومه‌ ناو ریزه‌كانی یه‌كێتی. له‌ ئازادكردنی شاری هه‌ولێر به‌شدار بووم، له‌ پاش ئازادكردنی هه‌ولێر من فه‌رمانده‌ی كه‌رتی ٣٦ بووم له‌ هێزه‌كانی بروسك له‌ هه‌ولێر. له‌ ساڵی ٢٠٠٤ بوومه‌ كارگێڕ له‌ ناوه‌ندی كۆمه‌ڵایه‌تیی هه‌ولێر، وه‌ك لێپرسراوی به‌شی ئیداره‌ تا ئێستاش به‌رده‌وامم، وا ته‌مه‌نم گه‌یشته‌ ٨٧ ساڵ و به‌رده‌وامم له‌ كاره‌كه‌م. من له‌ پاش كاری پێشمه‌رگایه‌تیمدا به‌ هاندانی برای زۆر به‌ڕێزم مامۆستای مێژوونووس عه‌بدولڕه‌قیب یوسف ده‌ستم كرد به‌ نووسین، زۆر سوپاسی ده‌كه‌م. ئه‌وه‌ی ڕاستی بێ من خۆشم له‌باره‌ی كه‌لتوور و كه‌له‌پوور و دابونه‌ریتی كورده‌واری شتێكم له‌باراندا هه‌بوو، هه‌رچه‌نده‌ خوێنده‌وارییه‌كه‌م خۆڕسكه‌، به‌ڵام ئه‌م به‌رهه‌مانه‌شم چاپ كردوون و به‌رده‌وامم له‌ نووسین:

١-کتێبی پەندی کوردەواری، ئەکادیمیای کوردی لە ٢٠١٠ چاپی کرد"

٢-کتێبی ژیانی کوردەواری ئەکادیمیای کوردی لە ٢٠١١ چاپی کرد"

٣-کتێبی هەوارگەی وشە و کەلەپووری کوردی، بەڕێز ئەرسەلان بایز لە ٢٠١٢ چاپی کرد"

٤-بەشی دووەمی ژیانی کوردەواری ئەکادیمیای کوردی لە ٢٠١٧دا چاپی کرد"

٥-ئێستا فەرهەنگی کەلەپوور تەواو بووە و لەژێر تایپ و بژارکردندایە"

٦-بیرەوەریی ژیانی خۆم نووسیوەتەوە، تا ئێستا چاپ نەکراوە"

٧-چەندین وتارم لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا نووسیون و بڵاوکراونەتەوە، وەك:

ڕۆژنامەی بەدرخان، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ڕۆژنامەی هەولێر، گۆڤاری سلێمانی، گوڤاری کەکۆن، گۆڤاری پێشمەرگە، گۆڤاری کەلتووری کوردی و چەندین گۆڤاری دیکە و هەروەها چەندین چاوپێکەوتنم هەیە لە بەشی هەرە زۆری کەناڵەکانی تەلەفزیۆنی هەرێمدا، هیوادارم ئەمانەی سەرەوەم بۆ بە خزمەت بنووسرێ، لەبەر ئەوەی هەمووی خۆبەخشانەیە.

****

شووره گەورەکەی پێشمەرگە دێرینەکان ناوە ناوە کەلێنێکی تێدەکەوێت

کۆچی دوایی خاڵە شێخ جەنگی بۆ ئێمەی پێشمەرگە دێرینەکان، گرانە و کەلێنەکەشی بە ئاسانی پڕ نابێتەوە. خاڵە شێخ جەنگی جگە لەوەی برا گەورەی بەڕێز مام جەلال بوو، بەڵام خۆشی پیاوێکی هەڵکەوتوو و سەربڵند و چاوتێر و کەسایەتییێکی ناسراو بوو، بەتایبەتی لە ناوچەی کۆیە. خاڵە شێخ جەنگی پیاوی مەسلەت و ئاشتەوایی کۆمەڵایەتی بوو، پیاوێکی لێوەشاوە و

خاوەنی دەست و تفەنگی خۆی بوو، خاڵە شێخ جەنگی هەموو مەرجەکانی پیاوەتی تێدا بوو و پێشمەرگەیەکی دێرین و کوردپەروەر بوو. من لە ساڵی ١٩٦٢ بەهۆی بەڕێز مام جەلالەوە خاڵە شێخ جەنگیم ناسی. ئەو کاتە پێشمەرگە بووم لە هێزەکەی بەڕێز مام جەلال. لە مانگی ٥ی ١٩٦٢ هێزەکەمان قەزای پێنجوێنی گرت، قاسەکەی حکومەت ١١ هەزار دیناری تێدابوو، پارەکەشمان هێنا، بەڵام پارەکە نیوەی دڕاو بێکەڵك بوو. جا لە پاش ئازادکردنی قەزای پێنجوێن هێزەکەمان گەڕایەوە بۆ چەمی ڕێزان. ڕۆژێك من و بەڕیز مام جەلال و چەند پێشمەرگەیەك پارە دڕاوەکانمان لەگەڵ خۆمان برد و چووینە گوندی قزلوو. لەوێ چووینە ماڵی خاڵە شێخ جەنگی، ئەو کاتە شێخ جەنگی برا گەورەی گوندەکە بوو. ئەوە سەرەتای ناسینم بوو لەگەڵ خاڵە شێخ جەنگی. ڕاستییەکەی پێشتر ئێمە نەماندەزانی خاڵە شێخ جەنگی برا گەورەی مام جەلالە. ئێمە ماوەی دوو شەو و دوو ڕۆژ لای خاڵە شێخ ماینەوە و میوانداری باشی کردین. ئەو کاتە شێخ جەنگی هەرەتی لاوی بوو، گەنجێکی پاك و قسەخۆش بوو. پارە دڕاوەکانمان بە ژمارە دایە شێخ جەنگی و ئێمە ڕۆیشتین. دوای ڕۆیشتنی ئێمە خاڵە شێخ جەنگی پارە دڕاوەکانی ئێمەی بردە بەغدا، بە هەزار زەحمەتی هەموو پارە دڕاوەکانی بە پارەی ساغ گۆڕیبووەوە و پارە ساغەکانی بۆمان هێنایەوە چەمی ڕێزان و هەر بە ژمارە پارەکەمان لە خاڵە شێخ جەنگی وەرگرتەوە. ئەوە چاکە و پیاوەتی و کوردپەروەریی خاڵە شێخ جەنگی بوو بەر لەوەی ببێتە پێشمەرگە. ئەم باسە نە خزمانی خۆی، نە خەڵکی نەیزانی بەس بەڕێز مام جەلال دەیزانی. لە ساڵی ١٩٦٣ لە کاتی هێرشە گەورەکەی (حەرەس قەومی) بۆ سەر ناوچەی کۆیە، ئەو کاتە من لە حاجی قەڵا بووم، زۆر باش لە

یادمە و دەزانم خاڵە شێخ جەنگی خۆبەخشانە و مەردانە لە دۆست و برادەر و خزمانی خۆی زیاتر لە ٣٠ چەکداری کۆکردەوە و بەرگری لە گوندەکانی ناوچەی کۆیە کرد و بەشداریی شەڕەکان بوو. لە ساڵی ١٩٦٤ لەبەر ناکۆکیی باڵی مەکتەبی سیاسی و بارزانی و شەڕی براکوژی، شێخ جەنگی گوندی قزلووی بەجێهێشت و هاتە شاری کۆیە، ئەوە بوو هێزەکەی باڵی مەکتەبی سیاسی چوونە هەمەدان و لە ساڵی ١٩٦٦ باڵی مەکتەبی سیاسی گەڕاینەوە، بەپێی ڕێککەوتن، بەڵام ئەو ڕێککەوتنە سەری نەگرت و باڵەکەی م.س پەیوەندیان بە حکومەتی عێراقەوە کرد و دووبارە شەڕی براکوژی دەستی پێکردەوە و خاڵە شێخ جەنگی هاتەوە ناو ریزەکانی پێشمەرگە و ماڵەکەشی لەگەڵ ماڵی شێخ شوکروڵڵا و شێخ شەرەف و شێخ حەمەسالح بردە بەکرەجۆ. لە ساڵی ١٩٦٨ منیش ماڵەکەم لە بەکرەجۆ بوو و دراوسێی ماڵی خاڵە شێخ جەنگی بووم. من بۆ مێژوو دەڵێم ئەو ماوەیەی ئێمە ماڵمان لە بەکرەجۆ بوو ڕۆژێك لە ڕۆژان هەستمان بەوە نەکرد بەڕێز مام جەلال فەرق و جیاوازی لە نێوان ماڵە پێشمەرگەیەك و ماڵە خزمانی خۆی بکات، هەرگیز ئەوە لە خەیاڵی (مام جەلال)دا نەبووە، من وام هەستدەکرد یەکێکم لە خزمەکانی زیاتر لە مام جەلالەوە نزیکترم. بۆ نموونە ئەم باسە دەکەم ئەو کات من لێپرسراوی ئیدارە بووم لە بەشی تەقەمەنی هێزەکە، ئەو کاتە خاڵە شێخ جەنگی جگە لە چەکەکەی خۆی چەکێکی زیادەی لابوو، مام جەلال بە منی گوت برۆ ئەو چەکە زیادەی لە شێخ جەنگی وەربگرەوە، منیش چووم چەکە زیادەکەم لە شێخ جەنگی وەرگرتەوە بە بێ ئەوەی دڵگران بێت. من و شێخ جەنگی زۆر برادەر بووین، زۆر جاریش لە شەڕەکان سەنگەرمان لە تەنیشت یەك بووە. ڕۆژێك لە ڕۆژان لە کاتی شەڕکردندا خاڵە شێخ جەنگیم

بە ڕووگرژی نەدیت. ئەو سەرکردەیەکی زۆر ئازا و بەجەرگ بوو، بەڕاستی پیاوی ناو پیاوان بوو، لەگەڵ چینی هەژاران بوو و پیاوی ڕۆژی تەنگانە بوو. دووبارەی دەکەمەوە کە ئێمەی پێشمەرگە دێرینەکان وا ڕەچاو دەکەین کە خاڵە شێخ جەنگی لە پاش خۆی هەوارەکەی چۆڵ نەبێ. پەندێکی کوردی دەڵێ: مزگەوت ڕووخاوە و میحرابت ماوە، هیوادارین منداڵەکانی هەوارەکەی باوکیان چۆڵ نەکەن و هەر خۆشەویستی گەلەکەی خۆیان بن.

# کورتە بیرەوەرییەکی خەباتی پێشمەرگایەتیی هەڤاڵی سەرکردە خوالێخۆشبوو کاک غەریب سەعید، ناسراو بە غەریب عەسکەری

کاک غەریب عەسکەری هەڤاڵێکی دێرین و خۆشەویستی من بوو. من لە شۆڕشی ئەیلوول لە ساڵی ١٩٦٤ەوە ئەو سەرکردە کوردپەروەر و قارەمانەم ناسی. ئەو کاتە من لە گوندی عیساوێ بووم لە ئەکادیمی شۆڕش، کاک غەریبیش لە هێزەکەی کاک عەلی عەسکەری بوو. ئەو کاتە هەردووکمان گەنج بووین. کاک غەریب گەنجێکی باڵابەرز بوو، پێشمەرگەیەکی چالاک و دڵسۆز و کوڕێکی گیان لەسەر دەست بوو. هەستێکی بەرزی نەتەوایەتی هەبوو. کاک غەریب خۆشەویستی شەهید عەلی عەسکەری بوو. من و کاک غەریب زۆر برادەر بووین، بەڵام لەبەر ئەوەی شوێنی کارکردنمان لە یەکەوە دوور بوو، درەنگ یەکدیمان دەدیت. کاک غەریب زۆر پابەندی فەرمانەکانی حزب بوو، زۆرلە کۆڕ و کۆبوونەوەکانی حزبدا بەشداری دەکرد. ئەو کاتە بەڕێز مام جەلال زۆر کاک غەریبی خۆشدەویست. هەر لە ساڵی ١٩٦٤ بە هۆی شەڕی براکوژییەوە هێزەکەی باڵی مەکتەبی سیاسی چووینە ئێران و هەمەدان، کاک غەریب عەسکەرییش لەگەڵمان بوو، ئەو ماوەیەی لە هەمە دان بووین من و کاک غەریب بەشداری خولی فێربوونی زمانی ئینگلیزی بووین. هەروەها بەشداری مەشقی سەربازییش بووین. کاک غەریب پیاوێکی زیرەك بوو هەوڵی دەدا پێش بکەوێت. من پێموابوو کاک غەریب دەبێتە سەرکردەیەکی باش. لە پاش گەڕانەوەمان بۆ کوردستان، کاک غەریب لەگەڵ کاک عەلی و مام جەلال

بە لای حاجی ئۆمەراندا گەڕانەوە، لەوێندەر هەڤاڵانی ئێمە تووشی شەڕێکی گەورە هاتن بە سەرکردایەتی شەهید عەلی عەسکەری و کاك رەئیس کەمال موفتی، کاك غەریبیش بەشداری ئەو شەڕە بوو، بەداخەوە لەو شەڕەدا ئێمە ١٢ پێشمەرگەمان لە چیای کۆڕەك شەهید بوون. لە پاش شەڕەکە لەشکرەکەی ئێمە هاتنە گوندی شێخ وەسانان. پاشان هەموو لەشکرەکەمان چوینە گوندەکانی کرژە و چەرمەگا. لە ساڵی ١٩٦٧ لەشکرەکەمان چووینە بەکرەجۆ، ئەو ماوەیەی لە بەکرەجۆ بووین بەڕێز مام جەلال فەرمانی دا پێویستە هەموو پێشمەرگەیەك ئەوەی خوێندەواری هەیە ئازادە ڕۆژانە یان هەفتانە یان مانگانە بە سەربەستی بیروڕای خۆی بنووسێت و لەبەر دەرگای ژوورەکەی مام جەلالی بدات. کاك غەریب نووسینی هەفتانەی هەبوو، ئەو نووسینانە هەموو پێشمەرگەکان دەیانخوێندەوە. لە ساڵی ١٩٦٩ من گوازرامەوە بۆ هەولێر و لە کاك غەریب دابڕام و یەکدیمان نەدیتەوە. لە شۆڕشی نوێشدا کاك غەریب خاوەنی دەست و تفەنگی خۆی بوو. لە ساڵی ١٩٨٨ پێش ئەنفالەکان کاك غەریب خۆی و لەشکرەکەی لە دەوروبەری گوندی چەرمەگا بوو، من ئەو قسەیەم لە عومەری حەمەعەلی بیست، ئەو کاتە ئەو جاشی ڕژێم بوو، وابزانم لە ساڵی ٢٠٠٥ بوو من چوومە مەڵبەندی پێشمەرگە، لەوێش بە دیداری ئەو هەڤاڵە دێرینە شاد بوومەوە، ئەو کاتە پلەکەی عەقید بوو. لە کۆتاییدا دەڵێم هیوادارم بەوەندە نووسینە بنەماڵەی هەڤاڵی دێرینم لە من ڕازی بن. هەزاران ڕەحمەت لە گۆڕی غەریب بێت.

***

# بیرەوەرییەکانم لەگەڵ شارە دێرینەکەی کۆیە

شارە دێرینەکەی کۆیە، شاری سەروەران و مەڵبەندی شۆڕشگێڕان و جێگای شانازیمانە. من هەرچەندە خەڵکی شاری کۆیە نیم، بەڵام وەکو کوڕە هەژارێك بەپێی ڕێکەوت و ڕووداو بە درێژایی تەمەنم لە سێ کاتی جیاجیادا بیرەوەریم لەگەڵ ئەو شارە دێرینەدا هەیە. کاتی منداڵی و هەژاریم، هەروەها کاتی سەربازیم و کاتی پێشمەرگایەتیم، هەموو شتێکم وەکو خۆی لە یاد ماوە، خۆشحاڵم لە تەمەنی پیری و ئەو یادەوەریانەشم پێشکەش بە دانیشتووانی شارە خۆشەویستەکەی حاجی قادری کۆیی بکەم، هیوادارم جێگای ڕەزامەندیی خوێنەران بێت.

١-پێشەکی بیرەوەرییەکانی کاتی منداڵی و هەژاریم، هەندێك کەس خۆی لە کاتی هەژاری دەشارێتەوە، بەڵام من بە شانازییەوە باسی هەژاریی خۆم دەکەم. لە ساڵانی توتن توتن بوو، بۆ توتنکردن لە گوندەکەی خۆمان بارمان کرد چوینە گوندی باش موسییان لە دەشتی بیتوێن. ئێستا ئەو گوندە کەوتووەتە ژێر ئاوی دەریاچەی دوکان. لە پاش ئەوەی دەستمان لە توتنکردن برا، بارمانکرد هاتینە گوندی هەواوان، ئەو کاتە من مێرمنداڵبووم، لەگەڵ برا گەورەکەم دەژیام. لە گوندی هەواوان کاکم بووە جووتیار، ئەو کاتە ئێمە چەند سەر مەڕێکمان هەبوو، بۆ بەخێوکردنی مەڕەکان من چوومە گوندی کێلەخوارە مەڕەکانمان لەگەڵ ماڵی حەمەسوور تێکەڵ کردن و من بووم بە شوان. حەمەسوور پیاویکی زۆر باشبوو، خێزانەکەی مەحبوب خان

ژنێکی زۆر بەڕێز بوو. ئەو کاتە شاری کۆیە ئەوەندە گەورە نەبوو، بەشی هەرە زۆری خانووەکانیان سەریان بە گومبەت دروست کرابوو. ئەو کاتە دانیشتووانی شار و لادێکان زیاتر باسی (٣) بنەماڵەیان دەکرد. وەکو کەسایەتیی دیار و ناوداری شاری کۆیە لە ڕووی دەوڵەمەندی و دەسەڵات و هەژارپەرست و سەربڵندییەوە باس باسی حەمەئاغای کۆیە بوو، وەکو پەندی پێشینان باس دەکرا. ئەگەر باسی کەسێکی ناندەریان بکردبا دەیان گوت خۆ حەمە ئاغا نییە، یان دەیان گوت دەڵێی حەمە ئاغایە. دووەم لە ڕووی زانست و دینداری و مەلای باش باسی ماڵی جەلیزادە دەکرا. سێیەم لە ڕووی دەوڵەمەندی و پارەدارییەوە باسی عەبدولڕەحمان چەلەبی دەکرا. ئەو ماوەیەی من لە گوندی کێلەخوارە بووم تازە بناغەی خانووەکەی ماڵی کاکەزیاد دادەندرا، ئەو کاتە خانووی وا لە هەموو شاری کۆیە نەبوو، لەبەر ئەوەی هەموو بە بەردی نەقاڕی و چاککراو دروست کرا. ئەوکات ئاوی خواردنەوەی کۆیە لە حەمامۆکەوە بە بۆڕی دەهاتە ناو حەوزێکی بچووکەوە، حەوزەکەش لە نزیك ماڵی مامەند ئاغا بوو. ئەو ملە زوورگەی نێوان کێلەخوارە تا دەگاتە نزیك گوندی تۆبزاوە هەمووی پاوانی ماڵی ڕەشیدە کەڕی بوو. وەکو باسیان دەکرد ئێمە مەڕمان تێدا دەلەوەڕاند، بەڵام ئێستا بووەتە گەڕەك. ئەوکات گوندی کێلەخوارە چەند ماڵێك بوون هەموویان مەڕدار بوون، من هەر ناوی دوو ماڵم لە یاد ماوە، وەکو ماڵی حەمەسوور و ماڵی کانەبی و مرادی برای کانەبیم لە بیر ماون. ئەو کاتە بەشی زۆری ماڵەکانی کۆیە هەر ماڵە و دوو سێ دابەستیان بەخێو دەکرد. لە سەرەتای زستان سەریان دەبڕین و دەیان کردنە قاورمە و سەر و پێیەکەشیان دەکردە گیپە. دانیشتووانی شاری کۆیە و دەوروبەری چەند قسەیەکی تایبەت و

جیاوازیان هەیە، ئەویش ئەمانەن: یەك بە گوێز دەڵێن گووز" دوو بە خوێن دەڵێن خوون" سێ بە کێلی قەبران دەڵێن قێل" چوار بە گیسکی دەڵێن جیسك" پێنج بە خوێندنی دەڵێن خووندن. ئەو کاتە شەقامی قیرکراو لە شاری کۆیە نەبوو، ئاو و کانیاو زۆر بوون، باخچە و بەراوێکی زۆر دەکرا، لە گوندەکانی دەوروبەری شاریش بە کەر و کاروان شت دەهات و دەفرۆشرا. ئەو کاتەی من باسی دەکەم زۆر کەم سەیارە دەبیندرا. لە پاشان من گوندی کێلەخوارەم بەجێهێست، ماوەی چەند مانگێك چوومە گوندی شێخەروان. ئەو کاتە گوندی شێخەروان سێ چوار ماڵێك بوون. پیاوە ناودارەکەی گوندی شێخەروان ناوی حاجی حامید بوو. لە پاشان گەڕامەوە دەشتی هەولێر. ئەوە بوو بیرەوەری کاتی هەژاریم لەگەڵ شاری کۆیە.

٢-بیرەوەرییەکانی سەردەمی سەربازیم لە شاری کویە. من لە ساڵی ١٩٥٢ لە کاتی هەرای فەلاحەکان و ئاغاکانی دەشتی هەولێر بوومە عەسکەر. لە کاتی عەسکەریدا چەند کوڕێکی خەڵکی کۆیە لەگەڵ من عەسکەر بوون و بووینە برادەر، ئەمەش ناوەکانیانە:

١-عوسمان عەباس"

٢-زاهیر حەلاق، ناوی باوکی نازانم"

٣-عوسمان تەها، ئەویش حەلاق بوو. ئەو کاتە نافیز جەلال نەقیب بوو لە پاشان ئەوان لە عەسکەری دەرچوون و من مامەوە. لە ساڵی ١٩٥٦ چوومە ناو ڕێکخستنەکانی پارتی. ئەودەم لە شاری مووسڵ بووم، ساڵی ١٩٥٨ گوازرامەوە هەولێر، هاتمە فەوجی (٣) لە لیوای (٢) بوومە لێپرسراوی حزبی لە فەوجی (٣). ئەو کاتە بەشی هەرە زۆری لیوای (٣) کورد بوون، ئەودەم لەناو جەیشدا دوو حزب هەبوون: (حزبی شیوعی و پارتی دیموکراتی)، بەڵام

ئەو دوو حزبەزۆر دژایەتیی یەکدیان دەکرد و ناکۆک بوون. هەرچی حزبی شیوعی بوو بە پارتیان دەگوت حزبی ئاغا و دەرەبەگ و دۆلارخۆر، جا ئەو ناکۆکییە بەردەوام بوو. من ئەو کاتە لە هەولێر بووم، لەگەڵ چەند عەریف و نائیب عەریفێکی خەڵکی کۆیە و دەوروبەری بوومە برادەر، کە ئەمانە بوون: ١-نائیب عەریف (عەبدولڕەزاق بێتوشی) لە ژیاندا ماوە" ٢-نائیب عەریف (خدر عەبدوللا) خەڵکی گوندی شەوگێڕ بوو" ٣-نائیب عەریف (محەمەد عەلی) خەڵکی گوندی شیواشۆك بوو" ٤-کەریم عەلی خەڵکی گوندی مەرزان، ئەمانە هەموویان ئەندامی پارتی بوون"

٥-مامۆستا کەمال محێدین، ئەو کاتە ئەفسەر بوو.

ئەوکاتە ڕێکخستنەکانی عەسکەری بە ناوی لیژنەی گوند بوو، لە هەولێر مامۆستا مەلا عەولا ناسراو بە (مەلا ماتۆڕ) لێپرسراوی بەشی عەسکەری بوو. لەناو لیوایەکەی ئێمەدا بەشی زۆری عەریف و نائیب عەریفەکان پارتی بوون و حزب زۆر لە گەشەکردندا بوو. لە ساڵی ١٩٦٠ ساردی کەوتە نێوان مەلا مستەفا و عەبدولکەریم قاسم. ئەو ساردییە بەردەوام بوو و کار گەیشتە ئەوەی بارزانی بە تووڕەیی گەڕایەوە بارزان، هەر لەبەر ئەو تووڕەبوونە بوو قسە و قسەڵۆك پەیدا بوو، دەیانگوت بەشێك لە سەرۆك عەشیرەتە گەورەکان خەریکن چەکدار کۆدەکەنەوە و خۆیان ئامادە دەکەن بۆ شۆڕش. ئەو قسانە زۆر بە گەرمییەوە بڵاودەبوونەوە و ناوی چەند سەرۆك عەشیرەتێکیشیان دەهێنا. بە زۆری ناوی عەباسی مامەند ئاغای سەرۆکی عەشیرەتی ئاکۆ و ناوی شێخ حوسێنی بۆسکێن و ناوی سمایلی سوار ئاغا و ناوی کاکەزیاد و ناوی کوێخا سمایلی تەلان و ناوی مینەی عەلی ئاغا ڕایەتی لەگەڵ عەشیرەتەکانی ناوچەی سلێمانی دەهات. ئەو دەنگوباسانە زۆر بە گەرمی

بڵاودەبوونەوە، لەگەڵ ئەو دەنگوباسانەدا حکومەتیش هەوڵیدەدا بەشێك لە سەرۆك عەشیرەتەکان بۆ لای خۆی ڕابکێشێت و بیانکات بە جاش و چەکداریان بکات. هەر لەو کاتەشدا بوو (سەدیق میران) کوژرا. کوشتنی سەدیق میران کەوتە سەر ملی حزب و کاوانییەکان. ئەوە بوو فەرمانی گرتنی کاوانییەکان و چەند کەسێکی گوندی حوجران دەرچوو، ئەوانە خۆیان نەدا دەست حکومەت و خۆیان و چەکەکانیان چوونە شاخی سەفین، مەفرەزەیەکی چەکداریان لە شاخی سەفین پێك هێنا. حزب سەرپەرشتی ئەو مەفرەزەیەی بە سە کردایە تی مەلا عەوڵا و مامۆستا شەمسەدین موفتی دە کرد. ئەوە یەکەمین مەفرەزەی چەکداری حزب بوو پێش شۆڕشی ئەیلوول کە دروستبوو. لە پاشان پۆلیسەکانی ئەندامی حزب عەریف عوسمان و حەمەساڵح عەبدوڵڵا و کەریم حەسەن بەگ جبەخانەی سەرای هەولێریان هەمووی هێنا و چوونە ناو هێزەکەی سەفین. دوای ئەوە (٦٥) پۆلیس زیاتر بە یەکجار خۆیان و چەکەکانیان چوونە ناو هێزەکەی سەفین. ئەو هێزەی سەفین گەشەی کرد و لە زیادبووندا بوو، ژمارەیان گەیشتە زیاتر لە (١٥) چەکدار، هەر لەو کاتەش بوو سەرۆك عەشیرەتەکان چەکدارەکانی خۆیانیان کۆکردەوە و ئەم جیگایەنەیان گرت: ١–دۆڵی خەلەکان" ٢–چنارۆك و سەری هەیبە سوڵتان" ٣–ناحیەی دێگەڵە" ٤–دەربەندی بازیان" ٥–دەربەندیخان. لە دوای گرتنی ئەو ڕێگایانە حکومەت هەوڵیدا لە ڕێگای گفتوگۆکردنەوە بڵاوە بەو هێزانەی عەشائیر بکات، ئەوە بوو محافزی سلێمانی هاتە دۆڵی خەلەکان و لەگەڵ سەرۆك عەشیرەتەکاندا کۆبووەوە، سەرۆك عەشیرەتەکان داوای هەڵوەشاندنەوەی قانوونی ژمارە (٩٥) و قەرەبووی عەرد و ئەو گوندانەی کە کەوتبوونە ژێر ئاوی دەریاچەی دوکانیان دەکرد و داوای دۆرمی

توتنیان دەکرد، واتە گردبوونەوەی عەشائێر شۆڕشی چەکداری نەبوو، ئەو گفتوگۆیە سەری نەگرت. لە سەرەتای مانگی ٩ی ١٩٦١ بەشێك لە هێزەکەی سەفین بە سەرکردایەتیی عەریف سلێمان و حەمید کاوانی هاتنە دەربەندی گۆمەسپان. ئەو کاتە مەخفەرێکی پۆلیس لەوێ هەبوو. من لە ڕێگای حزبەوە پەیوەندیم هەبوو لەگەڵ عەریف سلێمان و حەمید کاوانی، ڕۆژانە لەبارەی جموجۆڵی جەیش ئاگادارم دەکردنەوە. بۆ بڵاوە پێکردن و سەرکوتکردنی لەشکری عەشائیری، حکومەت لیوای (٣)ی تەرخان کرد، فەوجێك بۆ دەربەندیخان، فەوجێك بۆ دەربەندی بازیان و فەوجی (٣)ش بۆ کۆیە، کە من لە فەوجی ٣ بووم. کات و ساتی هێرشەکەش بەرەبەیانی ڕۆژی ١٩٦١/٩/١١ بوو. من شەوی ٩/١١ نامەیەکم بە دەستی شێخ ئەحمەد شێخ عەبدولکەریم کە ئێستا ماوە بۆ عەریف سلێمان و حەمید کاوانی نارد، ئاگادارم کردنەوە کەوا بەیانی فەوجی (٣) بە پاڵپشتی فڕۆکە و تۆپی گەورەوە بەرەو کۆیە بەڕیدەکەوێت، بۆم نووسیبوون ئاگادار بن ئەندامانی حزب لەناو فەوجەکە ئاگادار کراونەتەوە ئەگەر بووە شەڕ تەقەتان لێ نەکەن و تەقەکانیان ڕوو لە ئاسمان دەبێت و لە کاتی خۆبەدەستەوەدانیش پەڕۆی سپی بەرز دەکەنەوە. نووسراوەکە گەیشت، کاك عەریف سلێمان لە لاپەڕە (١٣٩)ی بیرەوەرییەکەی خۆیدا ئاماژەی بەو نووسراوە کردووە. هێرشەکە بووە ڕۆژی یەکەمی دەستپێکردنی شۆڕشی ئەیلوول. ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی زۆر ناخۆش بوو، فەوجەکەی ئێمە سەر لە بەیانی ڕۆژی (١١)ی ئەیلوول بەرەو کۆیە بەڕێکەوت، پێش ئێمە فڕۆکەکان ڕێگایان پاك کردەوە، بە بەردەوامی لە ئاسمانی نێوان هەولێر و کۆیە هاتوچۆیان دەکرد، تۆپە گەورەکانیش ئەو چیایانەیان تۆپباراندەکرد. ئەو کاتە حکومەت زۆر لە کورد دەترسا، کوردیش

زۆرلە جەیش دەترسا، ئەو رۆژە چەند کاروانێکی خۆشناوان لە نزیك رێگا بە بەر هێرشی فرۆکە کەوتبوون، ئێمە هەر لە سەرەتای چوونمان بۆ کۆیە، فەسیلی ئێمە پێشەنگی فەوجەکە بووین. ئەو رۆژە تا ئێوارە هەر بە رێگاوە بووین، بەڵام تووشی شەڕ نەبووین، کاتی رۆژ ئاوا بوو پێشەنگی سەیارەکان کە منی لەگەڵدابوو گەیشتینە بەردەمی یانەی فەرمانبەران، نزیکەی (٢٠) کەسێك لە شیوعییەکان بە چەپڵەلێدان هاتنە پێشوازیمان، ئێمەش لێیان هاتینە خوارێ خۆمان لێیان تووڕە کردن و بڵاوەیان کرد. تا جێگای خۆمان لە ناو شاری گرت کات بووە دەورووبەری عیشا. سریەکەی ئێمە لە نزیك بەنزیخانەکە کە ئەوکات پەرێز بوو، جێگیر بوو، بەڵام ئەو رۆژە نان و ئاو دابەش نەکرابوو، هەمووومان زۆر برسی و تینوو و هیلاك بووین. من حەزم دەکرد دەنگوباسی ناو شار وەربگرم، بە فێڵی نان و ئاوپەیداکردن رۆخسەتم لە ئامر سریەکەم وەرگرت، دوو سەربازی کوردم لە ئەندامانی حزب لەگەڵ خۆم برد و چوومە ناو ئەو گەڕەکەی بەرامبەر بەنزینخانە، چووین لە دەرگای ماڵێکمان دا، ماڵەکە خانوویێکی گەورە بوو، دەرگایان دوودەری بوو، کچێکی (١٤-١٥) ساڵی دەرگای کردەوە، بۆ ئەوەی نەترسێ من زوو گوتم داکە ئێمە سەربازین و کوردین، هاتووین دوو سەتڵ ئاومان بدەنێ، ئەو کچە سەربەرزە زۆر بە بێ ترس گوتی ئێوە کوردن بەخێر بێن ئاوتان دەدەمێ، بەڵام سەربازی کوردی بە غیرەت لەمەودوا نابێ هاوکاری ئەو حکومەتە بۆگەنە بکات، وەرە بزانە منداڵانی کورد لە ترسی بوردومانی فرۆکە هەمووی نەخۆش کەوتوون و چەند قوتابییێکیش بریندار بوون، فرۆکە لە قوتابخانەیەکی داوە. من بۆ ئەو هەستە بەرزەی زۆر سوپاسم کرد و هەندێك پرسیاری دیکەم لێکرد و ئاوەکەی بۆ هێنایین، هەر بەرامبەری ئەوە ژنێکی دیکە چوار نانی بۆ هێنایین

و گەڕاینەوە، تا ئێستاش قارەمانێتیی ئەو کچەم لە بیر ناچێت. بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە چوومە ناو شار، کاك عوسمان عەباسم دیتەوە، ئەویش ئەندامی پارتی بوو، ئێمە ماوەی ٣ ڕۆژ لە کۆیە ماینەوە، ڕۆژانە چەند جار فڕۆکەکان دەهاتن سەر شاخی هەیبە سوڵتانیان بوردومان دەکرد. لە کاتی هاتنی فڕۆکەکان شیوعییەکان دەچوونە سەر بانەکان و جەمەدانیان ڕادەوەشاند و دەیانگوت بەخێر بێن کۆترەکانی ئاشتی، لێیان دەن لەو دۆلارخۆر و دەرەبەگانە. ئەمە جاری دووەم بوو کۆیە ببینمەوە، بەڵام ئەمجارە بە عەسکەر و بە بیر و باوەڕێکی پڕ لە کوردایەتی. لێرەدا پێویستە هەندێك باسی چۆنێتیی شکان و بڵاوەکردنی هێزی عەشائیری بکەین، ئەو هەموو چەکدارانەی هێزی عەشائیری لەبەر ئەوەی هەستی کوردایەتیان نەبوو بە بێبنەما و بەرنامە و بۆ بەرژەوەندیی خۆیان کۆبوونەوە و ئەو خیانە تە یان کردو هەر لەگەڵ یەکەم هێرشیَ فڕۆکەکان کەسیان نەبووە برای کەس و بە ماوەیەکی زۆر کەم هەموو جێگایەکان چۆڵکرابوون و بڵاوەیان کرد، ئەوەی بڵاوەی نەکرد ئەو هێزەی سەفین بوو وەکو بناغەی شۆڕش بە خۆڕاگری مایەوە، عەباسی مامەند ئاغاس لەگەڵ شێخ حوسێن بۆسکێنی لە دۆڵە ڕەقە بڵاوەیان بە چەکدارەکانی خۆیان نەکردبوو.

لە ڕۆژی ١٩٦١/٩/١٥ لە پاش ئەوەی زانیمان هەموو هێزەکانی عەشائیری بڵاوەیان کردووە و چەکدار لەسەر ڕێگایەکان نەماوە، بەشێك لە فەوجەکەمان بە سەرکردایەتیی عەقید کافی چوینە قەزای ڕانیە، ئێوارە بوو لە نزیك گوندی سەیداوە تووشی شەڕ بووین، عەسکەر خۆی لەو شەڕە ڕانەگرت (١٢) لۆری عەسکەریمان بە جێ هێشت. بۆ ڕۆژی ١٩٦١/٩/١٦ هێزی دیکەمان بۆ هات، ئەو ڕۆژەش لە بناری چیای کێوەڕە ش تا ئێوارە شەڕ بوو، ئێوارەکەی من

خۆم و ڕەشاشەکەم چوومە ناو لەشکری کوردستان، واتە لە ڕۆژی ١٩٦١/٩/١٦ من یەکەم سەرباز بووم چوومە ناو ریزی شۆڕش و چوومە بنکەی پاشقۆتەڵ. ئەو کاتە ئەم بەڕێزانە لە بنکەی پاشقۆتەڵ بوون:

١-عەبدولڕەحمان ڕووتە، خەڵکی کۆیە بوو"

٢-تۆفیق مەلا سەدیق، خەڵکی ڕانیە بوو"

٣-میرزا باپیر، خەڵکی قەڵادزە بوو"

٤-سەدیق ئەفەندی ، خەڵکی سلێمانی بوو"

٥-عەزیز بەگ، خەڵکی ڕانیە بوو"

٦-عەزیز فەقێ سمایل، خەڵکی کۆیە بوو.

لە پاشان هەر لە مانگی ٩ بوو(کاکی کاکان و مامۆستا عەلی عەبدوڵڵا)م ناسین. لە مانگی ١١ی ١٩٦١ مام جەلال و دکتۆر خالید و مەحمودی کاکە و حەمید حوسێن پوشکە و عەلی مام ڕەشیدم ناسین.

لە ساڵی ١٩٦٢ بوومە لێپرسراوی بارەگای مەکتەبی سیاسی لە ئەشکەوتی گوندی مالومە، هەر ئەو کاتەش کاکە سوور و بەکر عەبدولکەریمم ناسین. لە بەهاری ١٩٦٣ مۆڵەتم وەرگرت بۆ بینینی منداڵەکانم لە گوندی گۆمەشین، دوو پێشمەرگەم لەگەڵدا بوو، چووینە گوندی قەیسەری لە ماڵی کوێخا مەمەند بووین، ئەو ڕۆژە بوو کە عەبدولکەریم قاسم کوژرا و عەبدولسەلام هاتە سەر دەسەڵات.

ئەو ڕۆژەش مامۆستا مەلا عەوڵا خۆی و شەش پێشمەرگە شاری کۆیەیان گرت و پۆلیسەکان لە ترسان چوونە ناو مەرکەزەکەوە و دەرگاکانیان لەسەر خۆیان داخست. نازانم مامۆستا مەلا عەوڵا چۆن زانیبووی من لە گوندی قەیسەریم، نامەیەکی بۆم نارد، نووسیبووی مۆڵەتەکەت ببڕە و بە پەلە وەرە

لامان، بارەگامان لە مزگەتی مەلا حەوێز ئاغایە. ئێمەش یەکسەر لەگەڵ کوێخا مەمەند کە هەموومان چوار چەکدار بووین چووینە ناو شاری کۆیە، بەڵام ئەم جارەیان جیاوازتر بوو لە کاتی منداڵیم و کاتی عەسکەریم، ئێستا من پێشمەرگەم و بە بیر و باوەڕی پێشمەرگایەتی و کوردایەتی بۆ جاری سێیەم دەچمەوە ناو شارەکەی کۆیە. من هەر چەند ئەو دیمەنەم بە بیر دێتەوە گریانم دێت، نازانم بۆ وامان لەو کوردە کرد کە ئاوا هەستی کوردایەتی لە بیر بکەن، زۆر باشیش دەزانم، بەڵام وسکت و نەجات. با بگەڕێمەوە سەر باسەکەی خۆمان، گوتم ئێمە چوار چەکدار بووین چووینە ناو شاری کۆیە، گەیشتینە لای سەری شەقامی سەرەکی بەنزینخانە کۆنەکە، بە درێژایی ئەو شەقامە خەڵکێکی زۆر لەلای چەپ و ڕاستەوە بە چەپڵەلێدان و چوکلێتباران لە پێشوازی ئێمەدا بوو، لەسەر بانەکانیس ژنانی کۆیە بە هەلهەلەلێدان تا گەیشتینە مزگەوتەکە. من بۆ ئەو ڕۆژە گریانم دێت، ئەو کاتە پێشمەرگە چەند خۆشەویستی میللەت بوو، دوور لە ئێستا ئەو کات پێشمەرگە بە ڕزگارکاری کوردستان دادەندرا، هێشتا ڕەزایان گران نەببوو.

لە پاشان شار ئارام بووەوە هێزی تر هاتە کۆیێ. من ئەو کاتە خوالێخۆشبوو سەلیم ئاغای حەوێزیم ناسی و بووینە برادەر. دواتر چوومە گۆمەشین و منداڵەکانم دیتن و ئینجا گەڕامەوە بارەگای م.س. دوای گەڕانەوەم سەرۆک بارزانی و خۆی لەشکرێکی زۆر هاتنە کۆیە، ئەو لەشکرە هەمووی لەسەرماڵەکانی شاری کۆیە دابەشکرابوون، تا ماوەیەکی زۆر مانەوە، لەگەڵ ئەوەش شیوعییەکان لە شاری هەولێر هەڵدەهاتن و ئەوانیش دەهاتنە شاری کۆیە. ئەو شارە کوردپەروەرە جگە لە پێشمەرگە و لەشکرەکەی بارزانی پڕ بوو لە خەڵك. ئەو کاتە گفتوگۆ هەبوو، سەرۆکی

وەفدی شۆڕش مام جەلال بوو. شاری کۆیە ئەوەندە ئەرکیان گران بوو بێزار بیوون. ئەو خۆشەویستییەی لەنێوان پێشمەرگە و خەڵکی کۆیە هەبوو کەلەنی تێکەوت. ئەو کاتەی بارزانی لە کۆیە بوو، من (١٥) تفەنگی بڕنۆی تازە و دوو بار جلوبەرگی خاکی و هەندێك پارەم لە مەکتەبی سیاسییەوە بۆ هێنایە کۆیێ. شەوی جەژن بوو چوومەماڵی کاك تاهیر برا گەورەی کاك عومەر دە بابە، نانی جەژنم لە ماڵی ئەوان خوارد. چەکەکانم لە ماڵی کاك عومەر بەجێهێشت و خۆم گەڕامەوە.

لە ساڵەکانی (١٩٦٧–٦٨–٦٩) لەگەڵ ماڵی شێخ جەنگی و شێخ شەرەف و شێخ شوکروڵڵا و قارەمان شەوکەت و مامە ڕووتە و جووتە برا شەفە و ڕەفە و مەجید کوردە و عەریف حوێز و چەند پێشمەرگەیەکی دیکەی کۆیێ لە بەکرەجۆ بووین. مام جەلال فەرماندەی هێزی ڕزگاری بوو. لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٠ لە کۆییەکان دابڕام گوازرامەوە بۆ هەولێر و بوومە فەرماندەی هێزی هەولێر. ئێستاش بە پیری وا لە هەولێرم لە ناوەندی کۆمەڵایەتی هەولێر.

هیوادارم ئەم نووسینە جێگای ڕەزامەندیی خوێنەران بێت.

# بیرەوەریم لەگەڵ سەرکردەی نەمر شەهید عەلی عەسکەری

پڕ بە دڵ خۆشحاڵم بەوەی کورتە باسێکی ساڵانی پێشمەرگایەتیم لەگەڵ هەڤاڵی پێشمەرگە و سەرکردەی نەمر شەهید عەلی عەسکەری باس بکەم. ئێمەی پێشمەرگە دێرینەکانی شۆڕشی ئەیلوول هەر یەکەمان لەگەڵ سەرکردەکان جۆرە بیرەوەرییێکمان هەیە، ئەو بیرەوەریانە هەندێکیان ونبوونە و هەندێکیش باسیان لێوە کراوە. من شانازیی بەوە دەکەم کە دەتوانم جێگای خۆم لە لاپەڕەکانی کتێبەکەی سەروسەربردەی شۆڕە سوارێکی قارەمانی کوردپەروەری مەیدانی کوردایەتی، شەهید عەلی عەسکەری دەکەمەوە. من وەکو پێشمەرگەیەکی سەرەتای شۆڕشی ئەیلوول هەندێك بیرەوەریم لەگەڵ هەڤاڵی دێرینم شەهید عەلی عەسکەری هەیە، ئەو بیرەوەرییەش بە بێ زیاد و کەم وەکو خۆی دەگێڕمەوە، هیوادارم جێگای ڕەزامەندیی هەمووان بێت. سەرەتای بیرەوەرییەکەم بەوەوە دەستپێدەکەم کە: هەر کەسێك ڕۆژێك عەلی عەسکەری دیبایە تا مردن قەت و قەت سیما و پێکەنین و نوکتە خۆشەکانی ئەوی لە بیر نەدەچووەوە. لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلوول پێش ئەوەی من کاك عەلی بناسم، زۆر کەس باسی ئازایەتی و دڵسۆزیی عەلی عەسکەری دەکرد و وایان باس دەکرد و دەیانگوت لە کاتی شەڕکردندا لە ریزەکانی پێشەوەدایە، هەر ئاواش باسی مامۆستا مەلا عەوڵا دەکرا. سەرەتای ناسینم لەگەڵ نەمر دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٦٢، ئەو کاتەی بارەگای مەکتەبی سیاسی لە ئەشکەوتی گوندی مالومە بوو. من ئەو کاتە لێپرسراوی بارەگایەکە بووم. هەر لە ئەشکەوتەکە

کۆبوونەوەیەکی گشتیی مەکتەبی سیاسی و ئەندامانی لیژنەی مەرکەزی کرا، بەڵام سەرۆکی حزب کە بارزانی بوو لەو کۆبوونەوەیە ئامادە نەبوو، کاك (عەلی)یش ئەو کاتە ئەندامی لێژنەی مەرکەزی بوو، لە کۆبوونەوەکە ئامادە بوو. ئەو کاتە کاك عەلی سەرکردایەتیی هێزێکی دەکرد لە ناوچەی بادینان و لەگەڵ بارزانی بوو. لەو ڕۆژەوە من کاك (عەلی)م ناسی و بووینە برادەر. هەر بۆیەش کە باسی کاك عەلی بکرێت من یەکسەر ئەو هەموو جوانی و قارەمانیەتییەی کاك (عەلی)م دێتەوە بەرچاوان.

لە پاش تەواوبوونی کۆبوونەوەکە کاك عەلی داوای لە مەکتەبی سیاسی کرد کە نەگەڕێتەوە ناوچەی بادینان. م.س داواکەی کاك (عەلی)یان قبووڵ کرد و کاك عەلی لە ناوچەی سۆران مایەوە. هەر لە ١٩٦٢ لە کۆتایی مانگی ١٠ بوو ڕۆژێك کاك عەلی و کاك عومەر دەبابە هاتنە بارەگای م.س، هەردووکیان بە تەنیا بوون. مامۆستا ئیبراهیم بە منی گوت سێ وڵاغی سواری پەیدا بکە سەفەرمان لە بەرە، منیش ناردم لە گوندەکان سێ وڵاغیان هێنا. شەو لە کاتی نیوە شەودا بوو کاك عومەر دەبابە و کاك عەلی عەسکەری و من هەر یەکەو سواری وڵاغێك بووین بەرەو ماوەت بەڕێکەوتین، لەگەڵ ڕۆژهەڵات چووینە گوندی ئاوەکورتێ، نانی بەیانیمان لە ماڵی مەلا ئەحمەدی خوارد، پاش نانخواردن سێ قۆڵی سواری وڵاغەکان بووین، شۆڕ بووینەوە سەر ڕووبارەکەی نێوان سنووری دەستکردی عێراق– ئێران، لەسەر لێواری ڕووبارەکە لە وڵاغەکان دابەزین، کاك عومەر و کاك عەلی چەك و فیشەکدانەکانی خۆیان دا بە من و گوتیان تۆ بگەڕێوە، ئەوانیش لە ئاوەکە پەڕینەوە و چوونە مەخفەرەکی ئێران، منیش وڵاغ و تفەنگەکانم بردنەوە بارەگا.

ئەمە یەکەم جار بوو حکومەتی ئێران پەیوەندیی بە سەرکردایەتیی حزبەوە بکات، واتە ئەمە یەکەم پەیوەندی بوو و کاک عومەر و کاک عەلی ماوەی (١٥) ڕۆژیان پێچوو. کە گەڕانەوە شتێکی ئەوتۆیان لەگەڵ خۆیان نەهێنابوو. هەندێك دیاریان هێنا بوو وەکو دووربین و شتی ورده. حکومەتی ئێران داوای سکرتێری حزبی کردبوو، ئەوە بوو مامۆستا ئیبراهیم چووە تاران.

لە ساڵی ١٩٦٣ کاك عەلی فەرماندەی هێزی خەبات بوو، ماوەیەك بارەگاکەی لە ماوەت بوو، ئەو کاتە منیش لە ئەکادیمی شۆڕش بووم لە گوندی عیساوێ جاروبار یەکدیمان دەدیت. ساڵی ١٩٦٤ کە شەڕی براکوژی دەستی پێکرد، من و کاك عەلی لە مەکتەبی سیاسی بووین، هەردووکمان بە یەکەوە گەڕاینەوە بۆ بەرەکانی شەڕ. شەو لە گوندی شەشۆ بووین، ئەو شەوە من و کاك عەلی تا بەرەبەیان نەنووستین، ئەوەندە قسەی خۆشی دەکرد خەومان لێ نەدەکەوت. بەیانی ئەو چوو بۆ لای گوندەکانی سەراو و میراوە، منیش چووم بۆ لای سیرێ و باسنێ. لە بەرەبەیاندا واتە ڕۆژی پەڕینەوەمان بۆ دیوی ئێران بە یەکەوە لە ئاوەکە پەڕینەوە. لەو کاتە ناخۆشە ش کاك عەلی ڕووگرژ نەبوو. بەهەرحاڵ تا چووینە شاری سەقز ماوەی (٤٠) ڕۆژ لە سەقز بووین، زۆر ئێواران کاك عەلی سواری ئەسپەکەی کاك عومەر دەبوو ڕمبازی دەکرد. بە ڕاستی سەر و سواری هەر لە خۆی دەهات. لە هەمەدانیش کاك عەلی و کاك عومەر هەر لەگەڵ ئێمە بوون، حاڵیان لە حاڵی ئێمە باشتر نەبوو. لە دوای گەڕانەوەمان بۆ عێراق و ناو شۆڕش لە ساڵی ١٩٦٦، کاك عەلی عەسکەری گەورەترین شەڕی لەگەڵ حکومەتی عێراق کرد لە شاخی کۆڕەك، لەو شەڕەدا ١٢ پێشمەرگەی ئێمە

شەهید کران، لەوانە: عەریف حەسەن توتمەیی بوو کە خۆشەویستی کاك عەلی عەسکەری بوو، چالاکترین پێشمەرگە بوو. لە پاشان بەداخەوە دووبارە تووشی شەڕی براکوژی بووینەوە، دووبارە کاك عەلی عەسکەری بوەوە فەرماندەی هێزی خەبات. ئێمە باسی شەڕەکانی براکوژی ناکەین. دوایین جار لە بارەگای لق لە کەرکووك رۆژی بەیانی ١١ی ئادار کاك (عەلی)م دیتەوە.

ئەمە بوو بیرەوەرییەکانم لەگەڵ ئەو سەرکردە کوردپەروەرە، دووبارە دەڵێم ڕووڕەشی بۆ ئەو کەسەی عەلی عەسکەری شەهید کرد. خۆ عەلی عەسکەری لە کوردایەتی زیاتر تاوانێکی دیکەی نەبوو، لەگەڵ ڕێزم بۆ شەهید عەلی و هەموو شەهیدانی کوردستان.

***

## بیرەوەرییەکانم لەگەڵ سەرکردەی نەمر ساڵح یوسفی

ئەگەر مێژوونووسە بەڕێزەکان، مێژووی سەرکردەکانی کورد لە ڕوویی دڵسۆزی و دەستپاکی و دەروونپاکی و نەتەوە پەرستیەوە بنووسنەوە، ئەوا مامۆستا ساڵح یوسفی دەبێ پێشەنگ بێت. بە ڕاستی سەیدا ساڵح یوسفی پیاوێکی خۆڕاگر و کوردپەروەر بوو، خاوەنی هەڵوێستێکی کوردانەی نەگۆڕ بوو. سەرەتای ناسینم لەگەڵ ئەو پیاوە مەزنە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٥٩، ئەو کاتە من سەرباز بووم بە پلەی نائیب عەریف لە فەوجی ٣ی لیوای ٣. کاتی گەرمە گەرمەی مقاوەمەی شەعبی بوو. من ئەو کات ئەندامی پارتی بووم و لێپرسراوی ڕێکخستنەکانی ناو فەوجەکە بووم. ئەو کاتە شەڕ لەگەڵ عەشیرەتی برادۆست و سۆفییەکانی شێخ ڕەشیدی لۆلان گەرمبوو، لەو کاتەدا بوو کە حکومەت منی گواستەوە سەر میلاکی مقاوەمەی شەعبی لە زاخۆ. ئەو کات سەیدا ساڵح یوسفی لێپرسراوی لێژنەی ناوچەی حزب بوو. من خۆم بە مامۆستا ساڵح یوسفی ناساند و کاری حزبایەتیمان بە یەکەوە دەکرد.

من لەبەر ئەوەی سەرباز بووم و مامۆستای مەشقپێکردنی مقاوەمەی شەعبی بووم، حزب زۆر کاری نهێنی و گرانی بە من دەکرد، منیش هەموو کارەکانم سەربەرزانە ئەنجام دەدا، هەر لەبەر ئەوەشبوو مامۆستا ساڵح منی زۆر خۆش دەویست. هەر لە ساڵی ١٩٥٩ مقاوەمەی شەعبی هەڵوەشایەوە، دووبارە من گوازرامەوە سەر میلاکی جەیش و چوومەوە جێگای پێشووی خۆم، بەداخەوە لەگەڵ سەیدا یوسفی لەیەك دابڕاین. لە پاش چوار ساڵ

دابڕان لە ساڵی ١٩٦٣ یەکدیمان لە ئەشکەوتەکەی گوندی مالومە دیتەوە، ئەو کاتە پێشمەرگە بووم و بەرپرسی بارەگای مەکتەبی سیاسی بووم. سەیدا (یوسف)یش ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوو، بۆ کۆبوونەوە هاتە مەکتەبی سیاسی. پەندێکی کوردەواری هەیە دەڵێ کێو بە کێو ناکەوێ، بەڵام چاو بە چاو دەکەوێ. دووەمجار لە ئەشکەوتەکەی مالومە بە یەکدی شاد بووینەوە. سەیدا یوسفی باسی من و خەباتی شاری زاخۆی منی بۆ ئەندامانی م.س گێڕایەوە، ئینجا دوای کۆبوونەوە دیسان لە یەکتر دابڕاین و شەڕی براکوژی ساڵی ١٩٦٤ بە سەرداهات و من لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسی چوومە هەمەدان. لە دوای گەڕانەوەمان لە هەمەدان ساڵی ١٩٦٦ لە دۆڵە ڕەقە بووم، سەیدا (یوسف)یش لێپرسراوی ڕادیۆی دەنگی کوردستان بوو لە ناوچەی باڵەکایەتی. سەیدا نامەیەکی بۆ ناردم و داوای لێکردم سەنگەر بگوازمەوە بچمە لای ئەو، بەڵام من بە قسەم نەکرد و باڵی مەکتەبی سیاسیم پی ڕاستتر بوو، بۆیە بە قسەی سەیدا (یوسفی)یم نەکرد. بۆ جاری سێیەم لە پاش بەیانی ١١ی ئادار سەیدا یوسفی بووە وەزیری دەوڵەت، حزبەکەی ئێمەش واتە باڵی م.س خۆی هەڵوەشاندەوە و چوونەوە ناو پارتی و بوونەوە بە یەك حزب. ئەو کاتەش سەردانی سەیدا (یوسفی)یم کرد، پاش ئەو سەردانە لەیەکدی دابڕاین.

ئەو پیاوە مەزن و کوردپەروەرە لە ساڵی ١٩١٨ لە دایك بووە، لە ساڵی ١٩٧٦ حزبی سۆسیالیستی کوردستانی دامەزراند. بەداخەوە لە ٢٥ی حوزەیرانی ١٩٨١ بە دەستی دەستڕەشەکانی حزبی بەعس بە هۆی نامەیەکی بۆمبڕێژکراوەوە لە بەغدا شەهید کرا. هەزاران ڕەحمەت لە گۆڕەکەی بێت.

***

# کورتەباسێك لە بارەی خەبات و تێکۆشانی پێشمەرگەی دێرین شەهید عەبدولخالق مەعروف

شەهید عەبدولخالق نەك هەر پێشمەرگەیەکی دڵسۆز و بەجەرگبوو، ئەندازیارێکی زۆر بە تواناش بوو لە بواری کارەبا. شەهید عەبدولخالق پیاوێکی نەترس و نەگۆڕ و خاوەن بیروباوەڕێکی کوردپەروەرانە بوو.

کاك عەبدولخالق بە درێژایی تەمەنی قەت و قەت لە خەبات و کوردایەتی دانەبڕا. شەهید عەبدولخالق، بۆ ڕێبازەکەی خۆی تێکۆشەرێکی ڕێکخەر و مشوورخۆر بوو. ئەو بۆ کوردستان وەکو گەنمی قەندەهاری وا بوو، گەنمی قەندەهاری هەموو جۆرە نانێکی لێ دەهات، کاك عەبدولخالق لەناو شۆڕش هەم پێشمەرگەیەکی ئازا و بەجەرگبوو هەم لە بواری حزبایەتیدا مامۆستا بوو هەم ئەندازیارێکی زۆر شارەزا بوو لە بواری کارەباییات. شەهیدی نەمر خاوەنی بەهرەیەکی دەگمەن بوو، ئەو شۆڕە سوارە نووسەرێکی بەتوانا بوو، کتێبەکانی کاك عەبدولخالق بوونەتە سەرچاوەی خوێندنی زانستی و بنەمایی لە زانکۆکان لە بواری فێربوونی کارەباییات. ئەو جێگای شانازییە،، ئەو مامۆستا مەزنە ئەگەر بەعس شەهیدی نەکردبا ئێستا دەبووە گەورەترین پسپۆر و شارەزا لەو بوارەدا. کاك عەبدولخالق لە کاتی پێشمەرگایەتیدا لە نەبوونەوە شتێ وا سەرنجڕاکێشی دەکرد، خەڵق واقی وڕ دەما. بەداخەوە دەڵێم کورد لە پێناوی ڕزگاری و ئازادیدا سەدان شۆڕە سواری وەکو کاك عەبدولخالقی لە دەستدا.

کاك عەبدولخالق بەرلەوەی بێتە ناو ریزەکانی پێشمەرگە (ئیمام تابوور) بوو لەناو جەیشی عێراقی. ئەو پیاوە هەستی کوردایەتی لەسەری زاڵبوو، هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلوول، ڕیزی دوژمنی بەجێهێشت و هاتە ناو ڕیزەکانی پێشمەرگە. ئەو کاتە شۆڕش زۆر بە درەنگی دەنگوباسی دەگەیشتە دەرەوە، بەڵام کاك عەبدولخالق ئەوەندە لێهاتوو و زانا بوو ساڵی ١٩٦٢ توانی بۆ یەکەمجار ئێزگەیەکی ڕادیۆ بەناوی شۆڕش لە ئەشکەوتە ڕەش دابنێت. ئەشکەوتە ڕەش لە ناوچەی ماوەتە لە نزیك سنووری ئێران. ئەوانەی کاریان لەو ئێزگەیەدا دەکرد بریتی بوون لە: هونەرمەند (هۆمەری دزەیی) لەگەڵ مامۆستا (حوسێن قەرەداغی)، ئەندازیارەکەشیان کاك عەبدولخالق مەعروف بوو. لەبەر ئەوەی بەشی زۆری ئێزگەکە بە کەرەسەی خۆمالی کرابوو، زۆر دەنگی نەدەڕۆیی. ئەو کاتە بە هەزار حاڵ تا موەلیدەیەکمان پەیدا کرد بۆ ئێزگەکە. ئەوەی من باسی دەکەم ئەو کاتە بوو کە بارەگای مەکتەبی سیاسی لە نزیك گوندی عیساوێ بوو. ساڵی ١٩٦٤ مەکتەبی سیاسی هەوڵیدا لە ڕیگای (شێخ عەزیز شەمزینی)یەوە ئێزگەیەکی زۆر باشترمان بۆ هات. ئەو ئێزگەیە زۆر بچوك بوو، لەگەڵ موەلیدەکە باری ئێسترێك بوو. ئەو ئێزگەیە سەفەری بوو، لەژێر دەسەڵاتی مامۆستا عەبدولخالقدا بوو. ئەو کاتە شۆڕش لەوپەڕی بەهێزیدا بوو، بەڵام ناحەزانی ناوخۆ چاویان بەو شۆڕشە بەهێزە هەڵنەهات و تووشی شەڕی خۆکوژی هاتین و زۆر کەم کارمان بە ئێزگەکە دەکرد. شۆڕش بووە دوو بەش، بەشی جەلالی و بەشی مەلایی و ئێمە لەبەر براکوژی چووینە ئێران و لە هەمەدان گیرساینەوە و ئێزگەکەشمان لەگەڵ خۆمان بردە هەمەدان. ئێمە ژمارەمان (٤٦٠) پێشمەرگە بوو، ئەو ماوەیەی لە هەمەدان بووین کە ماوەکە ساڵێك

بوو، له‌و ماوه‌یه‌دا هه‌ر جلوبه‌رگی پێشمه‌رگه‌مان له‌به‌ردابوو. ئه‌و ماوه‌یه‌ی له هه‌مه‌دان بووین ده‌سته‌وه‌ستان نه‌وه‌ستاین، هه‌ر خه‌ریكی خوێندن و خۆئاماده‌كردن بووین. له هه‌مه‌دانیش مامۆستا عه‌بدولخالق له كۆنه ڕادیۆكان ئێزگه‌یه‌كی ڕادیۆی بۆمان دروست كرد. ده‌نگه‌كه‌ی هه‌موو شاری هه‌مه‌دانی ده‌گرته‌وه. له پاشان حكومه‌تی ئێران پێیزانی، حكومه‌تی ئێرانی ئێزگه‌كه‌ی برد و سه‌ریان له دروستكردنه‌كه‌ی سوڕ مابوو. له پاش گه‌ڕانه‌وه‌ی هێزه‌كه‌مان له ساڵی ١٩٦٦ كه گه‌ڕاینه‌وه ناو شۆڕش، بارزانی داوای ئێزگه‌كه و كاك عه‌بدولخالقی كرد. ئه‌و كاته من به ماڵه‌وه له دۆڵه ڕه‌قه بووم، كاك عه‌بدولخالقیش ژن و منداڵه‌كانی خۆی له هه‌ولێر هێنان. خۆی و منداڵه‌كانی بۆ ماوه‌ی (٣) شه‌و لای من مانه‌وه. كاك عه‌بدولخالق زۆر هه‌وڵیدا منیش به ماڵه‌وه له‌گه‌ڵیدا بچمه ناوپردان، به‌ڵام من ڕازی نه‌بووم. كاك عه‌بدولخالق دوو جار به نامه داوای له من كرد كه بچم له‌گه‌ڵی بم، من هه‌ر قبووڵم نه‌كرد، ئه‌وه بوو من و كاك عه‌بدولخالق له یه‌كدی دابڕاین. كاتێك من كاك عه‌بدولخالقم دیته‌وه‌له بن قه‌ڵاتی هه‌ولێر دوكاندار بوو.

ئه‌و پیاوه دڵسۆزه هه‌ر خۆی ڕاگرت تا شۆڕشی نوێ به سه‌ركردایه‌تیی تاكه سه‌ركرده‌ی كورد به‌ڕێز (مام جه‌لال) سه‌ری هه‌ڵدایه‌وه. دیسان كاك عه‌بدولخالق خۆی پێ ڕانه‌گیرا و هاته‌وه ناو ریزه‌كانی یه‌كێتی. ئه‌و پیاوه چاونه‌ترسه له كاته هه‌ره ناخۆشه‌كان هه‌ر له شاری هه‌ولێر بوو و خه‌ریكی كوردایه‌تی بوو. ئه‌و مرۆڤه كوردپه‌روه‌ره وه‌كو خه‌نجه‌ری ده‌بان بوو له هه‌ر جیگایه‌ك كوردایه‌تی هه‌بووایه ئه‌و له‌وێ بوو، تا ئه‌و ڕۆژه‌ی به‌داخه‌وه به‌ده‌ستی حكومه‌تی به‌عس له (١٩٨٥/٤/١٠) شه‌هید كرا. هه‌زاران ڕه‌حمه‌ت له گۆڕه‌كه‌ی بێت له‌گه‌ڵ هه‌موو شه‌هیدانی كوردستان.

# کورتەباسێك لە بارەی خەبات و ڕۆڵی سەرکردایەتیی مامۆستا شەمسەدین موفتی لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلوول

لە ساڵی ١٩٦١ لە پاش کوشتنی میرانی سەدیق بەگ، مەفرەزەیەکی چەکدار لە دانیشتووانی گوندی کاوانیان و گوندی حوجران و بەشێك لە ئەندامانی حزب بە چەکەوە چوونە شاخی سەفین. لە مانگی ٨ی ١٩٦١ مامۆستا شەمسەدین موفتی کە ئەو کاتە ئەندامی سەرکردایەتی حزب بوو، بە فەرمانی حزب دەچێتە شاخی سەفین و دەبێتە سەرکردەی ئەو چەکدارانەی شاخی سەفین. لە پاشان حزب چوار پۆلیسی دیکە دەنێرێتە ناو لەشکرەکەی سەفین بەم ناوانە:

١-عەریف سلێمان" ٢-ئەنوەر جۆخین"٣-ڕەشید شێرە" ٤-عەبدولڕەحمان مەلا قادر.

لە پاشان (٨) پۆلیس بە جارێك دەچنە ناو ڕیزەکانی چەکدارانی سەفین، دوا بە دوای ئەو پۆلیسانە، پێنج پۆلیسی دیکە چەك و جبەخانەی سەرای هەولێریان لە سەیارەیەك بار کرد و چوونە ناو هێزەکەی سەفین، ئەمەش ناوی ئەو پۆلیسانەیە کە چەك و جبەخانەی سەرای هەولێریان گواستەوە:

١-عەریف عوسمان یوسف" ٢-حەمەسالح عەبدوڵڵا" ٣-هەمزە جوبرائیل" ٤-قادر حەمەد" ٥-کەریم حەسەن بەگ.

ئەو شۆڕشەی سەفین پەرەی سەند و گەورە بوو، ژمارەیان گەیشتە (٢٠٠) چەکدار بە سەرکردایەتیی مامۆستا شەمسەدین موفتی و مامۆستا مەلا عەوڵا

ئیسماعیل. ئەو لەشکرە هەردەم لەگەڵ جاشەکانی ناوچەکە و لەگەڵ هێزی پۆلیسی گەڕۆك لە شەڕدا بوو، ئەو هێزەی سەفین لە ناوچەی شەقڵاوە حکومەتی هەراسان کردبوو، چەند جار تووشی شەڕی گەورە گەورە دەبوون بە تایبەتی لەگەڵ جاشەکانی گوندی ئەسپینداره و گوندی بالیسان و دەوروبەری شەقڵاوە. ئەو کاتە حزب بڕیاری شۆڕشی نەدابوو، پارە و پوولیشی نەبوو، ئەرکی ئەو هێزە لەسەر گوندەکان بوو. هێزەکە بەردەوام بوو لە کار و چالاکی. لە پاشان لە ڕۆژی ۱۹٦۱/۹/۱۱ حکومەت بۆ بڵاوە پێکردن و سەرکوتکردنی جووڵانەوەی عەشائیری لە ناوچەکانی دۆڵی خەلەکان و چنارۆك و دێگەڵە و دەربەندیخان و دەربەندی بازیان هێزی سەربازی بە پاڵپشتی تۆپخانەی گەورە و فڕۆکەی جەنگی ناردە سەریان، هەر لە هەمان ڕۆژ هێزەکەی عەشائیری بڵاوەیان کرد و چوونەوە ماڵەکانیان، ئەوەی لە مەیدانی شەڕ مابوو ئەو هێزەی سەفین بوو، ئەو هێزەش لە شەڕ و بەرگریکردندا بوو، بارەگاکانیان لە کانی شیلانەو کانی گویز بوو، لە هەموو شەڕەکان سەرکردەکان لە ریزی پێشەوەی لەشکرەکە دا بوون، بەڵام ئەوەی لەشکرەکەی کوردستانی بێزار کردبوو کەمی فیشەك و کەمی پارە و پوول بوو، ناچار بوون لە کاتی شەڕ هەموو پێشمەرگەکان قەوانە بەتاڵەکانیان کۆ بکەنەوە، وەستایەك هەبوو لە گوندی سکتان فیشەکی دادەگرتەوە، پێشمەرگەکانیش قەوانەکانی خۆیان دەبردە لای ئەو وەستایە و قەوانە بەتاڵەکانیان بۆ شەڕێکی دیکە دادەگرتنەوە. ئەو هێزە و هەردوو سەرکردە بە برسێتی و ڕوتی و بێ فیشەکی خۆیان ڕاگرت تا مانگی ۱۱ی ۱۹٦۱، بەڵام لەبەر ئەوەی تەقە لە کوردستان نەمابوو، حکومەت بۆ لەناوبردنیان هەموو گرانایی خۆی خستبووە سەر ئەو هێزەی سەفین، زستانیش بەسەردا هات،

هێزەکە لە سەرمان و لە برسان و لەبەر کەمی فیشەك ناچار بوون سەفین چۆڵ بکەن و پاشەکشەیان بۆ دەشتی بالیسان کرد، شەڕیشیان هەر لەسەر بوو. لە پاشان ئاوا بوون و چوونە دۆڵی مەلەکان. لە پاشان چینە ساوسێوەکان، لەوێندەر هێزەکە لەبەر سەرما و برسێتی پەکی کەوت. ئەو کاتە من و کاك عومەر دەبابە لە دۆڵە ڕەقە بووین، شەو بوو نامەیەکی بە پەلە لە مامۆستا شەمسەدین موفتی و مامۆستا مەلا عەولا بۆ کاك عومەر دەبابە هات، لە نامەکەدا نووسرابوو: ئەگەر فریامان نەکەون نان و پێڵاومان بۆ نەنێرن هێزەکەمان حاڵیان زۆر شڕە. هەر بەو شەوە من نامەکەم بۆ عەباس ئاغا برد، عەباس ئاغا لە گوندی سەرکەپکان بوو، نامەکەم دایە عەباس ئاغا، کە نامەکەی خوێندەوە هەر بەو شەوە چەکدارەکانی خۆی ناردە ناو گوند دوو بار نانیان کۆکردەوە لەگەڵ بارێك پێڵاو یەکسەر ڕەوانەی کرد بۆ هێزەکەی ساوسێوەکان، ئەو نان و پێڵاوانە هێزەکەی بووژاندەوە.

ئەو کاتە لە هەموو کوردستان تەقە نەمابوو حکومەت وایزانی جارێکی دیکە شۆڕش سەرهەڵناداتەوە. لە پاشان عەباس ئاغا لە ناوچەی دۆڵە ڕەقە جێگای ئەو هێزەی کردەوە و هەمووی بەسەر گوندەکاندا دابەش کردن، مامۆستا شەمسەدین و مامۆستا مەلا عەولا لە گوندی قەڵا سەیدە بوون، ئەوان لە ماڵان نەبوون. ڕۆژێك من هەندیك ئازووقەم بۆیان برد و چوومە لایان، کە چووم مامۆستا شەمسەدین خەریکی دەرمانکردنی برینەکەی حەمەدەمین گورگۆ بوو، حەمەدەمین گورگۆ لە شەڕێکدا گوولـلەیەکی بە ملی کەوتبوو. ئەو هێزە کە ژمارەیان (٢٠٠) پێشمەرگە دەبوو، زستانەکەی عەباس ئاغا و عەشیرەتەکەی بەخێوی کردن. بۆ مێژوو دەڵێم مامۆستا شەمسەدین یەکەم سەرکردە بوو چووە ناو شۆڕش و لە سەرەتای مانگی ئاب

نەك لە مانگی ئەیلوول شۆڕشی بەرپا کرد، ئەو سەرکردە خۆبەخشە کە هاتە ناو شۆڕش بە پارەی خۆی تفەنگێکی برنۆی بۆ خۆی کڕی. جا ئەگەر باسی سەرکردەکان بکەین کە هەمیشە ژیانیان لەگەڵ ژیانی پێشمەرگەدا بوو و هەردەم گیرفانیان بەتاڵ بوو، دەبێ باسی مامۆستا شەمسەدین و مام جەلالی ئەو کاتە و مامۆستا مەلا عەولّا و کاك عەلی عەسکەری و کاك عومەر دەبابە و مامۆستا عەلی عەبدوللّا بکەین. نابێ مێژوو لەبیری بکات کە شۆڕش لە سەفین سەری هەڵدا و پۆلیسی هەولێر و دانیشتوانی گوندی کاوانیان بوونە بناغەدانەری شۆڕشی ئەیلوول، لە هەندێك ناوچەدا شۆڕش زۆر درەنگ دەستی پێکرد. مامۆستا شەمسەدین لە بنەماڵەیەکی ئایینپەروەری هەرە ناوداری شاری هەولێر بوو، ئەو لە ساڵی ۱۹۳۲ لە شاری هەولێر لە قەڵاتی هەولێر لە دایك بووە، بەداخەوە لە ڕۆژی ۲۰۱۲/۹/۵ لە هەندەران بە نەخۆشی کۆچی دوایی کرد.

هەزاران ڕەحمەت لە گۆڕی مامۆستا شەمسەدین موفتی و هەموو شەهیدانی کوردستان.

***

## بیرەوەرییەکانم لەگەڵ پێشمەرگەی دێرین و مامۆستای بەتوانا و خوالێخۆشبوو ئیسماعیل محەمەد سەرهەنگ

مامۆستا ئیسماعیل بە ئەسڵ کوردی کوردستانی باکوورە، لەگەڵ سەید تەهای نەهری بە ئاوارەیی هاتوونەتە باشووری کوردستان و لە ناحیەی باتاس نیشتەجێ بوون. خوالێخۆشبوو لە ساڵی (١٩٢٠) لە دایك بووە، لە (٢٠٠٠/٢/١٩) لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کرد. مامۆستا ئیسماعیل سەرهەنگ لە بنەماڵەیەکی زانا و خوێندەوار بوو، بۆیە محەمەدەفەندی باوکی کرا بە بەڕیوەبەری ناحیەی باتاس، ئەو کاتە مامۆستا ئیسماعیل دوای تەواوکردنی خوێندن بووە بە بەڕیوەبەری قوتابخانەی هەریر، لە ساڵی ١٩٦١ هەستی کوردایەتی وای لێدەکات مووچە و مامۆستایی بەجێبهێڵێت و بچێتە ریزەکانی پێشمەرگەی شاخی سەفین و بگاتە هەڤاڵەکانی خۆی وەکو: مامۆستا مەلا عەوڵا و مامۆستا شەمسەدین موفتی و مامۆستا ئیسماعیل حوسێن و کاك حەسەن ناسر و کاك قادر حەسەن و شەهید حەمید کاوانی و شەهید مەحموود کاوانی و کاك جەلال کاوانی و مام تەها ڕەش و وەسمان حوجرانی و سەعید مەسیفی و خالید ئاژگەیی و ئەوانی دی. من ئەو کاتە لە گوندی پاشقۆتەڵ بووم. گوندی پاشقۆتەڵ لە دۆڵە ڕەقەیە و لە ناوەڕاستی مانگی ١٠ی ١٩٦١ مامۆستا ئیسماعیل سەرهەنگ بۆ بینینی برادەرەکانی سەردانی بنکەی پاشقۆتەڵی کرد، ئەو کاتە برادەرەکانی لە بنکەی پاشقۆتەڵ بوون، بەشی زۆریان ئەندامی ناوچەی ڕانیە بوون، ئەمەش ناوەکانیانە:

١–سەدیقە فەندی، لێپرسراوی بنکە"
٢–تۆفیقی مەلا سەدیقی"
٣–عەبدولڕەحمان ڕووتە"
٤–میرزا باپیر"
٥–عەزیزی فەقێ سمایلی"
٦–حەمید ڕەشاش، سەربازی فیرار"
٧–کاکۆ ئەحمەد کوردە، پۆلیسی فیرار"
٨–عەبدوللا لاوە، پۆلیسی فیرار"
٩–عەزیز بەگ، (جارویار سەردانی بنکەی دەکرد.

مامۆستا ئیسماعیل سەرهەنگ ماوەی ٨ ڕۆژ لامان مایەوە. خوالێخۆشبوو تفەنگی برنۆی کورتی هەڵدەگرت و زۆر ئاشقە راو بوو، لە ڕاوە کەو زۆر شارەزا بوو، ڕاوی بە تاپڕ و دێوجامە دەکرد. مامۆستا ئیسماعیل کەسێکی زۆر قسەخۆش و نوکتەچی و دەم بە پێکەنین و زانا بوو، زۆر جار مامۆستا عومەر دەبابە و مامۆستا مەلا عەوڵا بۆ کاری گرنگ پرس و ڕایان پێ دەکرد. کەم کەس هەبوو لەناو شۆڕش مامۆستا ئیسماعیل سەرهەنگ نەناسێت. مامۆستا لە پاش سەفەرەکەی گەڕایەوە و چوەوە سەفین. لە مانگی ١١ی ١٩٦١ لە سەرمان و لەبەر بێبەرگی و بێ پێڵاوی و کەم فیشەکی هێزی سەفین شکان و لەبەر ئەوەی بە بە ردە وامی شەڕیان لەسەر بوو لەگەڵ هێزەکانی حکومەت پاشەکشەیان کرد و سەفینیان چۆڵ کرد، ئەو کاتە هێزی پێشمەرگە کە شەڕی دەکرد قەوانەکانی خۆی کۆ دەکردنەوە و دووبارە لە لای وەستایەکی گوندی سکتان دایاندەگرتنەوە. بۆیە ناچار بوون پاشەکشە بکەن بۆ کوێستانەکانی ساوسێوەکان. ئەو جێگایە دەکەوێتە پشتی گوندی

مەلەکان، لەو جێگایەش ئەگەر عەباسی مامەند ئاغا نان و پێڵاوی بۆ نەبردبان هەموو هێزەکەی سەفین لە برسان دەمردن.من چوومە لای عەباس ئاغا و پێمگوت ئەگەر فریای ئەو هێزە نەکەویت لە برسان دەمرن، بەڵام عەباس ئاغا مەردانە نان و پێڵاوی بۆ ناردن. خوالێخۆشبوو عەریف سلێمان لە بیرەوەرییە کانی خۆیدا باس دەکات و دەڵێت لە کاتی لە ساوسێوەکان بووین ژمارەمان ١٥٠ کەس زیاتر بوو، زۆربەمان لە برسان تاقەتمان نەمابوو، بە هەموومان پارەمان کۆکردەوە، پارەی ٤ سەر بزنمان هەبوو، چوار سەر بزنمان کڕین و بۆ پێشمەرگەکان سەرمان بڕین، دەڵێت من و ئیسماعیل سەرهەنگ گۆشتمان بەبەر نەکەوت، بەڵام کاك ئیسماعیل سەرهەنگ چووە ڕاویَ (٤) کەوی کوشت، ئێمەش گۆشتمان خوارد تا نانمان بۆ هات. هەروەها دەنووسێت: لێرەدا پێویستە هەندێك باسی پیاوەتی و چاکە و کوردپەروەریی خوالێخۆشبوو (عەباس ئاغا) بکەین، عەباس ئاغا ئەوەندە چاکە و پیاوەتی زۆر بوو باسکردنی هەر تەواو نابێت، ئەو هەموو ماڵ و سەروەتی خۆی لە دیوەخان و پیاوەتیدا سەرف دەکرد، دیوەخانی عەباس ئاغا جێگای هەموو کەسێك بوو، بەشی زۆری سیاسەتمەدارانی کورد کە فەرمانی گرتنیان بۆ دەردەچو، خۆیان دەگەیاندە لای عەباس ئاغا و دەیپاراستن. هەر لە عەونی یوسف و حەمید عوسمان و عەزیز سورمێ و زۆرانی دی خۆیان لە لای عەباس ئاغا دەپارست، ئەوە جگە لە فەقیر و هەژاران.

من زۆر شارەزای عەباس ئاغا بووم، عەباس ئاغا لە کاتی شۆڕشدا هێزی پێشمەرگەی لە برسێتی رزگار کرد. هێزەکەی سەفینی لەسەر گوندەکانی خۆیدا دابەش کرد و (٣٠) پێشمەرگەشی لە دیوەخانی خۆی دانا. عەباس ئاغا هێزەکەی ئێمەی بەخێو کرد کە ژمارەمان (٢٠٠) پێشمەرگە بوو تا مام

جەلال پارەکەی ڕێگای کۆیەی گرت. ئەوە بوو زۆر بە کورتی چاکەی عەباس ئاغا.

ئێستا دەگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان، لە پاش گرتنی پارەکەی ڕێگای کۆیە لە گوندی ڕیزنە، هەموو هێزەکەمان کۆ بووینەوە، مام جەلال و کاك عومەر دەبابە دوو لق پێشمەرگەیان دروست کرد، سەرلقی یەك (مەلا عەولا) بوو" سەرلقی دووش (عەریف سلێمان) بوو، ئێمەش لەسەر لقەکان دابەشکراین، کاك ئیسماعیل سەرهەنگ وا پێویست بوو لە بارەگای گشتی بێت، من یاریدەدەری سەرپەل بووم، پەلەکەمان لە گوندی دواوە بوو. ئیسماعیل سەرهەنگ لە بارەگای گوندی بێتواتە بوو. لە مانگی ڕەمەزانی ١٩٦٢ عومەر دەبابە سەفەری کرد بۆ ناوچەی پشدەر و ئەو کەسانەی خوارەوەی لەگەڵ خۆیدا برد:

١-سەدیقەفەندی"
٢-ئیسماعیل سەرهەنگ"
٣-حەمید ڕەشاش"
٤-عەبدولڕەحمان ڕووتە"
٥-ڕەشید عومەر"
٦-مامە عەدیێ خەیلانی"
٧-میرۆ خەیلانی"
٨-ئەحمەد بارزانی.

گەشتەکەمان دوور و درێژ بوو،پاش تەواوبوونی گەشتەکەمان لە هەموو ناوچەی پشدەر، گەڕاینەوە، دوای گەڕانەوەمان مام جەلال داوای من و (٧٠) پێشمەرگەی دیکەی کرد بۆ کاری پێویست چووینە ناوچەی سلێمانی. لەو

کاتەدا من لە مامۆستا ئیسماعیل سەرهەنگ دابڕام تا ساڵی ١٩٦٤ چووینە هەمەدان، لە هەمەدان هەموومان یەکدیمان گرتەوە. لە هەمەدان مامۆستا ئیسماعیل سەرهەنگ و کاک کەریم جەوهەر و کاک عوسمان سەعید لەسەر بێتەلەکان بوون، مامۆستا ئیسماعیل سەرهەنگ ئەوەندە زیرەك و شارەزا بوو لەگەڵ کاك کەریم کلیلی هەموو شفرەکانی حکومەتیان دەکردەوە. هەموو بروسکەکانی حکومەتیان شیدەکردەوە، هەر شتێك لەناو حکومەتی عێراقیدا ڕووی دابا، مامۆستا ئیسماعیل سەرهەنگ هەموو ئێواران بروسکەکانی بە شیکراوەیی بۆ دەخوێندینەوە، واتە ڕۆژانە لە هەموو ڕوداوەکانی حکومەتی عێراق ئاگادار بووین. ئەوە بوو زیرەکی مامۆستا ئیسماعیل . لە ساڵی ١٩٦٦ لە ئێران گەڕاینەوە و دووبارە چووینەوە دۆڵە ڕەقە و لای عەباسی مامەند ئاغا لەگەڵ ئیسماعیل سەرهەنگ پێکەوە بووین، بەڵام لەبەر ناخۆشی لەیەك دابراین، لە ساڵانی هەشتاکان لەگە ڵ مامۆستا مەلا عەوڵا سەرمان لە مامۆستا ئیسماعیلدا لەماڵەکەی خۆی لە گەڕەکی شۆڕش. مامۆستا ئیسماعیل زۆر شارەزایی لە سەر گوڵی جۆراوجۆر و دارودرەختی جۆراوجۆر هەبوو و زۆر جۆر گوڵی کێویلکەی لەناو باخچەکەی خۆی چاندبوون. مامۆستا ئیسماعیل لە کاتی پێشمەرگایەتیدا زۆر دەستپاك و دەروونپاك بوو هەموو سەرکردەکان و پێشمەرگەکان ڕێز و حورمەتیان لیدەنا، من هیوادارم منداڵەکانی ڕێچکەی باوکیان بگرنەوە و ئەو ڕێزلێنانە بپارێزن. کورد دەڵێ: مزگەوت ڕووخاوە، میحرابی ماوە.

ئەوە بوو کورتە یادەوەرییێك دەربارەی خەباتی ئەو قارەمانە، هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی بێت.

(تێبینی: مامۆستا عەبدولوەهاب شێخانی دەڵێ: پێش شۆڕشی ئەیلوول ئەمن لە ڕانیە مامۆستا بووم، خەڵکی ڕانیە باسی مامۆستا ئیسماعیل (سەرهەنگ)یان دەکرد، دەیانگوت لە رانیە مامۆستا بوو ئەوەندە دارودرەختی دەچاند، دارودرەختەکان هێشتا ماون و هەر بە ناوی مامۆستا ئیسماعیل ناسراون.)

***

## بیرەوەرییەکانم لەگەڵ هەڤاڵی دێرینم، پێشمەرگەری دێرین و قارەمانی گەلەکەمان شەهید عوسمان بەکر

لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٨ بوو کە لەسەر داوای خۆم لە فەوجی ٣ی لیوای ٥ی مووسڵ گوازرامەوە بۆ فەوجی ٣ی لیوای ٣ی هەولێر. لە سریەی چوارەم بووم. ئەو کاتە هەڤاڵ عوسمان بەکریش لە سریەی چوار بوو، ئەودەم من و کاک عوسمان بەکر یەکدیمان ناسی، ناسینەکەمان لە ڕێگای حزبەوە بوو. ئەو کاتە من پلەی سەربازیم نائیب عەریف بوو، هەڤاڵ عوسمان جوندی ئەوەل بوو. ئەو ناسین و برایەتییەی ئێمە بەردەوام بوو بەبێدابڕان و هەردووکمان ئەندامی حزب بووین، بەڵام من هەندێك بەرپرسیارەتیم زیاتر بوو، لە ڕووی کاری حزبایەتیی ناو فەوجەکە.

کاک عوسمان ئەندامێکی کارا و چاونەترس و زیرەکبوو، من و کاک عوسمان لەناو فەوجەکە ڕۆژانە یەکدیمان دەدیت، تا ساڵی ١٩٦١ ئەو کاتەی جووڵانەوەی عەشائیری دەستیپێکردو لە ڕۆژی ١٩٦١/٩/١١ فەوجەکەمان چووە شاری کۆیە، لە ڕۆژی ١٩٦١/٩/١٤ بەشێك لە فەوجەکەمان چووینە شاری ڕانیە و لە بناری کێوەڕەش لەگەڵ لەشکری عەشائیری تووشی شەڕ بووین، ئەو شەڕە دوو ڕۆژ بەردەوام بوو. ئەوە بوو من لە ڕۆژی ١٩٦١/٩/١٦ خۆم و ڕەشاشەکەم چوومە ناو ڕیزەکانی پێشمەرگە، واتە لە ڕۆژی ١٩٦١/٩/١٦ من و هەڤاڵ عوسمان بەکر لەیەکدی دابڕاین، نەکە هەر لەگەڵ کاک عوسمان، بەڵکو لە هەموو هەڤاڵەکانم دابڕام، جا ئەو دابڕانە درێژەی

کێشا تا ساڵی ١٩٦٣، ئەو کاتە کاک عوسمانیش لەگەڵ ٥٨ عەریف و نائیب عەریفی فەوجەکە بە یەکەوە هاتنە ناو شۆڕش. ئەو کاتە من لە بارەگای مەکتەبی سیاسی بووم لە گوندی مالومە، کاک عوسمان و هەڤاڵانی ئەوانیش هاتنە گوندی مالومە و هەر لە گوندی مالومە من و کاک عوسمان و هەڤاڵەکانی دی بە دیداری یەکدی شاد بووینەوە. لە پاشان بە هۆی کاری پێشمەرگایەتییەوە دیسان لە یەکدی دابڕاین، کاک عوسمان کەوتە لای دەشتی کۆیە و منیش لە شارباژێڕ بووم لەگەڵ بەڕێز مام جەلال. ساڵی ١٩٦٤ لە کاتی ڕێککەوتنەکەی بارزانی لەگەڵ حکومەتی بەغدا ئەو کاتە مەلا مستەفا لە ڕانیە بوو، من لەگەڵ ئەندامانی مەکتەبی سیاسی چووینە ڕانیە بۆ لای بارزانی، ئەو کاتە دووبەرەکییەکە بە توندی سەری هەڵدابوو، هەر ئەوەندەی مابوو شەڕی براکوژی دەستپێبکات. من دەمزانی کاک عوسمان بەکر سەرپەلە و لە گوندی دۆنداوە و دەشمزانی کاک عوسمان و پەلەکەی بە بیروباوەڕ لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسین، بەڵام نازانن چۆن و بە چ ڕێگایەك بێنە ناو ڕیزەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی. من لەو کاتە ناسك و مەترسیدارەدا داوام لە مام جەلال کرد و پێمگوت من دەچم بۆ لای عوسمان بەکر و ڕیوشوێنیان بۆ دیاری دەکەم بۆ هاتنیان بۆ ناو هێزەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی. مام جەلال: گوتی زۆر باشە و برۆ. ئەوە بوو من بە تەنیا بەڕێکەوتم بۆ لای کاک عوسمان، تا من گەیشتمە لای کاک عوسمان، بەیانەکەی بارزانی دەرچووبوو و بەسەر هەموو هێزەکانی پێشمەرگەدا دابەشکرابوو. لە بەیانەکەی بارزانیدا وا نووسرابوو لە هەر جێگایەك تووشی کەسێکی سەر بە باڵی مەکتەبی سیاسی ببن یەکسەر بە بێ سێ و دوو بیکوژن و گوللەبارانی بکەن، جا ئەمە ئەو ڕۆژە بوو کە من چوومە لای کاک عوسمان. کاک عوسمان

هەر لە دوورەوە گوتی ئەوە جەلالییەك بە پێی خۆی هات، ئێستا دەیكوژین. لەگەڵ كاك عوسمان و پێشمەرگەكان چاكوخۆشیمان كرد و لە پاشان كاك عوسمان بەیانەكەی دامێ و بەیانەكەم خوێندەوە، ئەگەر بە پێی بەیانەكە بایە دەبا من بكوژن. كاك عوسمان بۆ نانخواردنی ئێوارێ گیسكەكی سەر بڕی و شەوەكەی لەگەڵ كاك عوسمان و جێگرەكەی محەمەد تەها كۆبوومەوە و ڕێگا و شوێنم بۆ دیاریكردن كە چۆن خۆیان بگەیننە لای مەكتەبی سیاسی. شەو لای كاك عوسمان مامەوە و بۆ بەیانی بە ڕەزالەت و بە شێوەیەكی نهێنی خۆم گەیاندەوە لای مام جەلال لە گوندی سەرگەڵو.

كاك عوسمان دەرفەتی بۆ ڕێكنەكەوت بێتە لامان لە كاتێكدا كاك عوسمان و پەلەكەی هاتنە ناو هێزی باڵی مەكتەبی سیاسی كە گەرمە گەرمەی شەڕی براكوژی بوو لە شاخی سووركێو. لەو ڕۆژە ناخۆشەدا من و كاك عوسمان بە دیداری یەكدی شاد بووینەوە. لە پاشان لە مانگی ٨ی ١٩٦٤ چوینە هەمەدان و لە ساڵی ١٩٦٦ گەڕاینەوە كوردستان و لە پاش گەڕانەوەمان دیسان لە یەكدی دابڕاین، جارێكی دیكە لە ساڵی ١٩٦٧ لە شاری قەڵادزە یەكدیمان گرتەوە. پاشان بەماڵەوە چووینە بەكرەجۆ لە هێزی ڕزگاری لەگەڵ مام جەلال بووین.

كاك عوسمان پێشمەرگەیەكی كوردپەروەر و بوێر بوو، لە گوللەی دوژمن نەدەترسا. كاك عوسمان بەر لە شەهیدبوونی دوو جار لە شەڕەكاندا بریندار بوو. لە شەڕی كرژە سەركەوتنێكی زۆر گەورەی تۆمار كرد، بۆیە خۆشەویستی مام جەلال بوو. كاك عوسمان پێشمەرگەیەكی زۆر بێباك و سەرەڕۆ بوو، بەر لەوەی بگوازرێتەوە بۆ هەولێر، بەڕێز مام جەلال بە منی گوت كاك عوسمان سەرەڕۆیە، من دەزانم بە قسەی تۆ دەكات هەندێك

ئامۆژگاری بکە، من زۆر دەترسم ئەم قارەمانەمان لە دەستبچێت. من لەسەر داوای مام جەلال زۆر ئامۆژگاری کاک (عوسمان)م کرد کە ئاگای لە خۆی بێت و ئاوا بێباك نەبیت، هەروەها داواشم لێکرد نەچیتە هەولێر، هەر لێرە بمێنێتەوە باشترە، بەڵام کاك عوسمان بە قسەی ئێمەی نەکرد و هەر لەسەر بێباکییەکەی خۆی بەردەوام بوو و چووە هەولێریش. کاك عوسمان بەکر هەر بەهۆی ئەو چاونەترسی و بێباکییەی بەداخەوە لە مانگی ٨دا لە گەڕەکی تەیراوە لە شاری هەولێر کەوتە بۆسەی نەیاران و شەهید کرا.

***

# قادر خەبات بەر لەوەی پێشمەرگەی شۆڕشی نوێ بێ
# پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول و هەمەدان ـ یش بوو

حەیف سەد مخابن ئەو شووره گەورەیەی بەڕێز (مام جەلال) لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلوول دایمەزراندبوو، بەداخەوە ناوە ناوە بەردێکی گەورەی لەبەردەردێت و کەلەنێکی گەورەی لێپەیدا دەبێت، خۆ ئەو کەلەنانەش بە ئاسانی پڕ نابنەوە و ئەو کەسەی ئەو شووره گەورەیەی بنیاتنا بەداخەوە خۆشی نەخۆشە و وا لە هە ندەرانە.

لە شەوی ٩/٣٠ کاتژمێر (١٠)ی شەو بوو لە کەناڵی گەلی کوردستان هەواڵی کۆچی دوایی شۆڕەسوارەکەی ناوچەی باڵەکایەتی بڵاو کردەوە، ئەویش هەڤاڵی دێرینم، پێشمەرگەی ناوداری کوردستان قادر حاجی محەمەد ناسراو بە (قادر خەبات) بوو، من بەو هەواڵە زۆر دڵتەنگ بووم. دوای ماوەیەك دامان، ئەو ڕۆژانەم وەبیر هاتنەوە کە سەردەمانێك من و قادر خەبات پێکەوە لە سەنگەری بەرگریدابووین، ڕۆژانی سەرەتای شۆڕشی ئەیلوولم وەبیر هاتنەوە، بەشی زۆرمان گەنج بووین لەگەڵ بەڕێز مام جەلالدا پێشمەرگە بووین و واماندەزانی کوردستان ڕزگار دەکەین، ئێستاش وا تەمەن گەورە بوو و نەخۆشی بەرۆکی گرتووین و لەولاش مردنە برا گەورەکەمان ناوە ناوە سواری سەر ملی یەکێکمان دەبێ و لە یەکمان دوور دەخاتەوە، بەڵام لە پاش مردنیش دڵمان بەوە خۆشە دەڵێین ئۆخەی خۆ تێر خزمەتی گەل و وڵاتی خۆمان کرد. جا ڕاستییەکەی قادر خەبات یەکێك بوو لەوانەی تا

مردن خزمەتی نیشتمانی خۆی کرد. ئەو شۆڕە سوارە نە سەرمایەدار بوو نە سەرۆك عەشیرەت، کوڕە جووتیارێکی کراش خواری ناوچەی باڵەکایەتی بوو. بە ئازایەتی و قارەمانێتی و هەستێکی پاکی کوردایەتی و دەست و قامی خۆیەوە، خۆی گەیاندە ئەو پلە و پایە پیرۆزە، ئەوە شانازییە کە قادر خەبات چ لە شۆڕشی ئەیلوول و چ لە شۆڕشی نوێشدا خۆشەویستیی سەرکردەکان بوو، بە تایبەت مام جەلال. قادر خەبات لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلوول لە هێزی باڵەکایەتی بوو، لە ساڵی ١٩٦٤ گوازرایەوە بۆ لقەکەی عەریف سلێمان. ئەو کاتە منیش هەر لە هەمان لق بووم. من باسی ئازایەتیی ئەو قارەمانە ناکەم، چونکە زۆر کەس دەیناسیّ و باسەکەش دوور و درێژە. من باسی یەك شەڕ دەکەم، لە ساڵی ١٩٦٤ جارێك تووشی شەڕێکی زۆر گەورە بووین، لە کاتی شەڕەکە من و قادر خەبات لە یەکدی نزیك بووین. قادر خەبات لە کاتی گەرمە گەرمەی شەڕەکە سروودی خوالێخۆشبوو خالید دلێری دەگوت: (پێشمەرگەی بەهەڵمەتین)، جاروباریش بە زەردەخەنەوە قسەی لەگەڵ مندا دەکرد.

ئەو ڕۆژەم لە بیر ناچێت قادر خەبات تفەنگێکی زۆر خراپی هەبوو، قەوانی نەدەدایەوە، کە تەقەی پێدەکرد بە شیشکە تفەنگ قەوانەکەی دەردەهێنا. ئێمە لە پاش ڕێککەوتنەکەی ساڵی ١٩٦٤ ژمارەمان زۆر کەمی کردەوە، واتە پێشمەرگەمان زۆر کەمبوەوە. هەر پەل و (١٠-١٢) پێشمەرگەی مابووەوە، پەلەکەی ئێمە ١٢ پێشمەرگە مابووین، ئەمەش ناوەکانیانە:

١-حەمید ڕەشاش" ٢- قادر خەبات" ٣-عەلی حاجی قادر" ٤-سەید مستەفا گۆمەشینی" ٥-وەستا ڕەحمان" ٦-عەبدوڵڵا مامە" ٧-جەوهەر محەمەد" ٨-بەکر خۆشناو" ٩- غازی عەلی" ١٠- جەعفەر عەبدولواحید"

١١- کەریم عەلی مەرزانی" ١٢- عەونی عەلی. ئێمە ئەو کۆمەڵە پێشمەرگەیە ئەو ماوەیەی لە ئێران بووین وەکو برا بووین، دوای گەڕانەوەمان لە دۆلە رەقە کاك قادر خەبات سەردانی ماڵەوەی کرد، پاش گەڕانەوەی کاك قادر گوتی باوکم زۆر پیر بووە، توانای کاسبی نەماوە، ماوەیەك دەچم یارمەتی باوکم دەدەم. کەواتە قادر خەبات خەمخۆری ماڵی خۆشی بوو، وەکو وەفاداری هەر لەبەر ئەو وەفادارییەش بوو کاك قادر لە ئێمە دابڕا. ئێمە زۆر باش دەمانزانی قادر خەبات بە بێ خەبات و پێشمەرگایەتی ناتوانێت. هەر لەبەر ئەوەشبوو قادر خەبات لە پاش ئاش بەتاڵ و لە سەرەتای سەرهەڵدانی شۆڕشی نوێ، خۆی و چەند خزمێکی خۆی بوونە یەکەم مەفرەزەی چەکداری شۆڕشی نوێ. جا ئەو شۆڕە سوارەی کە ناوی قادر خەبات بوو خۆشەویستی بەڕێز مام جەلال، لەناو کوورەی خەباتی کوردایەتیدا قاڵبوەوەو لە ڕێی ئازادی گەلەکەیدا سەربەرزانە خەباتی کرد و نازناوی خەباتی بە هەوڵ و خەباتی خۆی بەدەست هێنا.

لە کۆتاییدا هەر ئەوەندە دەسەڵاتم هەیە دەڵێم هەزاران ڕەحمەت لە گۆڕەکەت بێت هەڤاڵی دێرینم، لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزم بۆ منداڵەکانی.

***

## چەند یادەوەرییەك لەگەڵ پێشمەرگەی دێرین
## خوالێخۆشبوو حاجی جەلال کاوانی

جەلال ڕەسووڵ وسو، ناسراو بە (جەلال کاوانی) لە ساڵی ۱۹۲۹ لە گوندی کاوانیان لە دایك بووە، هەر لە سەرەتای لاوییەوە لەگەڵ خزمانی: (حەمید کاوانی و مام وسو کاوانی و مەحموود کاوانی) پەیوەندی بە حزبی هیواوە دەکەن، دواتر لە ساڵی ۱۹۵۲ دەچنە ناو ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان، ساڵی (۱۹۵۸-۱۹۵۹) لەگەڵ کۆمەڵێك لە هەڤاڵەکانی لەلایەن حکومەتەوە دەستگیر دەکرێت. لە سەرەتای هاوینی ساڵی ۱۹٦۱ پێش ئەوەی شۆڕشی ئەیلوول دەستپێبکات لەگەڵ خزمەکانی: حەمید کاوانی و مەحموود کاوانی و مام وسو کاوانی و حوسێن کاوانی و مورشید کاوانی و فەتاح کاوانی و وەسمان حوجرانی و مام تەها کاوانی و قادر حەسەن و کاك حەسەن ناسراو بە مامۆستا ئیسماعیل حوسێن و کاك سەدیق هیرانی و عەزیزی فاتە قەڵەوپێ و وەستا شێخ محەمەدی شەقڵاوەیی، مەفرەزەیەکی چەکدار بە سەرپەرشتی مامۆستا مەلا عەوڵا ناسراو بە (مەلا ماتۆڕ) و مامۆستا شەمسەدین موفتی ڕێك دەخەن.

هەر ئەو مەفرەزە چەکدارە بووە بناغەی شۆڕشی ئەیلوول و لە شاخی سەفینەوە شۆڕش گەشەی کرد و پڕوشکی هەموو ناوچەکانی کوردستانی گرتەوە، بە ناوچەی بادینانیشەوە. ئەوە مێژووە. هەر ئەو مەفرەزە چەکدارە بووە هێزێکی (۲۰۰) کەسی و حکومەتیان بێزار کردبوو. لە مانگی ۱۱ی ۱۹٦۱

هێزی سەفین هاتە دۆڵە ڕەقە، لە ڕەمەزانی ساڵی ١٩٦٢ بەشێك لە هێزی سەفین، لەسەر داوای بەڕێز مام جەلال چوونە ناوچەی سلێمانی، بە تایبەتی کاوانییەکان، ئەو کات من یاریدەدەری شەهید حەمید کاوانی بووم. خوا لێخۆشبوو جەلال کاوانی و شەهید حەمید کاوانی ڕۆڵی بەرچاویان هەبوو لە ڕزگارکردنی قەزای چوارتا و ناوچەی شاربازێر و قەزای پێنجوێن. کاوانییەکان لەو شەڕانەدا چەند شەهیدیان هەبوو، وەکو: شەهید حەمید کاوانی، شەهید کاکۆل سەعید. هەردووکیان لە گوندی تەگەران شەهید بوون. ساڵی ١٩٦٢ خوالێخۆشبوو جەلال کاوانی جگە لەوەی کە پێشمەرگەیەکی قارەمان بوو، کەسایەتییێکی ناسراویش بوو لەناو شۆڕش وەکو ریشسپی دەوری ئاشتەوایی دەگێڕا و لەگەڵ ئەو کردەوە باشانەشی وەستایەکی زۆر باشبوو. هەموو جۆرە چەکێکی چاك دەکردەوە. خوالێخۆشبوو خۆی و براکانی پێشمەرگە بوون. کاك جەلال و کاوانییەکان لە کاتی شۆڕشی ئەیلوول بەشی زۆریان بە ماڵەوە هەر دەربەدەر بوون. من دەزانم سەردەمێك لە ناوچەی پشدەر لە گوندی گەناو و باوزێ بوون، ماوەیەك لە بەکرەجۆ بوون، هەروەها کاك جەلال و بەشیك لە کاوانییەکان لە (~~٢٠٠٦~~ ١٩٩٦)یش ئاوارەی سلێمانی بوون. ئەوان لە شۆڕشی نوێشدا شەهیدیان دا وەکو: شەهید تەحسین کاوانی.

خوالێخۆشبوو جەلال کاوانی لە پاش مردنیدا مێژوویێکی پڕ لە سەروەری لە دوای خۆیدا بۆ گەلەکەی و منداڵەکانی بەجێهێشت و منداڵەکانیشی پەروەردەی ئەو باوکەن، بۆیە لە ڕێبازی کوردایەتیدا بەردەوامن.

بەداخەوە ئەو قارەمانە لە ٢٠١١/١٢/١٥ کۆچی دوایی کرد، هەر لە گوندی کاوانیان. هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی بێت.

ئەمە بەشێك بوو لە خەباتی ئەو پیاوە سەربەرزە، هیوادارم جێگای ڕەزامەندیی هەمووان بێت.

## هەزاران ڕەحمەت لە گۆڕی هەڤاڵی دێرین، پێشمەرگەی سەرەتای شۆڕشی ئەیلوول مامۆستای کوردایەتی هەڤاڵ مەلا مووسا بێت

کورتە باسێك دەربارەی ڕابردووی پێشمەرگەی ڕاستەقینەی شۆڕشی کوردستان، هەڤاڵی نەمر مەلا مووسا. ئەو خەڵکی باکووری کوردستان بوو، بۆ خوێندنی ئایینی هاتبووە باشووری کوردستان و دێتە شاری هەولێر، لە مزگەوتێك لە مزگەوتەکانی هەولێر دەخوێنێت. لە سەرژمێرییەکەی ساڵی ١٩٥٧ لە هەمان مزگەوت ناوی خۆی تۆمار دەکات و لە خوێندنەکەیدا بەردەوام دەبێت. هەر بۆ خوێندن دەچێتە چەمچەماڵ و لە یەکێك لە مزگەوتەکانی چەمچەماڵ دەبێتە مەلا. لە هەمان کاتیشدا ئەندامی پارتی دەبێت. لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلوول مزگەوت بەجێدێڵێت و دەچێتە ناو ڕیزەکانی پێشمەرگە، لە بنکەی خاڵخاڵان لەگەڵ هەڤاڵ عادل عیزەت دەبێتە لێپرسراوی ئازووقە، لەبەر ئەوەی ئەوەندە دەستپاك و دڵسۆز دەبێت و زۆر دەستکراوە نابێت و ماڵی حزب دەپارێزێت نازناوی (مەلا نینە)ی بەسەردا دەبڕێت. مەلا نینە لەلای هەموو پێشمەرگە دێرینەکاندا ناوبانگی هەیە و ناسراوە، لەلای سەرکردەکانیشدا ناسراوە. ساڵی ١٩٦٤ لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسیدا هاتە هەمەدان. لە پاش گەڕانەوەمان لە ئێران لە دۆڵە ڕەقە لێپرسراوی ئازووقە بوو لەهێزەکەی خۆمان لە قەڵا سەیدە. ساڵی ١٩٦٧ من و مەلا مووسا و چەند پێشمەرگەیەك بە فەرمانی حزب لە گوندی سەرکەپکان لای عەباسی مامەند ئاغا بووین، هەر لە هەمان ساڵ مەلا مووسا بە دەستی

پێشمەرگەیەکی پارتی سەر بەهێزەکانی مەلا عەولاّ بارزانی بە ناوی ئەحمەد سەمینۆف بریندار کرا، لەبەر برینەکەی من بردمە نەخۆشخانەی کەرکوک. مەلا مووسا چاك بوەوەو لە پاشان چووینەوە ناو هێزەکەی خۆمان لە قەلاّدزێ، سالّی ١٩٦٨ چووینە بەکرەجۆ، مەلا مووسا بووە ئەندامی ناوچەی پێشمەرگە، هەر لە بەکرەجۆ ژنمان بۆ هێنا، ئەو کاتە هەر پێشمەرگەیەك ژنی هێنابا مام جەلال تەنەکەیەك ڕۆن و فەردەیەك برنجی دەدایە.

لە سالّی ١٩٧٠ پاش بەیانی ١١ی ئازار، هێزەکانی م.س بلاّوەیانکردو ئێمەش گەڕاینەوە سەر کاری پێشووی خۆمان، هەموومان لە بەغدا بووین، مەلا مووسا ناسنامە و ڕەگەزنامەی عێراقی نەبوو، من لەگەلّی چوومە هەولێر و ناوەکەیمان دۆزیەوە کە لەسەرژمێری ١٩٥٧ تۆمار کرابوو، هەر لە هەولێر ناسنامەم بۆ دەرهێنا واتە (دەفتەر نفوس)، لە بەغداش بە هۆی کاك حەمەدەمین فەرەج ڕەگەزنامەی عێراقیمان بۆ دەرهێنا و لە شەریکەی نەوت بە کرێکار دامەزرا، پاشان گوزرایەوە بۆ سلێمانی.

ئەو پیاوە کە خۆی خەلّکی باکووری کوردستان بوو، کەسێکی زۆر دلّسۆز و کوردپەروەر بوو. لەو کاتەوەی من مەلا مووسا دەناسم تا مردیش لە ڕێبازی کوردایەتی لای نەدا، وەکو پێشمەرگەی دێرینیش حسابی بۆ نەکراوە، خۆیشی داوای نەکردووە و لە سەر بیروباوەڕەکەشی سارد نەبووەتەوە. من و مامۆستا عەبدولرەقیب زۆر دۆستی مەلا مووسا بووین، قەت و قەت مەلا مووسا لە بیر ناکەین، بەلاّم لەگەلّ مردندا دەسەلاّت نییە.

ئەمە کورتە باسێکی زۆر کورتبوو بۆ منداڵەکانی.

***

# عەریف سلێمان پێشمەرگەی ناوداری گەلەكەمان

پێشمەرگەی ناوداری گەلەكەمان، دووەم سەرلقی پێشمەرگەی سەرەتای شۆڕشی ئەیلوول كاك عەریف سلێمان، لە ڕۆژی ٢٠١٠/٧/٦ بە نەخۆشی شێرپەنجە كۆچی دواییكرد و ماڵاوایی لە كەس و كار و هاوخەبات و هاوسەنگەرەكانی كرد و لە ڕێوڕەسمێكی پڕ لە خەم و پەژارە بە ئامادەبوونی بەڕێز مامۆستا عەدنان موفتی و مامۆستا سەعدی پیرە و لێپرسراوی مەڵبەندەكان و لێپرسراوی ناوەندی كۆمەڵایەتی هەولێر و ناوەندەكانی دەورووبەر و جەماوەرێكی زۆری شاری هەولێری خۆشەویست تەرمی پیرۆزی لە گۆڕستانی براغ بە خاكی نیشتمان سپێردرا، هەزاران ڕەحمەت لە گۆڕەكەی بێت.

ڕاستە عەریف سلێمان كۆچی دواییكرد، بەڵام خەرمانێكی گەورەی سەروەری و خەبات و بیروباوەڕی كوردایەتی بۆمان بەجێهێشتووە كە جێگای شانازییە. عەریف سلێمان خاوەن ماڵ و سەروەت و قەسرو سەیارەی باش نەبوو، خاوەن خەبات و سەروەری و كوردایەتیی ڕاستەقینەی پاكبوو. عەریف سلێمان خاوەنی بیروباوەڕ و دەروێشی كوردایەتی بوو. پلە عەریفییەكەی خۆی بە هەزار پلە و پایەی گەورە نەدەدا، هەر بەناوی عەریفی خۆشەویست و ناسراو بوو. لەو كاتەوەی من كاك سلێمان دەناسم تا كۆچی دوایی كرد هەر هەژار بوو، بەڵام هەردەم خۆی بە فەقیر نەدەزانی، هەر خۆی بە دەوڵەمەند دەزانی. بەداخەوە پێشی نەخۆش بكەوێت نە خۆی دەیزانی نە

خۆشە و نە ئێمەش دەمانزانی تا برادەرە خۆشەویستەکانی دکتۆر حەسەن ئیسماعیل و دکتۆر حوسێن ئیسماعیل لە ئەنجامی پشکنینێکی زۆر لە تاقیگەیەکی دکتۆر حوسێن، بۆیان کرد دەرکەوت کاک سلێمان نەخۆشی کاری تێکردووە و چابوونەوەی ئاسان نییە، ناردیانە نەخۆشخانە، ئەوەی پێویستبوو بۆ نەخۆشییەکە بۆیانکرد، بەڵام نەخۆشیەکە هەموو لەشی داگرتبوو، کاک سلێمان ورەی زۆر بەرز بوو، دەیگوت من لە مردن ناترسم. مامۆستا عەدنان موفتی لە سلێمانی تەلەفۆنی بۆ مامۆستا مەلا محەمەد بەحرکەیی کرد و گوتی عەریف سلێمان ببەنە باشترین نەخۆشخانە و باشترین دکتۆری تایبەتی بۆ بێنن، هەر لە پاش تەلەفۆنەکە من و مامۆستا مەلا محەمەد بەحرکەیی و کاک عەلی خزمی کاک عەدنان، دکتۆری تایبەتمان بردە ماڵەکەی، دکتۆرەکە تەماشای ئەشیعە و فەحسەکانی کرد زانی کار لە کار ترازاوە، لەگەڵ ئەوەشدا بردمانە نەخۆشخانەی سەردەمی تایبەت، ماوەی ٣ رۆژ مایەوە، دکتۆرەکان دەیانزانی چابوونەوەی نییە، گوتیان بیبەنەوە ماڵێ، بەو هەوڵدانەی بەڕێز کاک عەدنان، عەریف سلێمان زۆر خۆشحاڵبوو، بە منی گوت حەمید گیان وا دیارە حزب وازی لە من نەهێناوە، منیش هەندێك دڵم دایەوە.

عەریف سلێمان ئەوەندە خەباتی زۆرە، پیاو نازانێت لە کوێوە دەست پێبکات. کاک سلێمان بەشێکی لە خەباتی سیاسی و پێشمەرگایەتی لە کتێبێکی دەنگەوە بۆ گوڵە گەنمەکان لە پاش خۆی بەجێهێشتووە کە پڕە لە مێژووی شۆڕشی ئەیلوول و لە خەباتی ڕاستەقینە، ئەو بیرەوەرییە بەشی یەکەمە و بەشی دووەمی ماوە، هیوادارم منداڵەکانی نەیفەوتێنن. منیش وەکو پێشمەرگەی دێرینی شۆڕشی ئەیلوول کاک (سلێمان)م هەر بە سەر لقی

خۆم دەزانی و زۆریش شارەزای خەباتی ئەو قارەمانەم. بە پێویستی سەر شانی خۆمی دەزانم هەندێك زانیاریتان لەبارەی خەباتی ئەو شۆڕە سوارەوە پێشكەش بكەم:

عەریف سلێمان لە ساڵی ١٩٢٨ لە گوندی مەلا ئۆمەر لە دایكبوە، پلەی خوێندەواری لە حوجرە فێری خوێندەواری بووە. ساڵی ١٩٥٠ چووەتە ریزی حزب، لە مانگی ٨ی ساڵی ١٩٦١، پێش شۆڕشی ئەیلوول دەستپێبكات لەگەڵ ٣ پۆلیسی قارەمان بە فەرمانی حزب چوونە شاخ و پاڵ چەكدارەكانی سەفین كە ئەو كاتەی كاوانییەكان لەوێ بوون، پێشمەرگە ناودارەكانی وەكو: مامۆستا ئیسماعیل حوسێن و كاك حەسەن ناسر، كاك حەسەن ناسر كەسایەتیی ناوداری شەقڵاوەیە و ئێستا لە شەقڵاوەیە. كاك سلێمان لە سەرەتای مانگی ٩ی ١٩٦١ لەگەڵ شەهید حەمید كاوانی دەوری مەخفەری دەربەندی گۆمەسپانیان گرت، لە ڕۆژی ١٩٦١/٩/١١ حكومەتی عێراق بە فڕۆكە زۆر بە توندی بوردومانی هێزەكەی دەربەندی كرد، لە پاشان گەڕانەوە سەفین، ئەو هێزەی سەفین لەبەر بێ فیشەكی و هەردەم لەشەڕدابوون هاتنە دۆڵە ڕەقە لای عەباسی مامەند ئاغا. لە كاتی دامەزرانی تەشكیلاتی پێشمەرگە كە ئەو كاتە هەموو هێزی پێشمەرگەی ناوچەی سۆران دوو لق بوو، عەریف سلێمان سەرلقی دوو بوو. ساڵی ١٩٦٤ بەهۆی شەڕی براكوژییەوە چووینە ئێران– هەمەدان، لە پاش گەڕانەوەمان لە ئێران، عەریف سلێمان هەر سەرلق بوو، لە كاتی شەڕەكان هەر لایەك پێویستیان بە هێز هەبایە، لقەكەی عەریف سلێمان دەگەیشتە ئەوێ. ماوەیەك لقەكەی عەریف سلێمان چووە ناوچەی دوزخورماتوو، چوونە گوندی قەواڵی و گوندی زەردەلیكاو. لە ساڵی ١٩٧٠ پاش بەیانی ١١ی ئازار، هەموومان گەڕاینەوە

سەر کاری پێشوومان. کاک سلێمان مفەوەز بوو لە بەغدا. هەر لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی نوێی یەکێتی، کاک سلێمان هاتەوە ناو کۆڕی خەبات. کاک سلێمان ماوەیەکی زۆر ئاوارە بوو لە سلێمانی، لە پاشان توانی خانوێکی ١٠٠ مەتری بکڕێت لە هەولێر تا لەسەرخۆ بوو هەر بە سواری پاسەکان سەردانی برادەرانی خۆی دەکرد، لە بەشی زۆری پرسەکاندا بەشدار دەبوو. کاک سلێمان ئەوەندەی چاکەی چاندووە بەشی منداڵەکانیشی دەکات، ئەو هەموو جەماوەرەی بەشداری ناشتن و پرسەی عەریف سلێمان بوون بە تایبەت پێشمەرگە دێرینەکان، ئەوە نیشانەی وەفاداری خەباتی خۆی بوو، وادیارە خەڵکی کوردستان رێز لە کەسانی خاوەن خەباتی وەکو عەریف سلێمان دەگرن.

ئەمە کورتەباسێك بوو لە سەروەرییەکانی عەریف سلێمان. داوای لێبوردن دەکەم لە کەموکورتییەکان سەبارەت بە نووسین.

## مام حەمید رەشاش بەم شێوەیە باس لە مێژووی خەباتی مەلا عەولای حاجی سمایل دەکا

مامۆستا مەلا عەولا ئیسماعیل ناسراو بە (مەلا ماتۆڕ) پێشەنگی شۆڕشگێران بوو، مامۆستا مەلا عەولا کوڕە جوتیارێکی دەشتی هەولێر بوو ، کوڕی حاجی سمایل تاژدین بوو، وەکو خۆی باسی دەکرد ، پیاوێکی دیندار بوو ، بەلاَم زۆر دوژمنی ئاغاکان بووە ، مامۆستا مەلا عەولا لە حوجرەی فەقێیان فێری خوێندەواری بووەو بووە بەفەقێ ، وەکو براکانی مامۆستا بۆمن باسیان کردووە مەلا عەولا هەرلەکاتی مندالّیەوە زیرەك و بزۆز بووە ، مەلا عەولا وەکو کوڕە فەلاحێك ، زۆر هەڵکشان و داکشانی بینیووە و ، زۆریش بیر تیژبووە ، لە بواری کلتورو و نەریتی کوردەواری دا .

کە شەمەندەفەر هاتە هەولێر ماوەیەك مەلا عەولا بووە کرێکاری سکەی شەمەندەفەر ، لە سەرەتای سالّی پەنجاکان لە رێی مەلا نوری ئۆمەراوەیی دەچێتە ناو رێکخستنەکانی پارتی و دواتریش پەیوەندی بە عەونی یوسفەوە دەکات ، مەلا عەولا لەبەر زیرەکی و دلّسۆزی لەکاری حزیایەتی زوو دەبێنە باوەڕپێکراو و دەبێتە کادیرێکی چالاکی دەشتی هەولێر ، لەگەلّ هەڤالّەکانی لەمانە: (سالّح شێرەو مەولود رۆژباش و کەریم عارەب) ئەو پیاوە دلّسۆزە بۆ راپەراندنی ئیش و کارەکانی حیزبایەتی کۆنە پایسکلێك دەکڕی هاتوو چۆی گوندەکانی دەشتی هەولێری پێ دەکات لە پاشان حیزب ٣٠ دیناری دەداتێ بۆ ئەوەی ماتۆڕێکی پێ بکرێت ، رۆژێك دەچێتە شاری

کەرکوک لەوێ ماتۆرێك بە ٥٠ دینار دەکڕێ ، هەر چەندە مامۆستا هەر ٣٠ دیناری پێ دەبێت بەڵام کابرای فرۆشیار پیاوێکی چاك دەبێت ، رازی دەبێت بەوەی بە دوومانگ ٢٠ دینارەکەی تری بە قەرز پێ بداتەوە ، ئیتر لەدوای ئەوە بەو ماتۆڕە سەردانی رێکخستنەکانی گوندەکان دەکات ، سالح شێرەش لەگەل خۆی سواری ماتۆڕەکە دەکا ، زۆر جاریش (خەجەی) خێزانی لە پشتەوەی خۆی سوار دەکرد هەر لەبەر ئەوەش بوو نازناوی ماتۆڕی وەرگرت و بووە مەلا ماتۆڕ، با ئەوەش بڵێین لەپاش ئەوەی کە بووە وەزیر ، زۆری پێ ناخۆش و لا گران بوو کە پێیان گووتبا مەلا ماتۆڕ زۆریش تووڕە دەبوو . مەلا عەولا ئەوەندە دڵسۆزو چالاك دەبێ لەکاری حزبایەتی ئەو کوڕە جووتیارە لە ماوەیەکی کورتدا دەگاتە پلەی ئەندامی لێژنەی مەرکەزی پارتی ، مەلا عەولاً لە ساڵی ١٩٥٦ لێپرسراوی لێژنەی عەسکەر بوو ، ئەو پیاوە زۆر جار دەهات سەردانی فەوجەکانی عەسکەری سوپای دەکرد ، سەری لە ئەندامانی حزب دەدا لە موسڵ ، زۆر جاریش شەوانە لەناو عەسکەرەکاندا دەماوە.

من لەساڵی ١٩٥٧ لە رێگەی رێکخستنی حزبایەتی مامۆستا مەلا عەولاّم ناسی، لەساڵی ١٩٥٨ منیش لە موسڵ گوازرامەوە بۆ هەولێر بۆ فەوجی سێی لیوای سێ لە هەولێر ، مانگێ دووجار لەگەل مامۆستا مەلا عەولاّ کۆدەبووینەوە، مەلا عەولاً هێندە پیاوێکی دڵسۆزو دەستپاك و راستگۆ بووە بۆ حیزب و هێندە کوردپەرەور و شۆڕشگێر بووە بۆ کورد و شۆڕش، ئەگەر وەفاداری هەبێ و چاکەش هەبێ و چاکەش لەبەر چاو بگیرێ یان بگیرابوایە ئەوەدەبوایە زۆر لە هەڤاڵاّکانی یان نووسەران باسی خەباتی مەلا عەولاّیان کردبایە من زۆر باش دەزانم ئەو پیاوە لەو کاتەی کە وەزیریش بوو هەر خزمەتی کوردی دەکرد.

با بێینە سەر باسەكەی خۆمان مەلا عەولاّ ئەو كاتەی لە هەولێر بوو، لەترسی گرتن و ئاشكرا بوون هەر مانگە ماڵی لە گەرەكێك بوو ناوی نهێنیشی (فەتاح) بوو ئێمە ئەو كاتانەی لەگەل مەلا عەولاّ بووین و لەگەلی كۆ دەبووینەوە لەترسی گرتن ئەو كاتە من باسی دەكەم دەگەڕێتەوە ساڵانی ١٩٥٨ تا پێش شۆرشی ئەیلول حیزب زۆر لە گەشەكردن بوو، ئێمە مانگانە مەلا عەولاّمان دەدیت.

لەساڵی ١٩٦١ ئێمە كە لەلیوای سێ بووین چووین بۆ فەرەزیات چووینە رواندز، لەگەڵ مەلا عەولاّ دابڕاین، هەر لەساڵی ١٩٦١ پاش كوشتنی سدیق میران بەگ هێزی سەفین دروست بوو، ئەو هێزە لە كاوانیەكان و گوندی حوجران و ئەندامانی حزب لە شەقلاوەو دەوربەرەكەی پێك هاتبوو.

ئەو كاتە هێشتا شۆڕشی ئەیلول دەستی پێ نەكردبوو ، مامۆستا مەلا عولاو شەمسەدین موفتی سەرپەرشتی ئەو هێزەی سەفینیان دەكرد لە شیلانێ و كۆڕێ گاوانان ، لە كاتی پۆلیسە قارەمانەكان (عەریف عوسمان ، حەمەسالح عەبدوڵلا ، كریم حەسەن بەگ) كە جبەخانەی سەرای هەولێریان هێنا ، بەئاگاداری مەلا عەولاّ بوو ، هەر بەخۆشی كات و ساتی بۆیان دانابوو ، ئەوەبوو لەكاتی پەیوەندی كردنیان مەلا عەولاّش ١٠ پێشمەرگەی لەگەڵ خۆی دەبات، بۆ پێشوازییان دەچێتە ناوچەی هەورازە نەفتە لە پشتی كەسنەزان لەسەر رێگای كۆیە ، هێلی تەلەفۆنیشی بڕیبوو بۆئەوەی پەیوەندی نێوان هەولێر ـ كۆیە نەمێنێت ، هێنانی ئەو جبەخانەی سەرای هەولێر هێزەكەی سەفینی دەولەمەند كرد ، هەر لەو چەكانەش بەشێكی نارد بۆ هەڤاڵ مام جەلال لە چەمی رەزان ، دوای ئەوە جولانەوەی عەشایرەكان دەستی پێكرد و شەڕ لەسەفین لەگەڵ هێزی سەفین

دەستی پێکرد ، پۆلیسەکی زۆر لە پۆلیسەکانی هەولێر چوونە ناو ریزەکانی هێزی سەفین و ژمارەیان گەیشتە ١٥٠ چەکدار زیاتر ئەو هێزەی سەفین بە سەرکردایەتی مەلا عەولا لەگەڵ جاشەکانی حوکمەت و هێزی پۆلیسی گەرۆك هەمیشە لە شەڕ دابوو،

پاش هەرەس هێنانی بزوتنەوەی عەشائیر و بلاوە پێکردنیان لە (١٩٦١/٩/١٦) منیش بوومە پێشمەرگە و چوومە گوندی پاش قۆتەڵ لە دۆڵە رەقە ئەو بنکەیە سەر بە ئەندامانی رانیە بوو، لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦١ خەبەرمان بۆ هات گوتیان مامۆستا مەلا عەولا دێتە گوندی پاش قۆتەل، ئەوەبوو لەوێدا دووبارە لەگەڵ مامۆستا بەیەك گەیشتینەوە و یەکترمان دیتەوە لەو سەردانەی دا مامۆستا مەلا عەولا میوانی بنکە بوو، بەلام بۆ سەردانی عەباس ئاغاش هاتبوو و سەردانەکەشی بۆ ئەوەبوو فیشەك زۆر کەم بوو هاتبوو هەندەك فیشەك بۆ هێزەکەی پەیدا بکات، مەلا عەولا شەو لەلامان مایەوە سەری پێلاوەکەی بەن بوو سەر پەنجەکانی درابوو شەو بە سوژن و بەن پێلاوەکەی دوورییەوە.

بەهەرحاڵ مەلا عەولا لەو سەردانەیدا بۆ پاش قۆتەڵ فیشەکی پەیدا نەکرد و بەدەستی بەتاڵی گەڕایەوە لای هێزەکەی لە سەفین، ئەو هێزەی سەفین لەبەر کەم فیشەکی لەکاتی شەڕکردن قەوانەکانیان کۆکردەوەو دووبارەو سێ بارە لە لای گوندی سکتان دایان دەگرتەوە.

لە مانگی تشرینی دووەمی ١٩٦١ لەپاش ئاشبەتاڵی لەشکری عەشائیری لە هەموو ناوچەکانی کوردستان شەڕو تەقە نەما بەس شەڕ لەسەر ئەو هێزەی سەفین بەردەوام بوو ئەو هێزەش لەبەر بێفیشەکی و لەسەرمان و لە برسان ناچاربوون لەشاخی سەفین بکشێنەوەو بەرەولای گوندی مەلەکان و

سوێسنان لەو کات و ساتەدا ئەگەر عەباس ئاغا فریای ئەو هێزە نەکەوتبا هەموویان لە برسان دەمردن، پاشان هێزەکە هاتە (دۆڵە ڕەقە)و عەباسی مامەند ئاغا هێزەکەی بەسەر گوندەکانی خۆی دابەش کردو هەموو هێزەکەی بەخێوکرد تا ئەو کاتەی مام جەلال پارەکەی ڕێگای کۆیەی گرت، لە پاش گرتنی پارەکە لە گوندی ڕێزینە هێزی پێشمەرگە ڕێکخراوەیەوەو هەموو هێزەکە کرا بە دوو لق مەلا عەولاّ بووە سەر لقی یەك و عەریف سلێمانیش بووە سەر لقی دوو ئەو دوو لقەی پێشمەرگە بووە بەردی بناغە بۆ پێگەیاندنی شۆڕشی ئەیلول لە ناوچەی سۆران.

مەلا عەولاّ لەچەندین شەڕ لە دەوروبەری کۆیە بەشداری کرد و لە ساڵی ١٩٦٢ کەعەشیرەتی برادۆست و هەرکیەکان و سۆفیەکانی شێخ ڕەشیدی لۆلان شەڕیان لەگەڵ لەشکری بارزانی دەکرد ئەو کاتە مەلا عەولاّ سەرکردایەتی ئەو شەڕەی دەکرد لەناوچەی سیدەکان و خواکورك و تا سنوری تورکیا لەو شەڕانەدا ئەوپەڕی سەرکەوتنی بەدەست هێنا، هەر لە ساڵی ١٩٦٢ لە ناوچەی ئاغجەلەرو چەمی ڕەزان مەلا عەولاّ سەرکردایەتی چەند شەڕێکی دیکەی کردو لە هەموویدا سەرکەوتوو بوو، هەر لە سالی ١٩٦٢ لە ئەزمەڕو مارەڕەش شەڕەکی گەورەی لەگەڵ سوپای عێراق کردو ئامر فەوجەکی بەدیل گرت و جەیشەکەی شکاندو دەبابەیەکیشی شکاندو گەورەترین سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

مەلا عەولاّ لە ناوچەی بادینانیش سەرکردایەتی چەند شەڕێکی کردووە، هەروەها ناحیەی ڕێداری گرت، لەساڵی ١٩٦٣ مەلا عەولاّ لەگەڵ شەش پێشمەرگە شاری کۆیەی گرت دوای کوژرانی عەبدولکەریم قاسم مەلا عەولاّ لەکاتی هێرشە گەورەکەی حەرەس قەومیەکان لە شەڕەکانی دەشتی کۆیە

لە ریزەکانی پێشەوە بوو مەلا عەولاو کاك عومەر دەبابە لێنەگەڕان حەرەس قەومی لە شاخی هەیبەت سوڵتان ئاوابن

لەساڵی ١٩٦٣ مەلا عەوڵا سەرکردایەتی زۆر شەڕی کردووەو لەساڵی ١٩٦٤ پێش شەڕی برا کوژی روویدات بە تاقی تەنیا بەس (رەشۆی ئایشێ)ی لەگەڵ خۆی بردوو لەماوەت گەڕاوە ناو شاری هەولێر و بە نهێنی کاروباری رێکخستنەکانی هەولێری بەڕێوە برد ئەو ماوەیە هێزی باڵی مەکتەبی سیاسی لە هەمەدان بوین مەلاعەوڵا لێپرسراوی هەولێر بوو بەیاننامەی دەرکردو بەیانەکانی بۆ ئێمە دەهاتە هەمەدان.

پاش گەڕانەوەمان لە هەمەدان لەساڵی ١٩٦٦ دووبارە شەڕی برا کوژی دەستی پێکردەوە هێزی هەولێر دروست بۆوە ئەوکاتە مەلا عەولاَ فەرماندەی هێزی هەولێر بوو کە هێزی هەولێر دروست بۆوە، هەولێر زۆر خەتەرناك بوو ناکۆکییەکان لەگەڵ هێزەکانی بارزانی زۆر تیر بوو، پاشان کاك حەمەدەمین فەرەج بووە موتەسەریفی هەولێر ئەوکاتە حکومەت زیاتر لەگەڵ ئێمەدا بوو، بۆیە هێزەکانی بارزانی لەناو شارەکان بەرەو کزبوون دەچوون، ئەوکاتە لەهەرسێ شارە کوردییەکانی وەکو (هەولێر ـ دهۆك ـ سلێمانی) ئەندامێکی حیزبی بەعسی تێدا نەبوو، هەولێرو دەوروبەری لە دەست هێزەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی دا بوو مەلا عەولاَ لەهەولێر دەوری سەرەکی هەبوو بەلاَم لەگەڵ کاك حەمەدەمین فەرج ی موتەسەریفی هەولێرزۆر تەبا نەبوو ئەوکاتە ئیدارەی شارە کوردییەکان لە دەستی کورد دابوو واتە لەدەست باڵی مەکتەبی سیاسی دا بوو.

لەساڵی ١٩٦٦ تا ١٩٦٨ رۆڵ و پێگەی مەلا عەولاَ بەرەو گۆڕان دەچوو، ئەو رێزو خۆشەویستیەی جارانی نەما بە تایبەتی لەناو هێزەکانی پێشمەرگە،

چونکە لەگەڵ ئەندامانی حیزب و پێشمەرگەکان زۆر توڕەو توند بوو لەبەر ئەو هۆیە بوو هێزی هەولێر زیادی نەدەکرد بۆ بەهێزکردنی هێزی هەولێر مام جەلال پۆلێك پێشمەرگەی بە سەرکردایەتی شەهید عوسمانی بەکر ناردە هەولێر، ئەوکاتە سەید مەجید لێپرسراوی ئیدارەی هێزی هەولێر بوو جا لەبەر بوغرابونی مەلا عەولاَ و کەمتەرخەمی خۆیان لە چەند شەڕێکدا شکان وەك:

١-ئەو شەڕەی لەگەڵ سەید مەجیدی لە گوندی ماستاوە کرا.

٢- شەهید کردنی عوسمان بەکر.

٣- شکانی مەلا عەولاَ لە گوندی بێستانە و گێرێ رەش.

ئەو شکستانە وایکرد مەکتەبی سیاسی بیر لە گۆڕینی سەرکردەکانی لەهەولێر بکاتەوە، بۆیە لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٦٨ مەلاعەولاَو سەید مەجید گوازرانەوە بۆ بەغداو لە جێگای ئەوان دوو کەسی دیکە وەکو سەرکردەی هێزی هەولێر داندران ئەوانیش :

١- د.خالید سەعید کەلەمێژنەبوو لەناو هێزەکانی بارزانی هاتبوە ناوهێزەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی کرایە فەرماندەی هێزی هەولێر.

٢- حەمید رەشاش کرا بە لێپرسراوی ئیداری و سیاسی هێزی هەولێر کە ئەوکاتە شێخ لەتیف بەرزنجی لێپرسراوی لقی حزب بوو پاشان دکتۆر خالید هەر ماوەی مانگێك ماوەو خۆی لە هەولێررانەگرت و داوای گواستنەوەو گەڕانەوەی بۆ بەغدا کرد، لەپاش دکتۆر خالید ئەرکی هێزەکەش بەمن سپێردرا تا بەیانی ١١ ی ئازار.

لە پاش بەیانی ١١ی ئازار هێزەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی بڵاوەی کردوو ئێمە بەشێکی کەممان مابوو لە بەغدا، مەلا عەولاَ لە بەغدا بەهۆی کێشەیەکی خێزانی (ژن هێنانی دووەمی) لە سەرکردایەتی حزب دەرکراو لەپاش

دەرکردنی کە ماڵی لە گەڕەکی مەشتەل بوو لە بەغدا ئەوکاتە چەند خزمێکی خۆی وەك پاسەوان لەگەڵدا بوو، ژیانی لەسەر حکومەت بوو پاشان باڵی مەکتەبی سیاسی بەناوی حیزبی شۆڕشگێرانی کوردستان خۆی هەڵوەشاندەوە و چونەوە ناو حیزبی پارتی بە سەرۆکایەتی بارزانی، پاشان حکومەت واتە سەدام حوسێن نیازی پاك نەبوو لەگەڵ بارزانی و بەرامبەر بە پارتی، سەدام پارتێکی تری دروست کرد بە سەرکردایەتی هاشم عەقراوی و عەزیزعەقراوی وئیسماعیل مەلاعەزیزو بارەگای بۆیان کردەوە حیزبێکی تریشی دروست کرد بە ناوی حیزبی شۆڕشگێرانی کوردستان بە سەرکردایەتی (شێخ ستار و مەلا عەولا) و چەند کەسێکی ترو بارەگای بۆیان کردەوە ئەوەندەی نەبرد ناکۆکی کەوتە نێوان مەلا عەولاو شێخ ستار حکومەت مەلا عەولای جیا کردەوەو حیزبێکی بۆ دانا بەناوی بزوتنەوەی پێشکەوتنخوازی کوردو بارەگاکەی لەشەقامی مەغریب بوو لەشاری بەغدا.

پاشان لەساڵی ١٩٧٤ لە سەردەمی حوکمی ئەحمەد حەسەن بەکر، مەلا عەولا کرا بەوەزیری دەوڵەت، ئەو حزبە کارتۆنیانەی حکومەت دروستی کردن هەموویان پارەیان لە شوعبەی ٣ وەردەگرت و بارەگاشیان لەناو شارەکانی کوردستان کردەوە بەس مەلا عەولا بارەگایەکی خۆی لە شارەکانی کوردستان هەڵوەشاندەوە و تەنیا بارەگایەکی لە شاری بەغدا هێشتەوە، من شاهێدی دەدەم کە مەلا عەولا بە منی وت من باوەڕم بە ئەندامانی ئەو حیزبەی خۆم نییەو دوو قسەیان لەلا بکەم لەبەرئەوەی دەگاتەوە حیزبی بەعس.

مەلا عەولا لەپاش وەزیری باری ژیانی گۆڕانکارییەکی گەورەو زۆری بەسەرداهات، وەکو کورد دەڵێ لەم دەستەی هاتە ئەو دەستەی هەر لە پاش

بوونە وەزیری حکومەت خانوویەکی گەورەی لە گەرەکی قاهیرە بۆ کرد جگە لە سەیارەی وەزارەت و دوو سەیارەی تری وەرگرت ڕاستە وەزیری دەوڵەتەکان وەکو وەزیرەکانی تر دەسەلاتیان نەبوو، بەلام لەبارەی پارەو پول و ئیمتیازاتەوە وەکو یەك بوون ئەو کاتە عوبەیدوللای کوڕی بارزانی ئەویش وەزیری دەوڵەت بوو.

تا شەڕ دەستی پێکردەوە لەساڵی ١٩٧٤ تا مەجلیسی تەشریعی و تەنفیزی دانراو مەلا عەولا بوە نائیب لە پەرلەمان و بووە خاوەن پارەو سەروەت و حکومەت خانووی لە کۆڕێش بۆ کرد، پاشان خانوەکی تری لە باشترین گەرەك لە بەغدا بۆ دروست کرد مەلا عەولا بە پارەی خۆی زۆر ڕەزیل بوو، بەلام وەکو بیروباوەڕ کوردێکی زۆر باش بوو لە کاتی وەزیر بوو کاری باشی بۆ کوردان دەکرد بەلام سەدامیشی زۆر خۆش دەویست.. سەدامیش ئیشی بۆ مەلا عەولا دەکرد، مەلا عەولا باوەڕی بە کردەوەکانی حیزبی بەعس نەبوو.

لە لایەکی تریش باوەڕی بە سەرکردەکانی شۆڕش نەبوو من نامەوێ باسی ژیانی خێزانی مەلا عەولا بکەم، چونکە ئەوەندە باوەڕی بەمن هەبوو شتی لە من نەدەشاردەوە زۆر حەزی دەکرد شۆڕشی کوردستان سەرکەوتوو بێت، بەلام دەستی لە پارەو پولەکەی بەرنەدەبوو، مەلا عەولا لە کاتی وەزیر بوو هەموو جۆرە کەسێك هاتوچۆیان دەکرد لە پارتی و لە یەکێتی و خەڵکی جۆراوجۆر بە پێی توانا کاری بۆ هەمویان دەکرد چەند کەسێکی لە سێدارەدان قوتارکردن زۆرباش دەزانم ئەو کەسانەی لەگەڵ مەلا عەولا بوون هەموویان بە بیرو باوەڕ یەکێتی بوون و گوێیان دەدا ڕادیۆی یەکێتی و بەمەلا عەولایان دەگوت بۆ نمونە من خۆم کوڕەکەم بووە پێشمەرگە بەمەلا عەولام

گوت زۆر کەیفی خۆش بوو زۆر باش دەیزانی حاکم شێرزاد پەیوەندی لەگەڵ یەکێتی هەبوو مەلا عەولاّ ماوەی ١٧ ساڵ وەزیر بوو لەو ماوەیەدا تا خانەنشین بوو دەسەڵاتی وەزیری بەکار نەهێنا بۆ تۆڵە سەندنەوەو غەرەزی کۆن، پاش خانەنشین بوونی حکومەت ١٥٠٠ هەزارو پێنج سەد دۆنم زەوی لە هەولێر دایێ و دوو بیری ئیرتیوازیشی لەناو زەویەکەی بۆ تەرخانکرد، هەروەها ٨٠٠ مەتر زەوی خانووی لە گەڕەکی مەنتکاوەی هەولێر دایێ و کردییە خانوو.

لە پاش وەزیریش حکومەت خانووی بۆ کرد، مەلا عەولاّ لەپاش خانەنشین بونی ماڵی لە هەولێر بوو دوای راپەرینیش بۆ هاتوچۆی خۆی بۆ بەغدا و راپەراندنی کارەکانی خۆی پسوڵەی پارتی و یەکێتی هەبوو تاکۆچی دوایی کرد نەمزانییە کەسێك بە قسەی مەلا عەولاّی زەرەمەند بوبێ من دەزانم ئەوەندەی بۆ کرابا کاری باشی بۆ کوردان دەکرد و لە کاتی توندو تیژی حکومی بەعسیش زۆر کەسی پاراست، ئەوە بەشێك بوو لە کردەوەکانی خوالێخۆش بوو مامۆستا مەلا عەولاّ، هەندێ کەسی وا هەنە بە تایبەتی ئەوانەی قەت قەت پێشمەرگە نەبوونەو لە شەڕەکیش بەشدار نەبوونە ئەوانە شیریان زۆر تیژە و هەر خۆیان بە شۆڕشگێڕو کورد پەروەر دەزانن و وایان دەزانی ئەو کوردانەی ماڵیان لە بەغدا بوو هەموویان نۆکەری حیزبی بەعسن نەخێر وا نەبوو.

مەلا عەولاّ ئەوکاتەی وەزیر بوو خەڵکێکی زۆری لە بن باڵی خۆی دەپاراست بە داخەوە مەلا عەولاّ ئاواتەکی زۆری لە دڵ دا هەبوو بەلاّم بەسەردا کۆچی دوایی کرد ئاواتەکانی نەهاتە دی.

مەلا عەولاّ لەبەر ئەوەی منالّی نەبوو لە پاش مردنی  هەمو پارەو پول و مالّەکەی بەسەر خەجەی خێزانی و براکانی دابەشکرا مەلا عەولاّ زۆر درەنگ ژیان نامەی خۆی نوسیەوە زۆر درەنگیش بە چاپی گەیاند ئەویش بەرگی یەکەم بوو، من زۆر باش ئاگادارم کە بەرگی دووەمیشی  نووسی زۆر جاریش من هەندەك کردەوەم وەبیر دەهێناوە، بەلاّم بەرگی دووەمەکەی چاپ نەکرا لەبەر ڕەزیلی و کەمتەرخەمی خۆی، خۆی دەستی پێکرا، ئەوەی من ئاگادارم داوای لە حکومەتی بەغدا کردبوو بۆی چاپ بکەن، بەلاّم حکومەت بۆی چاپ نەکرد لەبەرئەوەی لە نوسینەکەیدا زۆر باسی سەرۆك بارزانی کردبوو، بۆیە حکومەت بۆی نەکرد لێرەش حکومەتی هەرێم هەر بۆیان چاپ نەکرد لەبەر چەند وشەیەك داوایان لێکرد ئەگەر ئەو وشانە لا بدات بۆی چاپ دەکەن، بەلام مەلا عەولاّ ووتی لای نادەم ئەوەبوو بەسەردا نەخۆش کەوت و دەستنوسی کتێبەکەشی لە لایەن مەکتەبی سەرۆك دەستی بەسەردا گیرا وەك مەهدی خۆشناو بۆی باس کردم، ئەوەی من باسم کردیە ئەوە بەشەکی کەمە لە خەبات و پێشمەرگایەتی ئەو سەرکردە مەزنە.

**دەربارەی شەڕی ئەزمەرو گوندی مارە ڕەش:**

هەر لەسەرەتای دەستپێکردنی شۆڕشی ئەیلول جۆرە ناکۆکییەك لە نێوان سەرۆك بارزانی و مامۆستا مەلا عەولاّ هەبوو ئەو ناکۆکییە ئەگەر لەبەر ترسنۆکی و خراپی مەلا عەولاّ بوایە زۆر لە جێگای خۆی دەبوو خۆ ئەگەر لەبەر ئازایەتی و دلّسۆزی و ڕەشیدی بوایە ئەوە هەموو خەلّك و حیزبیش دەیانزانی مەلا عەولاّ بەدەستی خۆی ڕەشید بوو، سەرکردەیەکی ئازاش بوو، بەلاّم لەبەر چ بوو بارزانی هەمیشە لە مەلا عەولاّ ناڕازی بوو ئەگەر لەبەر

ڕەشیدی ئەویایە دەبوایە لای سەرۆك خۆشەویست بوایە، بەڵام دەرکەوت پەیوەندیشی زیاتر بە مەکتەبی سیاسیەوە بوو و ئەو بەفەرمانی مەکتەبی سیاسی کاری دەکردوو دژایەتی ئەو کەسانەی دەکرد.

ئەگەر لە سەرەتای شۆڕش مەلا عەولاّ لە قسەی بارزانی دەرنەچوبایە لە لای بارزانی زۆر خۆشەویست دەبوو ئەگەر خراپەشی بکردایە چاوپۆشی لێدەکرد، لەگەڵ ئەو هەموو ناڕەزایەتیەشی، بەڵام سەرۆك بارزانی زۆر جار لەکاتی شەڕی گەورەدا مەلا عەولاّی دەناردو سەرکردایەتی بارزانیەکانی دەکرد، هەروەکو لە شەڕی نێوان بارزانی و برادۆستەکان، لە مانگی حوزەیرانی ١٩٦٢ مەلا مستەفا داوای لە مەلا عەولاّ کرد تا سەرکردایەتی ئەو شەڕە درێژ خایەنەی نێوان برادۆستەکان و لەشکرەکەی بارزانی بکات لەگەڵ ئەوەشدا بارزانی هەردەم لە مەلا عەولاّ نارازی بوو، ئەو تورەییە بەردەوام بوو تا سەرۆك بارزانی خۆی و لە شکرەکەی هاتە ناوچەی خۆشناوەتی و بارزانی گۆڕانکاریەکی زۆر گەورەی کرد هەر لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییەدا فەرمانی دا نابێ مەلا عەولاّ کاری پێشمەرگایەتی بکات و هەموو دەسەلاّتەکانی لە مەلا عەولاّ سەندەوەو لەناوچەی خۆشناوەتیش دەریکرد، مەلا عەولاّ بەناچاری هاتە بارەگای مەکتەبی سیاسی کە ئەو کاتە لە ئەشکەوتی مالومە بوو من لێپرسراوی بارەگای مەکتەبی سیاسی بووم.

حکومەت هێزێکی گەورەی ئامادەکرد بە سەرکردایەتی ئەفسەرێکی کورد کەناوی مەحمود خەفاف بوو، بچێت قەزای چوارتا بگرنەوە حزبیش هێزەکی پێشمەرگەی ئامادەکرد بە سەرکردایەتی مەلا عەولاّ بۆ ئەوەی پێش لەو جەیشەی حکومەت بگرن تا نەگاتە چوارتا ئەوەبوو مەلا عەولاّش زۆر بەپەلە چووە مەیدانی شەڕەکەو لەسەر چیای ئەزمەڕو گوندی مارە ڕەش سەنگەری

گرت تا هێزەکەی حکومەت هات، ئەو هێزەی حکومەت کەوتنە ناو کەمینەکانی پێشمەرگە لەشەڕەکی چەند سەعاتیدا زۆر بەشەپرێوی شکان و دەبابەك و ئەرزاق و فیشەکێکی زۆریان بەجێهێشت، ئامر فەوجەکەش کە ناوی مەحمود خەففاف بوو بەدیل گیرا، لەگەڵ چەند لۆرییەکی عەسکەری هێزی پێشمەرگەش زیانیان نەبوو، ئەو شەڕە شەڕەکی زۆر سەرکەوتوو بوو و دەنگی دایەوە، حکومەت بەو شەڕە سەرسام بوو جا هەر بەبۆنەی ئەو سەرکەوتنەوە بەڕێز مام جەلال بۆ گاڵتە پێکردن بە بێتەل پەیوەندی بە ئامێری لیوای سلێمانی کردو بەگاڵتە بەئامیر لیوای وت: ئەگەر جارەکی دیکە دیاریتان بۆمان نارد ئەرزاق و کەل و پەلی باشترمان بۆ ڕەوانە بکەن.

هەر لەپاش ئەو شەڕە بوو لەساڵی ١٩٦٣ نزیکەی ٦٠ سەرباز لەعەریف و نایب عەریف و نایب زابت لە فەوجی ٣ی لیوای ٢ی سوپای عێراق بەکۆمەڵ هاتنە ناو ڕیزی پێشمەرگە یەکێك لەو نایب زابتانەی ناوی عەبدولڕەزاق بێتوشی بوو، برادەری من بوو تا ئەو کاتەش لەژیاندا ماوە... ئەوە بەشەك بوو لەچالاکی ئەم پیاوە کورد پەروەرە کە بارزانی هەمیشە لەو پیاوە شۆڕشگێرە تووڕە بوو.

لە کۆتاییدا دەڵێم هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی مەلا عەولا بێت.

شووره گەورەکەی پێشمەرگە دێرینەکان ناوە ناوە کەلێنەکی تێدەکەوێ، کۆچی دوایی خاڵە شێخ جەنگی بۆ ئێمەی پێشمەرگە دێرینەکان کارەکی گرانەو کەلەنەکەشی بە ئاسانی پڕ نابێتەوە، خاڵە شێخ جەنگی جگە لەوەی برا گەورەی بەڕێز مام جەلال بوو، بەڵام خۆشی پیاوەکی هەڵکەوتە و سەربڵند و چاوتێر و کەسایەتێکی ناسراو بوو، بە تایبەتی لە ناوچەی کۆیە،

خاڵە شێخ جەنگی پیاوی مەسرەتیان و ئاشتەوایی کۆمەڵایەتی بوو، خاڵە شێخ جەنگی پیاوەکی لێوەشاوە و خاوەنی دەست و تفەنگی خۆی بوو، خاڵە شێخ جەنگی هەموو مەرجەکانی پیاوەتی تێدابوو و پێشمەرگەکی دێرین و کورد پەروەر بوو، من لە ساڵی ١٩٦٢ بەهۆی بەڕێز مام جەلال شێخ جەنگیم ناسی، ئەو کاتە پێشمەرگە بووم لە هێزەکەی مام جەلال کە لە مانگی ٥ی ١٩٦٢ هێزەکەمان قەزای پێنجوێنی گرت.

قاسەکەی حکومەت ١١ هەزار دیناری تێدا بوو پارەکەشمان هێنا، بەڵام پارەکە نیوەی پارەی دڕاو و بێکەڵك بوو جا لە پاش ئازادکردنی قەزای پێنجوێن هێزەکەمان گەڕاینەوە بۆ چەمی ڕێزان، ڕۆژەك من و بەڕێز مام جەلال و چەند پێشمەرگەیەك پارە دڕاوەکانمان لەگەڵ خۆمان برد و چووینە گوندی قزل و چووینە ماڵی خاڵە شێخ جەنگی ئەو کاتە شێخ جەنگی برا گەورەی گوندەکە بوو، ئەوە سەرەتای ناسینم بوو لەگەڵ خاڵە شێخ جەنگی بەڕاستی پێشتر ئێمە نەماندەزانی خاڵە شێخ جەنگی برا گەورەی مام جەلالە، ئێمە ماوەی دوو شەو و دوو ڕۆژ میوانی خاڵە شێخ بووین و میوانداری باشی کردین و پارە دڕاوەکانمان بە ژمارە دا بە شێخ جەنگی، ئەو کاتە شێخ جەنگی هەرەتی لاوی بوو گەنجەکی پاك و قسەخۆش بوو، جا لە پاش گەڕانەوەی ئێمە خاڵە شێخ پارە دڕاوەکانی ئێمەی بردە بەغدا بە هەزار ناری علی پارە دڕاوەکانی هەمووی بە پارەی ساغ گۆڕییەوە و پارە ساغەکانی بۆمان هێناوە چەمی ڕێزان و هەر بە ژمارە پارەکەمان لە خاڵە شێخ جەنگی وەرگرتەوە، ئەوە چاکە و پیاوەتی و کورد پەروەری خاڵە شێخ جەنگی بوو، بەر لەوەی ببێتە پێشمەرگە ئەم باسە نە خزمانی خۆی و نە خەڵکی کۆیە دەیزانن بەس بەڕێز مام جەلال دەیزانی، لە ساڵی ١٩٦٣ لەکاتی

هێرشە گەورەکەی حەرەس قەومی بۆ سەر ناوچەی کۆیە ئەو کاتە من لە حاجی قەڵا بووم و زۆر باشیشم لە یادەو دەزانم خاڵە شێخ جەنگی خۆبەخشانە و مەردانە زیاتر لە ٣٠ چەکداری کۆکردەوە و لە دۆست و برادەر و خزمانی خۆی بەرگری لە گوندەکانی ناوچەی کۆیە کرد و بەشداری شەڕەکان بوو، لە ساڵی ١٩٦٤ لە بەر ناکۆکی باڵی م،س و بارزانی شەڕی براکوژی شێخ جەنگی گوندی قزلووی بەجێهێشت و هاتە شاری کۆیە ئەوە بوو هێزەکەی م.س چوونە هەمەدان و لە ساڵی ١٩٦٦ باڵی م.س گەڕاینەوە بەپێی ڕێکەوتن، بەڵام ئەو ڕێکەوتنە سەری نەگرت و باڵەکەی م.س پەیوەندیان بە حکومەتی عیراق کرد و دووبارە شەڕی براکوژی دەستی پێکردەوە و خاڵە شێخ جەنگی هاتەوە ناو ڕیزەکانی پێشمەرگە و ماڵەکەشی لەگەڵ ماڵی شێخ شکراللە و شێخ شەرەف و شێخ حەمە سالح بردە بەکرەجۆ، لە ساڵی ١٩٦٨ منیش ماڵەکەم لە بەکرەجۆ بوو دراوسێی ماڵی خاڵە شێخ جەنگی بووم، من بۆ مێژوو دەڵێم ئەو ماوەیەی ئێمە ماڵمان لە بەکرەجۆ بوو ڕۆژەك لە ڕۆژان هەستمان بەوە نەکرد بەڕێز مام جەلال فەرق و جیاوازی بکات لە نێوان ماڵە پێشمەرگەیەك و ماڵە خزمانی خۆی، هەرگیز ئەوە لە خەیاڵی مام جەلال دا نەبوو هەمیشە وام هەست دەکرد من لە خزمەکانی زیاتر لە مام جەلال نێزیکترم، بۆ نموونە ئەم باسە دەگێڕمەوە ئەو کاتە من لێپرسراوی ئیدارە بووم لە بەشی تەقەمەنی هێزەکە ئەو کاتە خاڵە شێخ جەنگی لە چەکەکەی خۆی زێتر چەکەکی زیادەی لابوو، مام جەلال بە منی گوت، برۆ ئەو چەکە زیادەی لە شێخ جەنگی وەربگرەوە، منیش چووم چەکە زیادەکەم لە خاڵە شێخ وەرگرتەوە بەبێ ئەوەی دلگران بێ. من و شێخ جەنگی زۆر برادەر بووین زۆرجاریش لە شەڕەکان سەنگەرمان

لەتەنیشت یەکتر بوو، ڕۆژەك لە ڕۆژان خالە شێخ جەنگیم بە گرژی نەدیت لە کاتی شەڕکردن، خالە شێخ جەنگی سەرکردەکی زۆر ئازا و بەجەرگ بوو، بەڕاستی پیاوی ناو پیاوان بوو لەگەڵ چینی هەژاران بوو و پیاوی ڕۆژی تەنگانە بوو من دووبارەی دەکەمەوە ئێمەی پێشمەرگە دێرینەکان زۆر دڵتەنگ و غەمبارین بە دابڕانی ئەو براگەورەمان و ئێمەی پێشمەرگە دێرینەکان وا ڕەچاو دەکەین خالە شێخ جەنگی لە پاش خۆی هەوارەکەی چۆڵ نەبێ پەندەکی کوردی دەڵێ مزگەوت ڕووخایە میحرابی مایە، هیوادارین منداڵەکانی هەوارەکەی باوکیان چۆڵ نەکەن و هەر خۆشەویستی گەلەکەی خۆیان بن.

٢ لێرەوەش پڕ بەدڵ خۆشحاڵم بەوەی کورتە باسەکی ساڵانی پێشمەرگایەتیم لەگەڵ هەڤاڵی پێشمەرگە و سەرکردەی نەمر شەهید عەلی عەسکەری دەگێڕمەوە ئێمەی پێشمەرگە دێرینەکانی شۆڕشی ئەیلول هەریەکەمان لەگەڵ سەرکردەکان جۆرە بیرەوەرییەکمان هەیە ئەو بیرەوەریانە هەندەکیان ون بوونە هەندەکیش باسی لێوە نەکراوە من شانازی بەوە دەکەم کە دەتوانم جێگای خۆم دەکەمەوە لە لاپەڕەکانی کتێبەکەی سەروسەربردەی شۆڕەسوارەکی قارەمانی کوردپەروەری مەیدانی کوردایەتی شەهیدی نەمر کاك عەلی عەسکەری، من وەکو پێشمەرگەکی سەرەتای شۆڕشی ئەیلول هەندەك بیرەوەریم لەگەڵ هەڤاڵی دێرینم شەهید عەلی عەسکەری هەیە، ئەو بیرەوەرییەش بەبێ زیاد و کەم وەکو خۆی دەگێڕمەوە هیوادارم جێگای ڕەزامەندی هەمووان بێ.

سەرەتا بیرەوەرییەکەم بەوە دەست پێدەکەم دەڵێم هەر کەسێك ڕۆژەك عەلی عەسکەری دیبایە تا مردن قەت و قەت سیما و پێکەنین و نوکتە و

قسەخۆشەکانی لە بیرناچێتەوە لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلول پێش ئەوەی من کاك عەلی بناسم زۆر کەس باسی ئازایەتی و دڵسۆزی عەلی عەسکەری دەکردو وایان باس دەکرد دەیانگوت: لەکاتی شەڕکردن لە ڕیزەکانی پێشەوە دایە و هەروەهاش باسی مامۆستا مەلا عەولاشیان بەو شێوەیە دەکرد، سەرەتای ناسینم لەگەڵ شەهیدی نەمر دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٦٢ ئەو کاتە بارەگای مەکتەبی سیاسی لە ئەشکەوتی گوندی ماڵومە بوو من ئەو کاتە لێپرسراوی بارەگایەکە بووم، هەر لە ئەشکەوتەکە کۆبوونەوەکی گشتی مەکتەبی سیاسی و ئەندامانی لیژنەی مەرکەزی کرا، بەڵام سەرۆکی حزب سەرۆك بارزانی بوو، لەو کۆبوونەوەیەدا ئامادە نەبوو، کاك عەلیش ئەو کاتە ئەندامی لیژنەی مەرکەزی بوو لە کۆبوونەوەکە ئامادە بوو و ئەو کاتیشی سەرکردایەتی هێزەکی دەکرد لە ناوچەی بادینان لەگەڵ بارزانی بوو. لەوێ کاك عەلیم ناسی و بووینە برادەر، هەر بۆیەش کە باسی کاك عەلی بکرێ من یەکسەر ئەو هەموو جوانی و قارەمانیەتیەی کاك عەلیم دێتەوە بەرچاوان، لەپاش تەواوبوونی کۆبوونەوەکە کاك عەلی داوای لە مەکتەبی سیاسی کرد کە نەگەڕێتەوە ناوچەی بادینان، م.س داواکەی کاك عەلیان قبوڵ کرد و کاك عەلی لە ناوچەی سۆران ماوە. هەر لە ١٩٦٢ لە کۆتایی مانگی ١٠ بوو ڕۆژەك کاك عەلی و کاك عومەر دەبابە هاتنە بارەگای م.س هەردووکیان بەتەنیا بوون. مامۆستا قادر واتە مامۆستا ئیبراهیم بە منی گوت سێ وڵاغی سواری پەیدا بکە سەفەرمان لەبەرە، منیش ناردم لە گوندەکان سێ وڵاغیان هێنا، شەو لە کاتی نیوەشەو دابوو کاك عومەر دەبابە و کاك عەلی عەسکەری و من هەریەکە و سواری وڵاغێك بووین بەرەو ماوەت بەڕێکەوتین، لەگەڵ ڕۆژ هەڵات چووینە گوندی ئاوکورتێ نانی بەیانیمان لە ماڵی مەلا ئەحمەدی خوارد لە پاش نان خواردن سێ قۆڵی سواری وڵاغان بووینەوە.

شۆڕبووینەوە سەر ڕووبارەکەی نێوان سنووری عیراق – ئێران، لەسەر لێواری ڕووبارەکە دابەزین لە وڵاغەکان و کاک عومەر و کاک عەلی چەك و فیشەك دانەکانی خۆیان دا بە من و گۆتیان تۆ بگەڕێوە ئەوانیش لە ئاوەکە پەڕینەوە و چوونە مەخفەرەکەی ئێران، منیش وڵاغەکان و تفەنگەکانم بردەوە بارەگا. ئەوە یەکەم جار بوو حکومەتی ئێران پەیوەندی بە سەرکردایەتی حزب بکا، واتە ئەوە یەکەم پەیوەندی بوو لەم نێوەندەدا دروستبوو، کاک عمر و کاک علی ماوەی (١٥) ڕۆژیان پێچوو. کە گەڕانەوە شتەکی وایان لەگەڵ خۆیان نەهێنا بوو. هەندەك دیاریان هێنابوو وەکو دووربین و شتی وردە. حکومەتی ئێران داوای سکرتێری حزبی کردبوو، ئەوە بوو مامۆستا ئیبراهیم چووە تاران، لە ساڵی ١٩٦٣ کاك عەلی فەرماندەی هێزی خەبات بوو ماوەیەك بارەگاکەی لە ماوەت بوو ئەو کاتە منیش لە ئەکادیمی شۆڕش بووم لە گوندی عیساوێ جاروبار یەکترمان دەدیت. لە ساڵی ١٩٦٤ کە شەڕی براکوژی دەستی پێکرد من و کاك عەلی لە مەکتەبی سیاسی بووین و هەردووکمان بەیەکەوە گەڕاینەوە بۆ بەرەکانی شەڕ، شەو لە گوندی شەشۆ بووین ئەو شەوە تا بەرەبەیان نەنووستین ئەوەندە قسەی خۆشی دەکرد خەومان لێنەدەکەوت، بەیانی ئەو چوو بۆ لای گوندەکانی سەراو و میراوە منیش چووم بۆ لای سیرێ و باسنێ لە بەرەبەیانی واتە ڕۆژی پەڕینەوەمان بۆ دیوی ئێران بەیەکەوە لە ئاوەکە پەڕینەوە لەو کاتە ناخۆشەش کاك عەلی ڕووگرژ نەبوو، بەهەر حاڵ تا چووینە شاری سەقز، ماوەی (٤٠) ڕۆژ لە سەقز بووین و زۆر ئێواران کاك عەلی سواری ئەسپەکەی کاك عومەر دەبوو ڕمبازی دەکرد، بەڕاستی سەر و سواری هەر لە خۆی دەهات. لە هەمەدانیش کاك عەلی و کاك عمر هەر لەگەڵ ئێمە بوون، حاڵیان

لە حاڵی ئێمە باشتر نەبوو و لەپاش گەڕانەوەمان بۆ عیراق و ناو شۆڕش لە ساڵی (١٩٦٦) کاک علی عەسکەری گەورەترین شەڕی لەگەڵ حکومەتی عیراق کرد لە شاخی کۆرەك، لەو شەڕەدا ١٢ پێشمەرگەی ئێمە شەهید کران لەوانە عەریف حسن توتمەیی بوو کە خۆشەویستی کاك علی عەسکەری بوو و چالاکترین پێشمەرگە بوو. لە پاشان بەداخەوە دووبارە تووشی شەڕی براکوژی بووینەوەو کاك عەلی عەسکەری بۆوە فەرماندەی هێزی خەبات. ئێمە باسی شەڕەکانی براکوژی ناکەین. دواین جار کاك عەلیم لە کەرکوك دیتەوە لە ڕۆژی بەیانی ١١ی ئادار لە بارەگای لق بوو. ئەوە بوو بیرەوەرییەکانم لەگەڵ ئەو سەرکردە کورد پەروەرە دووبارە دەڵێم ڕووڕەشی بۆ ئەو کەسەی عەلی عەسکەری شەهید کرد. خۆ عەلی عەسکەری لە کوردایەتی زیاتر تاوانەکی نەبوو لەگەڵ ڕێژم بۆ شەهید علی و هەموو شەهیدانی کوردستان.(٢)

بیرەوەرییەکانم لەگەڵ هەڤاڵی دێرینم پێشمەرگەی دێرینی گەلەکەمان شەهید عوسمان بەکر لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٨ بوو من لەسەر داوای خۆم لە فەوجی سێی لیوای (٥)ی مووسڵ گوازرامەوە بۆ فەوجی سێی لیوای سێی هەولێر لە سریەی چوار بووم ئەو کاتە هەڤاڵ عوسمان بەکریش لە سریەی چوار بوو، لەوێ من و کاك عوسمان بەکر یەکترمان ناسی، ناسینەکەشمان لە ڕێگای حزب بوو، ئەو کاتە من پلەی سەربازیم نائب عەریف بوو هەڤاڵ عوسمان جوندی ئەوەل بوو، ئەو ناسین و برایەتییەی ئێمە بەردەوام بوو بەبێ دابڕان و هەردووکمانیش ئەندامی حزبی بووین، بەڵام من هەندەك بەرپرسیارەتیم زیاتر بوو لە ڕووی کاری حزبایەتی لەناو فەوجەکە، کاك عوسمان ئەندامەکی کارا و چاونەترس و زیرەك بوو لە ناو فەوجەکە، ڕۆژانە

یەکترمان دەدیت، تا ساڵی ١٩٦١ ئەو کاتەی جووڵانەوەی عەشایەری دەستی پێکرد و لە ڕۆژی ١٩٦١/٩/١١ فەوجەکەمان چوونە شاری کۆیە لە ڕۆژی ١٩٦١/٩/١٤بەشەك لە فەوجەکەی ئێمە چوە شاری ڕانیە و لە بناری کێوەڕەش تووشی شەڕ بووین لەگەڵ لەشکری عەشائیری، ئەو شەڕە دوو ڕۆژ بەردەوام بوو ئەوە بوو من لەو ڕۆژی ١٩٦١/٩/١٦ من و هەڤاڵ عوسمان بەکر لەیەکتر دابڕاین نەك هەر لەگەڵ کاك عوسمان لە هەموو هەڤاڵەکانم دابڕام، جا ئەو دابڕانە درێژەی کێشا تا ساڵی ١٩٦٣ ئەوە بوو کاك عوسمانیش لەگەڵ ٥٨ عەریف و نائب عەریفی فەوجەکە بە یەکەوە هاتنە ناو شۆڕش، ئەو کاتە من لە بارەگای مەکتەبی سیاسی بووم لە گوندی مالومە، کاك عوسمان و هەڤاڵانی هاتنە گوندی مالومە و هەر لە گوندی مالومە من و کاك عوسمان و هەڤاڵەکانی تر بە دیداری یەکتر شادبووین. لە پاشان لەبەر کاری پێشمەرگایەتی دیسان لەیەکتر دابڕاین، کاك عوسمان کەوتە لای دەشتی کۆیە و منیش لە شاربازێڕ بووم لەگەڵ بەڕێز مام جەلال، لە ساڵی ١٩٦٤ لە کاتی ڕێکەوتنەکەی بارزانی لەگەڵ حکومەتی بەغدا ئەو کاتە مەلا مستەفا لە ڕانیە بوو، ئەوە بوو من لەگەڵ ئەندامانی مەکتەبی سیاسی چوومە ڕانیە بۆ لای بارزانی، بەڵام دووبەرەکیەکە زۆر بە توندی سەری هەڵدابوو. هەر ئەوەندەی مابوو شەڕی براکوژی دەست پێبکات، من دەمزانی کاك عوسمان بەکر سەرپەلە و لە گوندی دۆندارە و دەشم زانی کاك عوسمان پەلەکەی بە بیروباوەڕ لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسین، بەڵام نازانن چۆن و بە چ ڕێگایەك بێنە ناو ڕیزەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی، من لەو کاتە ناسکەدا داوام لە مام جەلال کرد گۆتم: من دەچم بۆ لای عوسمان بەکر تا ڕێوشوێنیان بۆ دیاری بکەم بۆ هاتنیان بۆ ناو هێزەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی، مام جەلال گۆتی:

زۆر باشە و بڕۆ ئەوە بوو من بە تەنیا بەڕێ کەوتم بۆ لای کاک عوسمان تا من گەیشتمە لای کاک عوسمان بەیانەکەی بارزانی دەرچوو بوو بەسەر هەموو هێزەکانی پێشمەرگە دا دابەش کرابوو، لە بەیانەکەی بارزانی وا نووسرابوو لە هەر جێگایەك تووشی هەر کەسێکی سەر بە باڵی مەکتەبی سیاسی بن یەکسەر بەبێ سێ و دوو بیکوژن و گوللەبارانی، بکەن جا ئەو ڕۆژە بوو من چوومە لای کاک عوسمان، کاک عوسمانیش هەر لە دوورەوە گوتی ئەوە جەلالیەك بەپێی خۆی هات ئێستا دەیکوژین، لەگەڵ کاک عوسمان و پێشمەرگەکان چاك و خۆشیمان کرد و لە پاشان کاک عوسمان بەیانەکەی دامێ و بەیانەکەم خوێندەوە بەپێی بەیانەکە با دەبا من بکوژن بەڵام کاک عوسمان بۆ نانخواردنی ئێواری گیسکەکی سەر بڕی و شەوەکەی لەگەڵ کاک عوسمان و جێگرەکەی محمد تەها کۆبوومەوە و ڕێگا و شوێنم بۆ دیاری کردن چۆن خۆیان دەگەیەننە لای مەکتەبی سیاسی، شەو لای کاک عوسمان مامەوە و بۆ بەیانی بە ڕەزالەت و بەشێوەیەکی نهێنی خۆم گەیاندەوە لای مام جەلال لە گوندی سەرگەڵو.

کاک عوسمان دەرفەتی بۆ ڕێك نەکەوت بێتە لامان، لە کاتێکدا کاک عوسمان و پەلەکەی هاتنە ناو هێزی باڵی مەکتەبی سیاسی کاتی گەرمە گەرمی شەڕی براکوژی بوو لە شاخی سوورکێو لەو ڕۆژە ناخۆشە من و کاک عوسمان بەدیداری یەکتر شادبووین، لەپاشان لە مانگی ٨ی ١٩٦٤ چووینە هەمەدان و لە ساڵی ١٩٦٦ گەڕاینەوە کوردستان و لە پاش گەڕانەوەمان دیسان لەیەکتر دابڕاین، لە ساڵی ١٩٦٧ لە شاری قەڵادزێ یەکترمان گرتەوە، لە پاشان چووینە بەکرەجۆ بەماڵەوە لە هێزی ڕزگاری لەگەڵ مام جەلال بووین، کاک عوسمان پێشمەرگەکی کوردپەروەر و ڕەشید بوو لە گوللەی

دوژمن نەدەترسا، کاک عوسمان بەر لە شەهیدبوونی دوو جار لە شەڕەکان بریندار بوو، کاک عوسمان لە شەڕی کرژە سەرکەوتنەکی زۆر گەورەی تۆمار کرد، بۆیە خۆشەویستی مام جەلال بوو کاک عوسمان پێشمەرگەکی زۆر بێباک و سەرەڕۆ بوو بەرلەوەی بگوازرێتەوە بۆ هەولێر بەڕێز مام جەلال بە منی گوت کاک عوسمان زۆر سەرەڕۆیە من دەزانم بە قسەی تۆ دەکات هەندەک ئامۆژگاری بکە من زۆری لێ دەترسم ئەو قارەمانەمان لە دەست بچێت، من لەسەر داوای مام زۆر ئامۆژگاری کاک عوسمانم کرد ئاگای لە خۆی بێ و داواشم لێکرد مەچووە هەولێر لێرە بە باشترە، بەڵام کاک عوسمان بەقسەی ئێمەی نەکرد هەر بەردەوام بوو لە بێباکی خۆی و چووە هەولێریش کاک عوسمان بەکر لەسەر نەترسی و بێباکی بەداخەوە ئەو قارەمانە لە مانگی ٨ی ساڵی لە گەڕەکی تەیراوە لە شاری هەولێر کەوتە ناو بۆسەی نەیاران و شەهید کرا بەداخەوە.

٢. پێشمەرگەی ناوداری گەلەکەمان، دووەم سەر لقی پێشمەرگەی سەرەتای شۆڕشی ئەیلول کاک عەریف سلێمان لە ڕۆژی ٢٠١٠/٧/٦ بە نەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایی کرد وماڵئاوایی لە کەس وکار و هاوخەبات و هاوسەنگەرەکانی کردو لەڕێوڕەسمێکی پڕ لە خەم و پەژارەدا بە ئامادەبوونی بەڕێز مامۆستا عەدنان موفتی و بەڕێز سەعدی پیرە و لێپرسراوی مەڵبەندەکان و لێپرسراوی ناوەندی کۆمەڵایەتی هەولێر و ناوەندەکانی دەوروبەر و جەماوەرەکی زۆری شاری هەولێری خۆشەویست تەرمی پیرۆزی لە گۆڕستانی گوندی براغ بە خاک سپێردرا هەزاران ڕەحمەت لە گۆڕەکەی بێ.

ڕاستە عەریف سلێمان کۆچی دوایی کرد، بەڵام خەرمانەکی گەورەی سەروەری و خەبات و بیروباوەڕی کوردایەتی بۆ بەجێهێشتین کە جێگای شانازییە، عەریف سلێمان خاوەن ماڵ و سەروەت و قەسر و سەیارەی باش نەبوو خاوەن خەبات و سەروەری و کوردایەتی ڕاستەقینەی پاك بوو، عەریف سلێمان خاوەنی بیر و باوەڕ و دەروێشی کوردایەتی بوو پلە عەریفیەکەی خۆی بە هەزار پلە و پایەی گەورە نەدەدا هەر بەناوی عەریفی خۆشەویست ناسراو بوو، کاك سلێمان لەو کاتەیەوەی من دەیناسم تا کۆچی دوایی کرد هەر هەژار بوو، بەڵام هەردەم خۆی بە فەقیر نەدەزانی و هەر خۆی بە دەوڵەمەند دەزانی، بەداخەو پێشی نەخۆش بکەوێ نە خۆی دەیزانی نەخۆشە نەئێمەش دەمانزانی تا برادەرە خۆشەویستەکانی دکتۆر حسن اسماعیل و دکتۆر حسین اسماعیل لە ئەنجامی پشکنینەکی زۆر کە لە تاقیگایەکی دکتۆر حسین بۆیان کرد دەرکەوت کاك سلێمان نەخۆشی کاری لێکردییە و چابوونەوەی ئاسان نییە، ناردیانە نەخۆشخانە ئەوەی پێویست بوو بۆ نەخۆشییەکە بۆیان کرد، بەڵام نەخۆشیەکە هەموو لەشی داگرتبوو، کاك سلێمان ورەی زۆر بەرز بوو دەیگوت: من لە مردن ناترسم، هەروەها بەڕێز مامۆستا عەدنان موفتی بۆ چارەسەری نەخۆشیەکەی عەریب سلێمان لە سلێمانی تەلەفۆنی بۆ مامۆستا مەلا محەمەدی بەحرکەی کرد گۆتی عەریف سلێمان ببەنە باشترین نەخۆشخانە و باشترین دکتۆری تایبەتی بۆ بێنن هەر لە پاش تەلەفۆنەکە من و مامۆستا مەلا محمد بەحرکەیی و کاك عەلی خزمی کاك عەدنانی دکتۆری تایبەتیمان بردە ماڵەکەی، دکتۆرەکە تەماشای ئیشاعە و فەحسەکانی کرد زانی کار لە کار ترازایە لەگەڵ ئەوەش بردمانە نەخۆشخانەی سەردەمی تایبەتی ماوەی ٣ ڕۆژ ماوە دکتۆرەکان

دەیانزانی چابوونەوەی نییە، گۆتیان بیبەنەوە ماڵێ بەو هەوڵدانەی بەڕێز کاك عەدنان عەریف سلێمان زۆر خۆشحاڵ بوو بە منی گۆت: حەمید گیان وادیارە حزب وازی لە من نەهێناوە منیش هەندەك دڵم داوە عەریف سلێمان ئەوەندە خەباتی زۆرە پیاو نازانی لەکوێوە دەست پێبکات، کاك سلێمان بەشەکی لە خەباتی سیاسی و پێشمەرگایەتی لە کتێبی لە دەنگەوە بۆ گوڵەگەنمەکان لە پاش خۆی بەجێ ماوە کە پڕە لە مێژووی شۆڕشی ئەیلول و لە خەباتی ڕاستەقینە، ئەو بیرەوەرییە بەشی یەکەمە، بەشی دووەم ماوە، هیوادارم منداڵەکانی نەیفەوتێنن، ئەمنیش وەکو پێشمەرگەیەکی دێرینی شۆڕشی ئەیلول کاك سلێمانم هەر بەسەر لقی خۆم دەزانی و زۆریش شارەزای خەباتی ئەو قارەمانەم، بۆیە بە پێویستی سەرشانی خۆم دەزانم هەندەك زانیاری لەبارەی خەباتی ئەو شۆڕە سوارەتان بۆ بگێڕمەوە، کاك عەریف سلێمان لە ساڵی ۱۹۲۸ لە گوندی مەلا ئۆمەر لە دایکبووە پلەی خوێندەواری، لە حوجرە فێری خوێندەواری بووە لە ساڵی ۱۹٥۰ چوویتە ڕیزی حیزبی پ.د.ك لە مانگی ۸ی ساڵی ۱۹٦۱ پێشی شۆڕشی ئەیلول دەست پێبکات لەگەڵ ۳ پۆلیسی قارەمان بە فەرمانی حزب چوونە شاخ و پاڵ چەکدارەکانی سەفین، کە ئەو کاتەی کاوانیەکان و پێشمەرگە ناودارەکانی وەکو مامۆستا اسماعیل حسین و کاك حسن ناسر، کەسایەتی ناوداری شەقلاوەو کە ئێستا لە شەقلاوەیە، کاك سلێمان لە سەرەتای مانگی ۹ی ۱۹٦۱ لەگەڵ شەهید حەمید کاوانی دەوری مەخفەری دەربەندی گۆمەسپانیان گرت، لە ڕۆژی ۱۱ی ۱۹٦۱/۹ حکومەتی عیراق بە فڕۆکە زۆر بە توندی بۆردومانی هێزەکەی دەربەندی کرد، لە پاشان گەڕانەوە سەفین و هەردەم لە شەڕ دابوون لەگەڵ جاشەکان، لە سەرەتای مانگی ۱۱ی ساڵی

١٩٦١ هێزی سەفین لەبەر بێ فیشەکی و لەسەرمان هاتنە دۆڵەڕەقە لای عەباسی مامەندئاغا، لە کاتی دامەزرانی تەشکیلاتی پێشمەرگە کە ئەو کاتە هەموو هێزی پێشمەرگەی ناوچەی سۆران دوو لق بوو، عەریف سلێمان سەر لقی دوو بوو، لە ساڵی ١٩٦٤ بەهۆی شەڕی براکوژی چووینە ئێران - هەمەدان لە پاش گەڕانەوەمان لە ئێران عەریف سلێمان هەر سەر لق بوو، لە کاتی شەڕەکان هەر لایەك پێویستیان بە هێز با لقەکەی عەریف سلێمانی دەگەیشتێ، ماوەیەك لقەکەی عەریف سلێمان چووە ناوچەی دوزخورماتوو و چوونە گوندی قەواڵی و گوندی زەردەلیکاو، لە ساڵی ١٩٧٠ پاش بەیانی ١١ی ئادار هەموومان گەڕاینەوە سەرکاری پێشوومان، بەڵام هەر لەگەڵ هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێ جارێکیتریش عەریف سلێمان هاتەوە ناو کۆڕی خەبات و دوای کارەساتی (٣١)ی ئابیش ماوەکی زۆر ئاوارەبوو لە سلێمانی، لە پاشان توانی خانووەکی ١٠٠ مەتری بکڕێ لە هەولێر، تا لەسەرخۆ بوو هەر بەسواری پاسەکان سەردانی برادەرانی خۆی دەکرد لە بەشی زۆری پرسەکان بەشدار دەبوو، کاك سلێمان ئەوەندەی چاکە چاندیە بەشی منداڵەکانیشی دەکات، ئەو هەموو جەماوەرەی بەشداری ناشتن و پرسەی عەریف سلێمان بوون بە تایبەت پێشمەرگە دێرینەکان ئەوە نیشانەی وەفاداری خەباتی خۆی بوو، سەلمێنرا کە خەڵکی کوردستان ڕێز لە کەسانی خاوەن خەباتی وەکو عەریف سلێمان دەگرن، ئەوە کورتە باسێك بوو لە سەروەرییەکانی عەریف سلێمان.

## قادر خەبات

## پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول و سەفەری هەمەدان و شۆڕشی نوێ بوو

حەیف و سەد مخابن ئەو شۆڕشە گەورەی بەڕێز (مام جەلال) لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلول دایمەزراندبوو، بە داخەوە ناوە ناوە بەردەکی گەورەی لەبەر دەردێ و کەلەنەکی گەورەی لێپەیدا دەبێت، خۆ ئەو کەلەنانەش بە ئاسانی پڕ نابێتەوە و ئەو کەسەی ئەو شۆڕشە گەورەیەی بنیاتنا، بەداخەوە خۆشی نەخۆشە و وا لە هەندەرانە. لە شەوی (٩/٣٠) لە کاتژمێر (١٠)ی شەو بوو لە کەناڵی گەلی کوردستان هەواڵی کۆچی دوایی شۆڕە سوارێکی ناوچەی باڵەکایەتی بڵاوکرایەوە ئەویش هەواڵی کۆچی هەڤاڵی دێرینم پێشمەرگەی ناوداری کوردستان قادر حاجی محمد ناسراوە بە (قادر خەبات) بوو من بەو هەواڵە زۆر دڵتەنگ بووم. لە پاش ماوەیەك دامان ئەو ڕۆژانەم وەبیر هاتەوە کە سەردەمانێك من و قادر خەبات پێکەوە لە سەنگەری بەرگری دا بووین، ڕۆژانی سەرەتایی شۆڕشی ئەیلولم وەبیرهاتەوە بەشی زۆرمان گەنج بووین لەگەڵ بەڕێز (مام جەلال) پێشمەرگە بووین و وامان دەزانی کوردستان ڕزگار دەکەین، ئێستاش وا تەمەن گەورە بوو نەخۆشی بەرۆکی گرتووین و لەولاوەش مردنە برا گەورەکەمان ناوە ناوە سواری سەر ملمان دەبێ لە یەکترمان دوور دەخاتەوە، بەڵام لەپاش مردنیش دڵمان بەوە خۆشە دەڵێی ئۆخەی تێر خزمەتی گەل و وڵاتی خۆمان کرد، جا قادر خەبات یەکێك بوو لەو قارەمانانەی تا مردن خزمەتی نیشتمانی خۆی کرد.

ئەو شۆڕە سوارە نە سەرمایەدارو نە سەرۆك عەشیرەت بوو، کوڕە فەلاحەکی کراش خواری ناوچەی باڵەکایەتی بوو. بە ئازایەتی خۆی و بە هەستەکی پاکی کوردایەتی و بە قارەمانەتی خۆی و بە دەست و قاچی خۆی، خۆی گەیاندە ئەو پلە و پایە پیرۆزە کە ئەوە جێگای شانازییە بۆ قادر خەبات چ لە شۆڕشی ئەیلول و چ لە شۆرشی نوێش خۆشەویستی سەرکردەکان بوو بەتایبەتی مام جەلال. قادر خەبات لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلول لە هێزی باڵەکایەتی بوو لە ساڵی ١٩٦٤ گوازرایەوە بۆ لقەکەی عەریف سلێمان، ئەو کاتە منیش هەر لە هەمان لق بووم. من باسی ئازایەتی ئەو قارەمانە ناکەم لەبەرئەوەی زۆر کەس دەیناسی و باسەکەش دوور و درێژە. من باسی یەك شەڕ دەکەم، لە ساڵی ١٩٦٤ جارەك تووشی شەڕەکی زۆر گەورە بووین لە کاتی شەڕەکە من و قادر خەبات لە یەکتر نێزیك بووین و لە کاتی گەرمە گەرمەی شەڕەکەدا سرودەکەی خوالێخۆشبوو خالید دلێری دەگوت پێشمەرگەین بە هەڵمەتین جاروباریش بە زەردەخەنەوە قسەی لەگەڵ من دەکرد ئەو ڕۆژەشم لە بیر ناچێ قادر خەبات تفەنگەکی زۆر خراپی هەبوو قەوانی نەدەداوە لە پاش تەقەکردن بە شیشکە قەوانەکەی دەردەهێنا. ئێمە لە پاش ڕێکەوتنەکەی ساڵی ١٩٦٤ ژمارەمان زۆر کەمی کردەوە واتە پێشمەرگەمان زۆر کەم بووە، هەر پەل (١٠ – ١٢) پێشمەرگەی مابووە پەلەکەی ئێمە ١٢ پێشمەرگە مابووین ئەمەش ناوەکانە: ١)حمید ڕەشاش ٢) قادر خەبات ٣) علی حاجی قادر ٤) سید مستەفا گۆمەشینی

٥) وەستا رەحمان ٦) عبداللە مامە ٧) جەوهەر محمد ٨) بەکر خۆشناو ٩) غازی علی ١٠) جەعفەر عبدالواحد ١١) کریم علی مەرزانی ١٢) عەونی علی.
ئێمە ئەو کۆمەڵە پێشمەرگانە ئەو ماوەی لە ئێران بووین وەکو برا بووین لە

پاش گەڕانەوەمان لە دۆلەڕەقە کاك قادر سەردانی ماڵەوەی کرد لە گەڕانەوەیدا کاك قادر گوتی باوکم زۆر پیر بووە توانای کاسبی نەماوە ماوەیەك دەچم یارمەتی باوکم دەدەم. کەواتە قادر خەبات خەمخۆری ماڵی خۆشی بوو وەکو وەفاداری هەر لەبەر ئەو وەفادارییەش بوو کاك قادر لە ئێمە دابڕا. ئێمە زۆرباش دەمانزانی قادر خەبات بەبێ خەبات و پێشمەرگایەتی ناتوانێ. هەر لە بەر ئەوەش بوو لە پاش ئاش بەتاڵ و لە سەرەتای سەرهەڵدانی شۆڕشی نوێ خۆی و بە چەند خزمەکی خۆی بوونە یەکەم مەفرەزەی چەکداری شۆڕشی نوێ. جا ئەو شۆڕە سوارەی کە ناوی قادر خەبات بوو یەکێ بوو لەوانەی کە ببوونە خۆشەویستی مام جەلال. لە کۆتاییدا هەر ئەوەندە دەسەڵاتم هەیە دەڵێم هەزاران رەحمەت لە گۆڕەکەت بێ هەڤاڵی دێرینم لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزم بۆ منداڵەکانی.

## پێشمەرگەی دێرین و مامۆستای بەتوانا
## خوالێخۆشبوو (ئیسماعیل محەمەد سەرهەنگ)

x دەرباس

مامۆستا ئیسماعیل بە ئەسڵ کوردی کوردستانی باکورە لەگەڵ ماڵی سەید تەهای نەهری بە ئاوارەیی هاتینە کوردستانی عێراق و لە ناحیەی باتاس نیشتەجێ بوونە خوالێخۆشبوو لە ساڵی (١٩٢٠) لە دایك بووە لە (٢٠٠٠/٣/١٩) لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کرد. مامۆستا اسماعیل لە بنەماڵەکی زانا و خوێندەوار بوو بۆیە محمد ئەفەندی باوکی کرا بە بەڕێوەبەری ناحیەی باتاس، بۆیە ئەو کاتەی مامۆستا ئیسماعیل لەپاش تەواوکردنی خوێندن بووە بەڕێوەبەری قوتابخانەی هەریر، لە ساڵی (١٩٦١) هەستی کوردایەتی وای لێدەکات مووچە و مامۆستایی بەجێ بێڵێ و دەچێتە ناو ریزەکانی پێشمەرگە لە شاخی سەفین و دەگاتە هەڤاڵەکانی خۆی وەکو (مامۆستا مەلا عەولا و مامۆستا شەمسەدین موفتی و مامۆستا اسماعیل حسین و کاك حسن ناسر و کاك قادر حسن و شەهید حەمید کاوانی و شەهید مەحمود کاوانی و کاك جلال کاوانی و مام تەها ڕەش و وەسمان حجرانی و سعید مەسیفی و خالید ئاژگەیی و ئەوانی تر). من ئەو کاتە لە گوندی پاش قۆتەڵ بووم، گوندی پاش قۆتەڵ لە دۆڵەڕەقەیە و لە ناوەڕاستی مانگی ١٠ی ١٩٦١ مامۆستا اسماعیل سەرهەنگ بۆ بینینی برادەرەکانی سەردانی بنکەی پاش قۆتەڵی کرد، ئەو کاتە برادەرەکانی لە بنکەی پاش قۆتەڵ بوون بەشی زۆریان ئەندامی ناوچەی (ڕانیە) بوون ئەمەش ناوەکانیانە:

١) سدیقە فەندی لێپرسراوی بنکە بوو

٢) تۆفیق مەلا سدیقی

٣) عبدالرحمن ڕووتە

٤)میرزا باپیر

٥) عەزیزی فەقێ سمایلی

٦) حەمید ڕەشاش سەربازی فیرار

٧) کاکۆ کوردە پۆلیسی فیرار

٨) عبداللە لاوە پۆلیسی فیرار

٩) جاروباریش عزیز بەگ سەردانی بنکەی دەکرد.

مامۆستا ئیسماعیل سەرهەنگ ماوەی ٨ ڕۆژ لامان ماوە، خوالێخۆش بوو تفەنگی برنۆی سەرتۆپی کوردی هەردەگرت و زۆر ئەشقە ڕاویش بوو، لە ڕاوکردن زۆر شارەزا بوو ڕاویشی بە تاپڕ و دیوجامە دەکرد، مامۆستا ئیسماعیل زۆر قسە خۆش و نوکتەچی و دەم بەپێکەنین و زانا بوو زۆر جار مامۆستا عومەر دەبابە و مامۆستا مەلا عەولا پرس و ڕایان بە مامۆستا ئیسماعیل دەکرد بۆ کاری گرنگ کەم کەس هەبوو لەناو شۆڕش مامۆستا ئیسماعیل سەرهەنگ نەناسێ، مامۆستا لەپاش سەفەرەکەی گەڕاوەو چۆوە سەفین لە مانگی ١١ی ١٩٦١ لەسەرمان و لەبەر بێبەرگی و بێپێڵاوی و کەم فیشەکی هێزی سەفین شکان و پاشەکشەیان کرد و سەفینیان چۆڵ کرد لەبەرئەوەی زۆر شەڕیان لەسەربوو لەگەڵ هێزەکانی حکومەت، ئەو کاتە هێزی پێشمەرگە شەڕی دەکرد قەوانەکانی خۆی کۆ دەکردەوەو دووبارە لەلای وەستایەکەی گوندی سکتان دایاندەگرتەوە، جا ناچار بوون پاشەکشە بکەن بۆ کوێستانی ساوسێوەکان، ئەو جێگایە دەکەوێتە پشتی گوندی

مەلەکان لەو جێگایەش ئەگەر عەباسی مامەندئاغا نان و پێڵاوی بۆیان نەبردبا هەموو هێزەکەی سەفین لە برسان دەمردن. من چوومە لای عەباس ئاغا پێم گوت: ئەگەر فریای ئەو هێزە نەکەوی دەمرن لە برسان، ئەوە بوو عەباس ئاغا مەردانە نان و پێڵاوی بۆیان نارد، خوالێخۆشبوو (عەریف سلێمان)یش لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا باس دەکات و دەڵێت لەو کاتی لە ساوسێوکان بووین ژمارەمان (١٥٠) کەس زیاتر بوو زۆرمان لە برسان تاقەتمان نەمابوو بە هەموومان پارەمان کۆکردەوە. پارەی (٤) سەر بزنمان هەبوو، چوار سەر بزنمان کڕی و سەرمان بڕین بۆ پێشمەرگەکان دەڵێت من و ئیسماعیل سەرهەنگ گۆشتمان وەبەر نەکەوت، بەڵام ئەو چووە ڕاوێ (٤) کەوی کوشت و ئێمەش گۆشتمان خوارد تا نانمان بۆ هات، لێرەدا پێویستە هەندەك باسی چاکە و پیاوەتی کوردپەروەری خوالێخۆشبوو (عەباس ئاغا) بکەین ئەو پیاوە ئەوەندە چاکە و پیاوەتی زۆر بوو هەر تەواو نابێ، هەموو ماڵ و سەروەتی لە دیوەخان و پیاوەتی سەرف دەکرد دیوەخانی عەباس ئاغا جێگای هەموو کەسێك بوو بەشی زۆری سیاسەتمەدارانی کورد کە فەرمانی گرتنیان بۆ دەردەچوو خۆیان دەگەیاندە ئەوێ و عەباس ئاغا دەیانی پاراست، هەر لە عەونی یوسف و حەمید عوسمان و عەزیز سورمێ و زۆرانی تر خۆیان لەلای ئەو دەپاراست، بە فەقیر و هەژارانەوە. من زۆر شارەزای ماڵی عەباس ئاغا بووم ئەو لەکاتی شۆڕش هێزی پێشمەرگەی لە برسێتی ڕزگار کردو هێزەکەی سەفینی لەسەر گوندەکانی خۆی دابەش کرد و (٣٠) پێشمەرگەشی لە دیوەخانی خۆی دانا هێزەکەی ئێمەشی بەخێوکرد کە ژمارەمان ٢٠٠ پێشمەرگە بوو تا (مام جلال) پارەکەی ڕێگای کۆیەی گرت.

ئەوە بەشێکی زۆر کەمی چاکەکانی عەباس ئاغا بوو من لێرەوە باسمکرد.

ئێستا دەگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان، لە پاش گرتنی پارەی ڕێگای کۆیە لە گوندی ڕێزینە هەموو هێزەکەمان کۆبووینەوە مام جلال و کاك عومەر دەبابە دوو لق پێشمەرگەیان دروست کرد سەر لقی یەك (مەلا عەولا) بوو سەر لقی دووش (عەریف سلێمان)، ئێمەش لەسەر لقەکان دابەش کراین کاك (ئیسماعیل سەرهەنگ) وا پێویست بوو لە بارەگای گشتی بێت، من یاریدەدەری سەرپەل بووم پەلەکەمان لە گوندی دواوە بوو (ئیسماعیل سەرهەنگ) لە بارەگای گوندی بێتواتە بوو، لە مانگی ڕەمەزانی (١٩٦٢)عومەر دەبابە سەفەری کرد بۆ ناوچەی پشدەر و ئەو کەسانەی خوارەوەی لەگەڵ خۆی برد:

١) صدیقە فەندی
٢) ئیسماعیل سەرهەنگ
٣) حەمید ڕەشاش
٤) عبدالرحمن ڕووتە
٥) ڕەشید عومەر
٦) مامە عدێ خەیلانی
٧) میرۆ خەیلانی
٨) احمد بارزانی

گەشتەکەمان دوور و درێژ بوو پاش تەواوبوونی گەشتەکەمان لە هەموو ناوچەی پشدەر گەڕاینەوە، لە پاش گەڕانەوەمان مام جەلال داوای من و (٧٠) پێشمەرگەی دیکەی کرد بۆ کاری پێویست چووینە ناوچەی سلێمانی لەو کاتەدا لە مامۆستا (ئیسماعیل سەرهەنگ) دابڕام تا ساڵی (١٩٦٤) چووینە (هەمەدان) لەوێ هەموومان یەکترمان گرتەوە مامۆستا ئیسماعیل و

کاک کەریم جەوهەر و کاک عوسمان سەعید لەسەر بێتەلەکان بوون، مامۆستا ئیسماعیل هەموو ئێواران بروسکەکانی بەشیکراوەیی بۆمان دەخوێندەوە واتە ڕۆژانە لە هەموو ڕووداوەکانی حکومەتی عیراق ئاگادار بووین، ئەوە بوو زیرەکی مامۆستا ئیسماعیل کە لە ساڵی ١٩٦٦ لە ئێران گەڕاینەوە دووبارە چووینەوە دۆڵەڕەقە لای عەباسی مامەند ئاغا، لەدواییشدا چووینە هەولێرو لەوێ سەرمان لە مامۆستا ئیسماعیل دا لە ماڵەکەی خۆی لە گەڕەکی شۆڕش، مامۆستا ئیسماعیل زۆر شارەزایی هەبوو لە سەر گوڵی جۆراوجۆر زۆر گوڵی کێویلکەی لە ناو حەدیقەی خۆی چاندبوو، ئەو لە کاتی پێشمەرگایەتیشی زۆر دەستپاك و دەروون پاك بوو و بۆیە لای هەموو سەرکردەو پێشمەرگەکان ڕێز و حورمەتی لێدەگیرا، هیوادارم منداڵەکانی ڕێچکەی باوکیان بگرنەوەو ئەو ڕێزلێنانە بپارێزن، چونکە کورد دەڵێ: مزگەوت ڕووخایە میحرابی مایە، ئەوە بوو کورتە یادەوەرییەك دەربارەی خەباتی ئەو قارەمانە هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی بێت.

تێبینی: مامۆستا (عبدالوهاب شێخانی) دەڵێ: پێش شۆڕشی ئەیلول من لە ڕانیە مامۆستا بووم، خەڵکی ڕانیە باسی (مامۆستا ئیسماعیل سەرهەنگ)یان دەکرد دەیان گوت لە ڕانیە مامۆستا بوو ئەوەندە دار و درەختی دەچاند، دار و درەختەکان هێشتا ماون هەر بە ناوی مامۆستا ئیسماعیل ناسراوە.

# سەرکردەی نەمر مامۆستا ساڵح یوسفی

ئەگەر مێژوونووسە بەڕێزەکان مێژووی سەرکردەکانی کورد بنووسن لە بارەی دڵسۆزی و دەستپاکی و دەرون پاکی و نەتەوەپەرستی ئەوە مامۆستا سالح یوسفی دەبێ پێشەنگ بێت، بەڕاستی سەیدا یوسفی پیاوەکی خۆڕاگر و کورد پەروەر بوو خاوەن هەڵوێستێکی کوردانەی نەگۆڕ بوو، سەرەتای ناسینم لەگەڵ ئەو پیاوە مەزنە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٥٩، ئەو کاتە من سەرباز بووم بە پلەی نائب عەریف لە فەوجی ٣ی لیوای سێ، کاتی گەرمە گەرمەی مقاوەمەی شەعبی بووە من ئەو کاتە ئەندامی حزبی پارتی بووم و لێپرسراوی فەوجەکە بووم، شەڕیش گەرم بوو لەگەڵ عاشیرەتی برادۆست و سۆفیەکانی شێخ ڕەشیدی لۆلان، لەو کاتەدا بوو حکومەت منی گواستەوە بۆ سەر میلاکی مقاوەمەی شەعبی لە ڕاخۆ، ئەو کاتە سەیدا یوسفی لێپرسراوی لیژنەی ناوچەی حزب بوو، من خۆم بە مامۆستا صالح یوسفی ناساند و کاری حزبایەتیمان بەیەکەوە دەکرد جا من لەبەر ئەوەی سەرباز بووم و مامۆستای مەشقپێکردنی مقاوەمەی شەعبی بووم حزب زۆر کاری نهێنی و گرانی پێدەکردم منیش هەموو کارەکانم سەربەرزانە ئەنجام دەدا، هەر لەبەرئەوەش بوو مامۆستا صالح یوسفی منی زۆر خۆش دەویست، تا گەیشتە ئەوەی لە ساڵی ١٩٦٣ یەکترمان دیتەوە لە ئەشکەوتەکەی مالومە کە ئەو کاتە پێشمەرگە بووم و بەرپرسی بارەگای مەکتەبی سیاسی بووم و سەیدا یوسفیش ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوو، بۆ کۆبوونەوە هاتە مەکتەبی

سیاسی، پەندەکی کوردەواری هەیە دەڵێ: کێو بە کێو ناکەوێ، بەڵام چاو بە چاو دەکەوێ دووەم جار لە ئەشکەوتەکەی مالومە بەیەکتر شادبووینەوە لەگەڵ سەیدا یوسفی، جا باسی من و خەباتی شاری زاخۆی بۆ ئەندامانی م.س گێڕاوەو لە پاش کۆبوونەوەکە دیسان لە یەکتر دابڕاین و شەڕی براکوژی ساڵی ١٩٦٤ بەسەر داهات و من لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسی چوومە هەمەدان، لە پاش گەڕانەوەمان لە ساڵی ١٩٦٦ من لە دۆڵە ڕەقە بووم سەیدا یوسفیش لێپرسراوی ڕادیۆی دەنگی کوردستان بوو لە ناوچەی باڵەکایەتی ئەوە بوو نامەیەکی بۆ ناردم و داوای لێکردم سەنگەر بگوازمەوەو بچمە لای ئەو، بەڵام من بەقسەم نەکرد و باڵی مەکتەبی سیاسیم پێ ڕاستتر بوو، بۆیە بەقسەی سەیدا یوسفیم نەکرد، بۆ جاری سێیەم لە پاش بەیانی ١١ی ئادار سەیدا یوسفی بووە وەزیری دەوڵەت حزبەکەی ئێمەش واتە باڵی م.س خۆی هەڵوەشاندەوە و چوونە ناو حزبی پارتی و بوونەوە بە یەك حزب، ئەو کاتەش سەردانی سەیدا یوسفیم کرد بەڵام لە پاش ئەو سەردانە لە یەکتر دابڕاین، ئەو پیاوە مەزنە و کوردپەروەرە لە ساڵی ١٩١٨ لەدایکبوە لە ساڵی ١٩٧٦ حزبی سۆشیالیستی دامەزراند، بەداخەوە لە ٢٥ حوزەیرانی ١٩٨١ بەدەستی دەست ڕەشەکانی حزبی بەعس بەهۆی نامەی بۆمب ڕێژکراو لە بەغدا شەهید کرا هەزاران ڕەحمەت لە گۆڕەکەی بێت.

## خەباتی پێشمەرگایەتی هەڤاڵی سەرکردە خوالێخۆشبوو
## کاك غەریب سعید ناسراو بە غەریب عەسکەری

کاك غەریب عەسکەری هەڤاڵەکی دێرین و خۆشەویستی من بوو، لە شۆڕشی ئەیلول لە ساڵی ١٩٦٤ ئەو سەرکردە کوردپەروەرە و قارەمانەم ناسی. ئەو کاتە من لە گوندێ عیساوێ بووم لە ئەکادیمی شۆڕش، کاك غەریبیش لە هێزەکەی کاك شەهید عەلی عەسکەری بوو ئەو کاتە هەردووکمان گەنج بووین. کاك غەریب گەنجەکی باڵا بەرز بوو پێشمەرگەکی چالاك و دڵسۆز بوو کوڕەکی گیان لەسەر دەست بوو. هەستەکی بەرزی نەتەوایەتی هەبوو کاك غەریب خۆشەویستی شەهید عەلی عەسکەری بوو، من و کاك غەریب زۆر برادەر بووین، بەڵام لەبەرئەوەی شوێنی کارکردنمان لە یەکتری دوور بوو درەنگ یەکترمان دەدیت، کاك غەریب زۆر پابەندی فەرمانەکانی حزب بوو زۆر بەشداری دەکرد لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانی حزب، بەڕێز مام جلال زۆر کاك غەریبی خۆش دەویست. هەر لە ساڵی ١٩٦٤. بە هۆی شەڕی براکوژی هێزەکەی باڵی مەکتەبی سیاسی چووینە ئێران و هەمەدان کاك غەریب عەسکەریش لەگەڵمان بوو، ئەو ماوەی لە هەمەدان بووین من و کاك غەریب بەشداری خولی فێربوونی زمانی ئینگلیزی بووین و بەشداری مەشقی سەربازیش بووین. کاك غەریب پیاوەکی زیرەك بوو هەوڵی دەدا پێشبکەوێ من پێم وابوو کاك غەریب دەبێتە سەرکردەکی باش، لە پاش گەڕانەوەمان بۆ کوردستان کاك غەریب لەگەڵ کاك علی و مام جلال

بەلای حاجی ئۆمەراندا گەڕانەوە لەوێندەر هەڤاڵانی ئێمە توشی شەڕێکی گەورە هاتن بە سەرکردایەتی شەهید عەلی عەسکەری و کاک رئیس کمال مفتی کاک غەریبیش بەشداری ئەو شەڕە بوو بەداخەوە لەو شەڕەدا ١٣ پێشمەرگەیان شەهید بوو لە چیای کۆرەك. لەپاش شەڕەکە گوندەکانی کرژە و چەرمەگا لە ساڵی ١٩٦٧ لەشکرەکەمان چووینە بەکرەجۆ ئەو ماوەی لە بەکرەجۆ بووین بەڕێز مام جلال فەرمانی دا پێویستە هەموو پێشمەرگەیەك ئەوەی خوێندەواری هەیە ئازادە ڕۆژانە یان حەفتانە یان مانگانە بە سەربەستی بیروڕای خۆی بنووسێ و لە بەر دەرگای ژوورەکەی مام جلال بدات. کاک غەریب نووسینی حەفتانەی هەبوو ئەو نووسینانە هەموو پێشمەرگەکان دەیانخوێندەوە لە ساڵی ١٩٦٩ من گوازرامەوە بۆ هەولێر و لەگەڵ کاک غەریب دابڕاین و یەکترمان نەدیتەوە، لە شۆڕشی نوێش کاک غەریب خاوەنی دەست و تفەنگی خۆی بووله ساڵی ١٩٨٨ پێش ئەنفالەکان کاک غەریب خۆی و لەشکرەکەی لە دەوروبەری گوندی چەرمەگا بوو، من ئەو قسەیەم لە عومەری حەمە عەلی بیست ئەو کاتە ئەو جاشی حکومەت بوو وابزانم لە ساڵی ٢٠٠٥ بوو من چوومە مەڵبەندی پێشمەرگە لەوێش بە دیداری ئەو هەڤاڵە دێرینە شاد بووم ئەو کاتە پلەکەی عەقید بوو.

ﺟـ د ﻪ

## بەشی دووەمی قسە خۆشەکانی دەروێش قادر ناسراو بە قالە دێگەڵ

لە ناو دانیشتوانی گوندەکانی ١٢ دێی دۆڵێ، باسیان دەکرد دەیانگوت دەروێشەکانی شێخ محمدی گاپیلۆن هەریەکە و بە شتێك توورە دەبوون جا هەندەکیان جونیان دەدا هەندەك بە جۆرە قسەیەك پاشە و پاش دەکشانەوە وەك دەروێش سالحە ڕەش هەندەکیان بە ناوی تەماتە تورە دەبوون یان بەناوی باینجان و شتی تریش، شێخ محمدی گاپیلۆن شێخەکی دیار و ناوداری ناوچەکە بوو و زۆر خۆشەویست بوو، ئێمە باسەکەمان لەسەر نوکتەکانی دەروێش قادرە، لە بەشی دووەمدا باسی چەند نوکتەیەکی تازە دەکەم ئێمە لە بەشی یەکەم گوتمان دەروێش قادر بە چوار شت یان بلێین بە ناوی چوار ناو تورە دەبوو جوێنی بەهەرکەسێك دەدا کە ناوی ئەو چوار ناوەی هێنابایە، بەڵام لە کاتی شۆڕشی ئەیلول دوو ناوی تری زیاد کردبوو، ناوەکانی دەروێش قادر پێیان توورە دەبوو ئەمانە بوون:

١) ناوی گوندی دێگەڵ

٢) ناوی گوندی بانەلە

٣) وشەی کێشامەوە

٤) میاوەی پشیلە

٥) عمر دەبابە عەرەبی نازانی

٦) مام جلال کەچەڵە،

ئەمانەی خوارەوەش نوکتەی بەشی دووەمن.

١) ڕۆژەك ئەسعد و ڕەئووف چوونە سەردانی دەروێش قادر ئەو دوو کوڕە زۆر گەمە و گاڵتەیان لەگەڵ دەروێش قادر دەکرد. کە دەچنە ماڵی دەروێش قادر زۆر دەروێش تووڕە دەکەن، دەروێش قادر لە تووڕەییان عار دەگرێ و زەرگەکەی دەردەهێنێ لە گوپی خۆی دەداو دەرگای ماڵەوەش لەسەر ئەسعەد و رەئوف قەپات دەکات. ئەسعەد و ڕەئوف زۆر دەترسێن بە دەروێش قادر دەڵێن تۆبە جارەکی تر وا ناکەین دەروێش بەخۆی و بە زەرگەوە دێ و دەڕوا و دەڵێ تۆبەی چی ئەمڕۆ دایکی هەردووکتان دەگێم، ئەسعەد لە ترسان خۆی لە پەنا لانکەکە نابوو ڕەئووفیش لە ترسان سەری لە کولانەکەی خانووەکە نابوو هەوڵی دەدا هەڵبێت، بەڵام بە کولانەکەوە نەدەچوو. منیش بە ڕێکەوت چوومە گوندی و چوومە ماڵی دەروێش قادر لە دەرگامدا خێزانەکەی دەروێش دەرگای کردەوە، گۆتی بەخوای چابوو هاتی وەرە بگە پێیان دەرگامان کردەوە

١) ئەسعەد لە پەنا لانکەی دەپاڕاوەو ڕەووف هاواری دەکرد دەروێش تۆبە، دەروێش قادر کە منی دیت بەخۆی و زەرگەکەی بۆ لای من هات گۆتی کاك حەمید من ئەمڕۆ دایکی ئەسە و ڕەفەت بۆ دەگێم. منیش دەروێشم گرت و اسعد و رەووف لە ترسان ئارەقەیان کردبوو دەروێش زەرگەکەی لە گوپی خۆی هێنا دەرێ و هێور بووەوە.

٢) جارەك مامۆستا ابراهیم سەفەرەکی کرد لە گەڕانەوەی مسجلەکی بچووکی لەگەڵ خۆی هێنا بوو دەروێش قادریش قەت مسەجەلی نەدیبوو، ڕۆژەك ئەسعەد چووە لای دەروێش قادر دوو بە دوو زۆر قسە دەکەن، دەروێش قادر باسی بەسەرهاتەکی خۆی دەگێڕێتەوە بە ئەسعەد دەڵێ ئەسە بۆ کەسی نەگێڕیەوە، ئەسعەدیش ئەو باسەی بۆ من گێڕاوە باسەکە ئەوەندە

خۆش بوو بە ئەسعەدم گۆت بڕۆ بانگی دەروێش قادر بکە ئەسعەدیش چوو دەروێش قادری هێنا و هەر من و دەوریش و ئەسعەد بووین لە بنەبانی ئەشکەوتەکە دانیشتین بنەبانی ئەشکەوتەکە هەندەك تاریك بوو منیش مسەجەلەکەی مامۆستام هێنا شاردمەوەو دەستمان بەقسان کرد و من مسەجەلەکەم کردەوە دەرویش قادرمان ناچار کرد باسەکەی خۆی بگێڕێتەوە منیش هەموو قسەکانم تەسجیل کرد کە هاتینە دەرێ مامۆستا ئیبراهیم لەگەڵ خدر لەناودەرگا بوون. لە پاشان هەموومان دانیشتین خدر ڕادیۆیەکی هەبوو، منیش بە خدرم گۆت ئەو ڕادیۆیەم بدێ بزانم دەنگوباس چیە لە جیاتی ڕادیۆیەکە بکەمەوە مسەجەلەکەم کردەوە کە مسەجەلەکە قسەی کرد مامۆستا ئیبراهیم بە دەروێش قادری گۆت دەروێش ئەمە دەنگی تۆیە..؟ دەروێش قادر بە خدری گۆت خلە دایکت بگێم من لە بنەبانی ئەشکەوتەکە قسەم کرد کوێڕا ئەم ڕادیۆیەی تۆ ناردیە بەغدا و قسەکەی من لێدەنەوە.

٣) ڕۆژەك براکانی دەروێش قادر هاتنە بنکە و شکاتیان لە دەروێش قادر کرد، گۆتیان دەروێش قادر هەندەك بنەداری موڵکی ئێمەی بۆ خۆی لادایە. دارەکان دار بەڕوو بوون ساڵانە بۆ ماڵات ئەو دارانەیان دەبڕی پێیان دەگۆت جێی گەڵ. جێی گەڵ زۆر لە دێگەڵ نزیکە، منیش لەگەڵ دەروێش قادر و براکانی چووینە شوێنەکە و کەسمان لە ترسی جوێندانی دەروێش قادر نەماندەوێرا بڵێین ئەم دارانە جێی گەڵی کامتانە بە دەروێش قادرم گۆت دەروێش من دەتوانم بڵێم ئەم دارانە جێی گەڵی کێن. گۆتی بەڵێ ئەوجا بەسەربەستی قسەمان کرد.

٤) مام جەلال لە بنکە بوو خوالێخۆشبوو مەلا ناسیح هاتە لامان مەلا ناسیح دەروێش قادری نەدەناسی مام جەلال بە مەلا ناسیحی گوت مەلا ئەو ناحیەی لە نێوان هەولێر و کۆیە ناوی چیە مەلا گوتی دێگەڵە دەروێش قادر بە مەلا ناسیحی گوت دایکت دەگێم مەلا گوتی ئەوە چیە.

٥) جارەك من و عەلی مام ڕەزا چووینەماڵی دەروێش قادر لە پاش چا خواردنەوە داوامان لە خێزانەکەی دەروێش قادر کرد بە دەروێش قادر بڵێ دەروێش دێگەڵ خێزانەکەی ئەوەندە ژنەکی باش و خانەدان بوو گوتی ئاخر جنێوی بە منیش دەدات ئێمە وامان دەزانی جنێو بە خێزانەکەی نادا، بەڵام لە بەر ئێمە خێزانەکەی گوتی دەروێش بانەلە دەروێش قادر جنێوی بە خێزانەکەی خۆشیدا.

## چاکە و خانەدانی و کورد پەروەری عەباسی مامەند ئاغای ئاکۆیان ✗

عەباسی مامەند ئاغا سەرۆکی عاشیرەتی ئاکۆ بوو، سنوری دەسەڵاتەکەی لە ناوچەی قەزای ڕانیە تا دەگاتە حاجی ئۆمەران بوو و عاشیرەتی مەندەمەر و عاشیرەتی بۆری و بابۆریش سەر بە عەباس ئاغا بوون. عەباس ئاغا یەکێکە لە ئاغا هەرە ناودارەکانی کوردستان لە هەموو ڕوویەکەوە، هەموو حکومەتە یەك لە دوای یەکەکان کە دەهاتنە سەرکار، ڕێزی تایبەتیان بۆ عەباس ئاغا هەبوو، ئەو پیاوە ئەوەندە سەربڵند بوو لە هەموو کوردستان بە ناوودەنگ دەناسرا و قەتیش چەکی جاشایەتی دژی میللەتەکەی خۆی هەڵنەگرت، من بۆیە باسی ئەو پیاوە مەزنە دەکەم لە چەند قۆناغی جیاجیا خزمەتی لێقەوماوان و شۆڕش و پێشمەرگە و سەرکردە و پێشمەرگەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی کردییە، جا لە بەرئەوە من ماوەیەکی زۆر لە ناوچەکە و لەگەڵ بنەماڵەکەیان ژیاوم و شارەزایی باشم هەیە لەسەریان، بۆیە وام بەباش زانی ئەو زانیارییانە وەکو خۆی بۆ مێژوو بنووسمەوە، هەر چەندە من لە بیرەوەرییەکەی خۆم باسی ئەو پیاو سەربەرزەم کردیە وەکو وەفادارێك بەڵام ئەو نووسینەم بۆ منداڵەکانی عەباس ئاغایە. جا ئەگەر چاکە لە بەرچاو بێ دەبێ ئەوانەی شارەزای عەباس ئاغا بوون لە بیرەوەرییەکانیان هەرگیز لەبیری نەکەن، لەبەرئەوەی دیوەخانی عەباس ئاغا جێگای حەوانەوەی بەشی هەرە زۆری سەرکردەکان بوو لە کاتی تەنگانە و ترسی حکومەتەکانی عێراق. ئێستا دێمە سەرباسی ناسین و کردەوەکانی عەباس ئاغا و سەرەتای

ناسین و چاوپێکەوتنم لە ساڵی ١٩٥٩ تا ١٩٦١ من سەرباز بووم لە فەوجی سێی لیوای (٣)، ئەو کاتە چەند سەربازەکی گوندی سەرکەپکان و دۆڵەڕەقە لای من سەرباز بوون، ئەوان زۆر باسی چاکە و پیاوەتی و دەسەڵاتی عەباس ئاغایان بۆ من دەکرد من ئەو کاتە ئەندامی پارتی بووم و لە سەرەتای ساڵی ١٩٦١ دەنگ و دۆل بڵاوبۆوە ئاغا ناودارەکانی ناوچەی ڕانیە و کۆیە و ناوچەی سلێمانی خەریکی کۆکردنەوەی هێزن دژی عبدالکریم و بەنیازی ئەوەن شۆڕش بکەن. ئەو ئاغایانەی بە گەرمی باسیان دەکرا لە ڕووی هێز و دەسەڵات:

١) عەباس مامەند ئاغای سەرۆکی عەشیرەتی ئاکۆ

٢)سمایلی سوارئاغا سەرۆك عاشیرەتی بلباس،

٣) لە ڕووی دەوڵەمەندی و پارەداری باسی شێخ حسێنی بۆسکێن،

٤) کێخوا سمایلی تەلان،

٥) کاکەزیادی کۆیە،

٦) عزیزی صالح ئاغای خەرابە،

٧) باسی مینەی عەلی ئاغای ڕایەتیش دەکرا،

ئەو دەنگوباسانە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر بڵاودەبوونەوە، ئەو قسانەو ئەو دەنگوباسانەو چالاکی ڕێکخستنەکانی حزب یەکتری دەگرتەوەو لەگەڵ عبدالکریم قاسم لێك تووڕەبوون، لە پاش گەڕانەوەی بارزانی میرانی صدیق بەگ کوژرا و بە مل کاوانیەکان داهات و کاوانیەکانیش چوونە شاخی سەفین و وەکو مەفرەزەیەکی سەرەتایی، لە پاشان هێزەکانی عەشائیری لە ناوچەی ڕانیە و کۆیە و دەربەندی خان و دەربەندی بازیان ڕێگایەکانیان گرت و لە حکومەتی عبدالکریم عاسیّ بوون. حکومەت هەوڵیدا لەڕێگای گفتوگۆ بڵاوە

بە هێزەکانی عەشائیری بکات، بەڵام ئەو گفتوگۆیە سەری نەگرت، جا حکومەت هەوڵی دا لە ڕێگای بەکارهێنانی هێزی عەسکەری بڵاوە بە جووڵانەوەی عەشائیری بکات، ئەوە بوو حکومەت لیوای (٣)ی تەرخان کرد بۆ سەرکوتکردن و بڵاوەپێکردنی جوڵانەوەی عەشائیری بەوشێوەیە:

١) فەوجی یەك بۆ دەربەندی خان،

٢) فەجی دوو بۆ دەربەندی بازیان،

٣) فەوجی سێ کە من لەگەڵ ئەو فەوجە بووم بۆ ناوچەی کۆیە و ڕانیە

جا لە بەرەبەیانی ١٩٦١/٩/١١ هەر سێ فەوجەکە بە پاڵپشتی فڕۆکە و تۆپی گەورە چوونە سەر هێزەکانی عەشائیری، ئەوەبوو هێزی عەشائیری توانای بەرگری کردنیان نەبوو، لەماوەی چەند کاتژمێرێك ئەو هێزە گەورەی عەشائیرەکان بۆ یەکجاری بڵاوەیان کرد و چوونەوە ماڵەکانی خۆیان و لە هەمان کاتیشدا چەند ئەندامەکی سەرکردایەتی حزبیش فەرمانی گرتنیان هەبوو، لەگەڵ هێزەکانی عەشائیرەکان وەکو:

(١. مام جەلال ٢. کاك عومەر دەبابە ٣. کاك عەلی عبدالله، ٤. مەلا عەولا، ٥. شەمسەدین مفتی)، ئەو سەرکردانە هەر یەکە و بنکەکی بچووکی چەند کەسیان هەبوو لە ناوچەکان وەکو بنکەی چەمی ڕێزان بنکەی مام جەلال بوو. بنکەی گوندی پاش قۆتەڵ بنکەی کاك عمر دەبابە بوو و لە شاخی سەفینیش هێزەك هەبوو بەسەرکردایەتی مەلا عەولا و شەمسەدین موفتی، ئەوە سەرەتای شۆڕشی ئەیلولە و شێوەی سەرهەڵدانەکەیەتی، ئێستا دەگەڕێمەوە سەر باسی عەسکەری و حکومەت، ئەو هەرگیڤەی هێزی عەشائیری نەماو حکومەت دڵنیابوو تەقە لە کوردستان نەما و ئێمە فەوجەکەمان لە شاری کۆیە، بوو لە ڕۆژی ١٩٦١/٩/١٥ سریەیەك لە

فەوجەکەی ئێمە بەبێ ترس و بێ باکانە بەسەرکردایەتی عەقید کافی چووینە (ڕانیە)، لە ڕانیەش چووینە گوندی بۆسکێن، کاتی تووتن ڕنین بوو پێش ڕۆژئاوا بوو لە گوندی بۆسکێن گەڕاینەوە بەرەو ڕانیەو لە نێزیک گوندی سەیداوە لە شاخەکەی کێوەڕەش تەقەمان لێ کرا، ئێمەش لە لۆرییەکان دابەزین و هەندەك تەقەمان کرد، بەڵام خۆمان ڕانەگرت و لۆرییەکانمان بەجێهێشت و بەپێیان گەڕاینەوە ناو مەرکەزەکەی ڕانیە. لەناو مەرکەزەکەش ئێمەی ئەندامانی حزب بڕیارماندا ئەگەر بەیانی واتە ڕۆژی ١٩٦١/٩/١٦ هێزی عەسکەری هات و بووە شەڕ لەگەڵ هێزی عەشائیری ئێمە هەموومان خۆمان و چەکەکانمان بچینە پاڵ ڕیزی عەشائیری، جا بۆ ڕۆژی ٩/١٦ هێزمان بۆ هات و بووە شەڕ لە کێوەڕەش تا بەرەبەری ڕۆژئاوا بوون، من ئەو ڕۆژە خۆم و ڕەشاشەکەم چوومە ناو هێزی عەشائیری کە ئەو هێزەش بە سەرکردایەتی شێخ حسێنی بۆسکێن بوو لەگەڵ ئاغاکانی ناوچەی مەرگە و پشدەر، من لە عەسکەری لێپرسراوی حزب بووم لە فەوجەکە من بە بیروباوەڕی کوردایەتی پێشمەرگایەتی فێرارم کرد، بەڵام بە داخەوە جەنابی شێخ حوسێن تەماحی لە ڕەشاشەکەم کرد و چەکی کردم، بەڵام من بە شێخ حسێنم گوت ڕۆژەك دێت بە دەستی خۆم ڕەشاشەکەت لێوەردەگرمەوە، من نووسینەکەم لەسەر باسی عەباس ئاغا بوو، بەڵام ماجەرای ناسینەکەم وای دەخواست ئەو قسانەش بکەم جا لە پاش چەککردن، شەو داهات و لە گوندی بۆسکێن خەریکی نانخواردن بووین، قاسیدەك لەلای عەباس ئاغاوە هات بە سواری لۆریەکی عەسکەری لەو لۆریانەی کە ئێمە بەجێمان هێشتبوو، ئەو قاسیدەی لۆریەکی دەهاژوا پێشتر سەرباز بوو لەلای من لەو جێگایە منی ناسیەوەو ئەوە بۆ من زۆر باش بوو، عەباس ئاغا داوای لە شێخ حسین

کردبوو بەو لۆرییە بێنە سەرکەپکان جا لە پاش نانخواردن شێخ و چەند چەکدارێك و من سواری لۆرییەکە بووین بەرەو گوندی سەرکەپکان بەڕێ کەوتین، لە ڕێگا کوڕە شوفێرەکە باسی منی بۆ شێخ حوسێن کردبوو، بەڵام شێخ چەکەکەی هەر نەداوە، ئێستا دەگەڕێمەوە سەر باسەکەی خۆم، عەباس ئاغای ڕەحمەتی، من لە بەرئەوەی ئەوەندە ناوی ئەو پیاوەم بە چاکەو کوردپەروەری بیستبوو بە ئاوات بووم بیبینم، جا شەو بوو کە گەیشتینە سەرکەپکان دیتم لەشکرەکی زۆر لە سەرکەپکان بوو، هەرچەندە غەمبار بووم، بەڵام کە ئەو لەشکرەم دیت زۆر خۆشحاڵ بووم، هەرچەندە زۆر ماندوو بووم لە بن کەپرەکە ڕاکشام و ئەوەندەی نەبرد چەکدارەك هات گۆتی کاکی عەسکەر هەستە وا کاك عەباس دێتە لات، من زۆر زۆرم پێخۆش بوو هەستامەوەو خوالێخۆش بوو عەباس ئاغا هاتە لام کە چاوم پێی کەوت هەموو ئەو باسانەم بەبیر هاتەوە کە باسیان دەکرد، ئەویش گۆتی: کاکی عەسکەر ماندو نەبی و بەخێربێیت منیش وەڵامم داوە گۆتی کاکی عەسکەر چما تەقەت لە لەشکری کورد کردووە گۆتم ئاغامن تەقەم لە لەشکری کورد نەکردووە من ئەندامی حزبم بۆ کوردایەتی هاتووم عەباس ئاغا گۆتی فڵانە کەس باسی تۆی بۆ من کردووە، بەڵام شێخ حوسێن وا ناڵێ، من گۆتم شێخ غەدری لە من کردیە و ڕەشاشەکەی لە من ساندیە گۆتی با جارێ وا بێ تۆ بەخێربێی من داوام لە کاك عەباس کرد گۆتم ئەگەر چەکداری حزب هەبن من حەز دەکەم بچمە لای ئەوان جا چەکدارەکی لەگەڵ من نارد من چوومە بنکەی پاش قۆتەڵ ئەو بنکەی سەر بەئەندامانی ناوچەی ڕانیەوە بوو و ئەو کەسانەی لە بنکەکە بوون ئەمانەبوون: (١. صدیقە فەندی، ٢. تۆفیقی مەلا صدیقی، ٣. عبدالرحمن ڕووتە، ٤. میرزا باپیر، ٥. عزیز فەقێ سمایلی، ٦.

ئەمینە کوێر) هەر ئەوەندەم لە بیرە هەر لەو ماوەیەش بوو ماڵی عەباس ئاغا لە ترسی فڕۆکە گواستیانەوە چوونە ناو ئەشکەوتی عەلی کاوانی، ئێمە گۆتمان هێزی عەشائیری بڵاوەی کردبوو، بەڵام چەند ئاغایەك لەلای عەباس ئاغا مابوونەوە، لە پاشان ئەوانیش بڵاوەیان کردو هەر ئێمەو عەباس ئاغا لە دۆڵەڕەقە مابووین، لە دەورووبەری(١٩٦١/١١/١٥) ئەو هێزەی سەفینی کە ژمارەیان (٢٠٠) کەس دەبوو لە سەرمان و لە بەر بێ بەرگی و لە برسان و لە بەر بێ فیشەکی سەفینیان چۆڵ کرد و هاتنە دۆڵەڕەقە، جا لێرەدا چاکە و پیاوەتی کوردپەروەریی عەباس ئاغا دەردەکەوێت، عەباس ئاغا ئەو (٢٠٠) کەسەی لە سەر گوندەکانی خۆی دابەش کرد (٢) کەسیشی لە ماڵی خۆی دانا، خۆ ئەگەر عەباس ئاغا نەبایە ئەو هێزەی ئێمە لە ناوچەکانی تری کوردستان جێگایانە نەدەبۆوە، لەبەرئەوەی چالاکی چەکداری لە کوردستان نەمابوو خەڵك باوەڕی بەوەی نەبوو شۆڕش زیندوو دەبێتەوە، جا ئەو ٢٠٠ پێشمەرگەیە لەلای عەباس ئاغا بەخێوکران تا پارەکەی ڕێگای کۆیە گیراو لە پاشان لە گوندی ڕێزینە ناوی دەستە و پەل و لق داندرا و کاتیش بەرەو بەهار دەچوو لە مانگی ٣ی ١٩٦٢ پێشمەرگە دەستی بە چالاکی کرد و عەباس ئاغاش خاوەنی چەکدارەکی زۆر بوو وەکو عاشیرەت کە هەموو کاتێك ئامادەبوو بۆ یارمەتیدانی پێشمەرگە ئەوەندە پیاوەکی زانا و سیاسی بوو لەگەڵ

هەموو کەسێك دەگونجا، لەگەڵ عاشیرەتەکانی دەورووبەری خۆشی دۆستایەتی و هاوکاری باشی هەبوو بە ژن و ژنخوازی لەگەڵ سمایلی سواراغای سەرۆکی عەشیرەتی بلباس زاوا و خەزور بوو، لەگەڵ ئەنوەر بەگی بێتواتەی عاشیرەتی خۆشناوان زاوا و خەزور بوو، وە لەگەڵ جەلال بەگی میر

حەمەدەمینی دەرگەڵە زاوا و خەزور بوون و لەگەڵ کاک ئەحمەدی دۆڵی خانە قاش زاوا و خەزور بوون، بۆیە عەباس ئاغا لەلای عاشیرەتەکانی دەورروبەرو ناو هەموو عەشیرەتی خۆشی زۆر خۆشەویست بو کەس نەبوو سوێند بەسەری کاکەباس نەخوا، لە ڕەمەزانی (١٩٦٢) ئەو هێزەی هەمان بوو کە ژمارەیان (٢٠٠) پێشمەرگە بوو کراین بە دوو بەش بەشەك بۆ لیوای سلێمانی بە سەرکردایەتی (مام جلال) بەشەکەی دیکەش بە سەرکردایەتیی کاك (عمر دەبابە و مەلا عەولا) بۆ لیوای هەولێر، من بەبەر هێزی لای سلێمانی کەوتم، لە دۆڵە ڕەقە دوور کەوتمەوە، بۆ ڕاستیش شۆڕش بە خەبات و دەست و قامی ئەو (٢٠٠) پێشمەرگەیە سەری هەڵداوەو زیندوو بۆوە، لە ساڵی (١٩٦٣) بەشی زۆری ناوچەکان ئازاد کران و شۆڕش لەوپەڕی بەهێزی دا بوو، لە ساڵی ١٩٦٤ دووبەرەکی و شەڕی براکوژی دەستی پێکردو لەبەر شەڕی براکوژی باڵی (م.س) چووینە ئێران و لەوێشەوە بۆ هەمەدان، لە ساڵی ١٩٦٦ لە ئێران گەڕاینەوەو لە پاش گەڕانەوەمان دووبارە عەباس ئاغا بوو پشت و پەنای هێزەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی، ئێمە باسی وردەکارییەکانی گەڕانەوەمان ناکەین هەر ئەوەندی دەڵێم بارزانی و مەکتەبی سیاسی ئێمە، لەگەڵ یەکتر بەشێك بوون لە هێزەکانی باڵی (م.س) و سەرکردایەتیش خۆیان هاویشتەوە بن باڵی عەباس ئاغا، چونکە ئەگەر وایان نەکردبا نە سەرکردەکان دەمان و نە هێزەکەش دەما، لەبەرئەوەی ئەو کاتە نە حکومەت و نە بارزانی لە بارەی شەڕکردن خۆیان لە عەباس ئاغا لادەدا، لە پاش گەڕانەوەمان بارەگای ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لە دۆڵەڕەقە لە گوندی سپیاو بوون ئێمەش وەکو پێشمەرگە بە فەرمانی حزب ناومان لە خۆمان نابوو هێزی عەباس ئاغا ئازوقەمان لە عەباس ئاغا وەردەگرت، ئەو کاتە خەڵکەکی زۆر دەربەدەر ببوون لە ناوچەی دۆڵەڕەقە بوون عەباس ئاغا

دەیانی ژیاندو مانگانەماڵەکان لە ماڵی عەباس ئاغا ئازوقەیان وەردەگرت و یەکەك لەو ماڵانە ماڵی من بوو. ئەو پیاوە هەموو ماڵ و سەروەتی خۆی لە رێگای کوردایەتی و پیاوەتی سەرف کرد هەردەم دیوەخانەکەی پڕبوو لە مێوان، جا دووبارە لە پاش گەڕانەوەمان دووبەرەکی سەری هەڵدا و کار گەیشتە ئەوەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی شەو لە گوندی نۆریێ لەگەڵ عەباس ئاغا لە ماڵێك مێوان بوون، ئەوەبوو شەو مەفرەزەکی چەکداری بارزانی بۆ گرتنی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی هاتبوون، بەڵام عەباس ئاغا ئەوانی ڕزگار کردو وای نەکرد بکەونە دەست بارزانیەکان، جا لە پاش هەڵاتنی ئەوان بەیانی ڕێکەوتی ٢٩ حوزەیران دەرچوو. بە داخەوە لەو کاتە ناسکە عەباس ئاغا نەخۆش کەوت، ئەو کاتەش دکتۆر لە ناوچەکە نەبوو هەر فازل شوانی هەبوو ماڵی لە گوندەکەی بەردانگە بوو ئەویش دکتۆر نەبوو جاروبار سەردانی عەباس ئاغای دەکرد، جا دووبارە باڵی مەکتەبی سیاسی بە هاوکاری حکومەت هێزی ڕێکخست و شەڕی براکوژی دەستی پێکردەوەو ئەو هێزەی ئێمە لە هەمەدان گەڕابووینەوە چوونەوە پاڵ هێزی باڵی مەکتەبی سیاسی، بەڵام بە فەرمانی مەکتەبی سیاسی من هەر لەلای عەباس ئاغا مامەوەو ئەویش ئاگادار بوو، چونکە ئەو بە دڵ لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسی بوو، ئێمە ئەو (١٠) کەسەمان لە ناو گوندی سەرکەپکان بارەگامان هەبوو، خواردنمان لە ماڵی عەباس ئاغا بۆ دەهات. بەڵام بە داخەوە عەباس ئاغا توشی نەخۆشیەکی کاریگەر بوو حکومەتی عیراق فڕۆکەکی هەلیکۆپتەری بۆ ناردە گوندی دێرێ بۆ گواستنەوەی بۆ نەخۆشخانەی عەسکەری لە بەغدا، من ئەو قسەی عەباس ئاغام لە بیر ناچێ کە لە ناو فڕۆکەکە بوو ئێمەش دەورەمان لێدابوو بە براکانی و کوڕەکانی گۆت زۆر ئاگاتان لەو (١٠) پێشمەرگانەی حزب بێت تا نانەکتان مابێ لەگەڵیان بکەنە

دوو پارچە، کوڕەکانی عەباس ئاغا بە قسەی باوکیان کرد، بایزاغا و سواراغا لە پاش بەیانی ١١ی ئادارماڵیان لە بەغدا بوو، بابێینەوە سەر باسی عەباس ئاغا لە پاش چوونی عەباس ئاغا بۆ بەغدا هەوو عاشیرەتەکە تارماییەکی ڕەش و غەمبار کەوتە سەریان، بە داخەوە لە پاش ١٥ ڕۆژ هەر بە فڕۆکە تەرمەکەیان هێناوە. مردنی عەباس ئاغا کارەساتێکی گەورە بوو بۆ هەموو عاشیرەتەکەش و بۆ ئێمەش جا لەپاش مردنی عەباس ئاغا ئەو لیژنەیە پێکهاتبوون لە: (مەلا ئەسعەد و مەلا عوسمانی گوندی پلێنگان و کاك محمد، بەڵام لە پاش سەرژمێریکردنی سەروەتی عەباس ئاغا دەرچوو عەباس ئاغا خاوەنی (٣٠٠٠) هەزار دینار بوو. لەبەرئەوەی خاوەنی هیچ پارە و پول نەبوو هەموو سەروەت و داهاتەکەی لە ڕێگای پیاوەتی و یارمەتی سەرف کرد. لە پاش مردنی عەباس ئاغا بایزاغا لە جێگای باوکی بووە ئاغا ئێمەش وەکو خۆی هەر لە گوندی سەرکەپکان بووین، هێزەکانی بارزانی هەوڵیان دەدا لێمان بدەن لێشیان داین مەلا موسایان بریندار کرد، لە پاش بریندارکردنی مەلا موسا خۆمان داوامان لە بایزاغا کرد دەچینەوە ناو هێزەکانی خۆمان و سواراغا بە سەیارەی خۆیان ئێمەیان گواستەوە بۆ ڕانیە. خوالێخۆشبوو عەباس ئاغا لە ساڵی (١٩٢٣) لە کوردستانی ڕۆژهەڵات لە ناوچەی سندوس لە گوندی گۆرناوە لە دایك بووە بەداخەوە ئەو پیاوە لە کاتەکی ناسك لە ڕۆژی (٣٠) حوزەیران (١٩٦٦) لە نەخۆشخانەی ڕەشیدی عەسکەری کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی پاش قۆتەڵ بەخاك سپێردرا. مردنی عەباس ئاغا خەسارەتەکی گەورە بوو بە تایبەتی بۆ عاشیرەتەکەی لەهەموو ماڵێك شین و گریان بوو پرسەکەشی لە گوندی سەرکەپکان بوو هەزاران ڕەحمەت لە گۆڕەکەی بێ.

## لەگەڵ پێشمەرگەی دێرین خوالێخۆشبوو حاجی جەلال کاوانی

(جەلال رسول وسو) ناسراوە بە (جەلال کاوانی) لە ساڵی (١٩٢٩) لە گوندی کاوانیان لەدایك بووە، هەر لە سەرەتای لاویەوە لەگەڵ خزمانی (حەمید کاوانی و مام وسو کاوانی و محمود کاوانی) پەیوەندی دەکەن بە حزبی هیوا لە پاشان لە ساڵی (١٩٥٢) دەچنە ناو ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ساڵی (١٩٥٨ - ١٩٥٩) دەستگیر دەکرێت لەلایەن حکومەت لەگەڵ هەڤاڵەکانی. لە سەرەتای هاوینی ساڵی (١٩٦١) پێش ئەوەی شۆڕشی ئەیلول دەست پێ بکات لەگەڵ خزمەکانی (حەمید کاوانی و محمود کاوانی و مام وسو کاوانی حسینی کاوانی و مرشد کاوانی و فتاح کاوانی و حوجرانی و مام تەها کاوانی و قادر حسن و کاك حسن ناسراوە بە مامۆستا اسماعیل حسین و کاك صدیق هیرانی و عزیزی فاتە قەلەوپێ و وەستا شێخ محمدی شەقلاوەیی) مەفرەزەکی چەکداری ڕێك دەخەن بەسەرپەرشتی (مامۆستا مەلا عەولا) کە ناسراوە بە (مەلا ماتوڕ و مامۆستا شەمسەدینی موفتی) هەر ئەو مەفرەزە چەکدارە بوو بناغەی شۆڕشی ئەیلول و لە شاخی سەفینەوە شۆڕش گەشەی کردو پڕوشکی هەموو ناوچەکانی کوردستانی گرتەوە بە ناوچەی بادینانیشەوە، ئەوە مێژووە، هەر ئەو مەفرەزە چەکدارە بوونە هێزەکی (٢٠٠) کەسی و حکومەتیان بێزار کرد بوو، لە مانگی (١١ی ١٩٦١) هێزی سەفین هاتە دۆڵە ڕەقە، لە ڕەمەزانی ساڵی (١٩٦٢) بەشەك لە هێزی

سەفین. لەسەر داوای بەڕێز (مام جەلال) چووینە ناوچەی سلێمانی بەتایبەتی کاوانیەکان ئەو کات من یاریدەدەری شەهید (حەمید کاوانی) بووم.

خوالێخۆش بوو (جەلال کاوانی و شەهید حەمید کاوانی) ڕۆڵی بەرچاویان هەبوو لە ڕزگارکردنی (قەزای چوارتا و ناوچەی شاربازێڕ و قەزای پێنجوێن) کاوانیەکان لەو شەڕانە چەند شەهیدیان هەبوو وەکو (شەهید حەمید کاوانی و شەهید کاکۆڵ سعید) کە لە گوندی (تەگەران) شەهیدبوون، لە ساڵی (١٩٦٢) خوالێخۆش بوو (جەلال کاوانی) جگە لەوەی پێشمەرگەکی قارەمان بوو کەسایەتیەکی ناسراویش بوو لە ناو شۆڕش و وەکو ڕیش سپی دەوری ئاشتەوایی دەگێڕا و لەگەڵ ئەو کردەوە باشانەشی وەستایەکی زۆر باش بوو و هەموو جۆرە چەکەکی چاك دەکردەوە، خوالێخۆشبوو خۆی و براکانی پێشمەرگە بوون (کاك جلال و کاوانیەکان) لەکاتی شۆڕشی ئەیلول بەشی زۆریان بەماڵەوە هەر دەربەردەر بوون، من دەزانم سەردەمەك لە ناوچەی پشدەر لە گوندی گەناو و باوزێ بوون ماوەیەك لە بەکرەجۆ بوون و هەروەها (کاك جلال و بەشەك لە کاوانیەکان) لە (١٩٩٦) ئاوارەبوون لە سلێمانی و لە شۆڕشی نوێش شەهیدیان دا وەکو (شەهید تەحسین کاوانی)، خوالێخۆشبوو جەلال کاوانی لە پاش مردنی مێژووەکی پڕ لە سەروەری لە دوای خۆی بۆ گەلەکەی و منداڵەکانی بەجێ هێشت و منداڵەکانیشی پەروەردەی ئەو باوکەن بۆی کە لە ڕێبازی کوردایەتی بەردەوامن، بە داخەوە ئەو قارەمانە لە (٢٠١١/١٢/١٥) کۆچی دوایی کردو هەر لە گوندی کاوانیان نێژرا، هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی بێت ئەوە بەشەك بوو لە خەباتی ئەو پیاوە سەربەرزە هیوادارم جێگای ڕەزامەندی هەمووان بێت.

# ٧

## سەربردەی ( حەمید حوسێن تەها ) ناسراو بە ( حەمید ڕەشاش )

من ناوم حمید حسێن تەها مەولودە ناسراوم بە حەمید ڕەشاش بە عاشیرەت خۆشناوم خەڵكی گوندی بالیسانم لە بەرەبابی میر وسووم دایكم ناوی سەید (ڕەحمە)یە لەكاتی خۆی لە گوندی بالیسان باپیرم لە ناو بژی شەڕێكی گەورە كوژراوەو چوار كوڕی لە پاش بەجێ مایە بەناوەكانی (حسن و حسێن و فەقێ و احمد) كوڕەكانی بە نیازی تۆڵەسەندنەوە لە گوندی بالیسان باردەكەن و دەچنە وراتی كۆیە لەگەڵ دایكیان جا نازانم لە پاش باركردنیان لە گوندی بالیسان كوڕەكان تۆڵەی باوكیان كردەوە یان نا، كوڕەكان لە وراتی كۆیە بۆ كاسبی بڵاوەی دەكەن و باوكم دەچێتە گوندی قەیباشی خوار شارۆچكەی پردێ و لە وێندەر ژن دەهێنێ و بە قسەی دایكم و باوكم من لە ساڵی (١٩٣١) لە گوندی قەیباشی لە دایك بوومە، لە پاشان باوكم لە گوندی قەیباشی بار دەكاو دەچنە گوندی قەرەبەگ و ئەو گوندە لە سەرەوەی پردێیە، من لە گوندی قەرەبەگ دونیام وەبیر دێت و هەر یەك برا و یەك خوشكم هەبوو هەر لە گوندی قەرەبەگ براكەم بووە سەرباز، بەڵام هەر چوار مانگ سەربازی كرد و فیراری كرد لە سەربازی جا لە بەر فیراركردنی براكەم لە گوندی قەرەبەگ بارمانكرد و چووینە گوندی قوچەبلباس ئەو كاتە تەمەنم شەش ساڵ بوو و دایكم نەخۆش كەوت و كۆچی دوایی كرد، لە پاش مردنی دایكم خوشكەكەشم بۆ براكەم بە ژن بە ژنە دا، من و باوكم بێ كابان ماینەوە براژنەكەم لەگەڵمان ئیدارەی نەدەكرد و من و

باوکم توشی ناخۆشی و دەردەسەری بووین لە بەر بێکابانی، ئەو کاتەش کاتی فەقیری و هەژاری بوو باری ژیانمان زۆر ناخۆش بوو، من لە تەمەنی (٩) ساڵان باوکیشم کۆچی دوایی کرد و ئەو قسانەی باوکم قەد لە بیرناچێ کە بە منی دەگۆت لە پاش من تۆ توشی دەردەسەری و دەربەدەری دەبی و دەکەوینە ژێر چەپەلۆك، ئەو قسەی باوکم ڕێك وابوو، جا ئەوە بوو لە پاش مردنی باوکم بە ناچاری چوومە لای براکەم و بەردەستی براژنە غەدارەکەم. براکەم لەتەمەنی ١٠ ساڵی منی کردە شوان لە گوندی عەلیاوە و لە تەمەنی دە ساڵیم من دەربەدەر بووم و لەو ماوە دوور و درێژەی کە دەربەردەربووم زۆر ناوچەکانی کوردستان گەڕام بۆ شوانی و ڕەنجبەری و کاسبی بۆ بژێوی و ژیان و مانی خۆم، جاری واش هەبووە ساڵەکەی نەهات بووە بە نان و زگ ڕەنجبەر بوومە، هەموو جۆرە کاسبیەکم کردیە لە ژیانی دەربەدەریم، جاروباریش دەهاتمەوە ناو شار بۆ کاسبی لەناو شاریش هەموو جۆرە کاسبیەکم دەکردو سەربەرزانە دەژیام، بەردەوام بووم لەگەڵ دەربەدەری و چەرمەسەری و هەژاری تا ساڵی (١٩٥٣) لە کاتی هەرای فەلاح و ئاغاکانی دەشتی هەولێر لە گوندی (شەعەل) سەپان بووم حکومەت کوڕە فەلاحەکانی گوندی شەعەلیان گرت و منیش لەگەڵ کوڕە فەلاحەکان گیرام و بوومە سەرباز، لە کۆر ڕەنجبەری بوومەوەو زۆرم لا خۆش بوو، لە ساڵی ١٩٥٥ ماوەی سەربازی ئیجباریم تەواو کرد، بە قسەی براکەم لە عەسکەری دەرچووم و هاتمەوە هەولێر و بەڵام لەساڵی ١٩٥٥ ئەوەندە ساڵەکی وشکەساڵی و نەهات بوو کاسبی نەبوو ئیش و کار نەبوو بە ناچاری دووبارە بوومەوە سەربازی (متەوع)، و مووچەکەم (٥) دینار بوو، لە موسڵ لە لیوای (٥)ی موسڵ بووم، لە ساڵی ١٩٥٦ هەستی کوردایەتی سواری سەرم بوو لە

ڕێگای هەڤاڵەکەم ناوی نائب عەریف یاسین جوامێر بوو چوومە ناو ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی و لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٧ ژنم هێنا و بوومە خاوەن ژن و ماڵ، پلەکەشم نائب عەریف بوو، لە ساڵی ١٩٥٩ کەمەك پێش جوڵانەوەی شەواف لەسەر داوای خۆم گوازرامەوە بۆ هەولێر بۆ فەوجی (٣)ی لیوای سێ، لە ساڵی ١٩٦٠ بوومە لێپرسراوی حزب لە فەوجەکەی خۆمان لە ڕۆژی ١١ی ٩ی ١٩٦١ فەوجەکەی ئێمە چووینە شاری کۆیە بۆ سەرکوتکردنی جووڵانەوەی عەشائیری، لە ڕۆژی ١٤ی ٩ی ١٩٦١ دوو سریە عەسکەر چووینە شاری ڕانیە لە بناری کێوەڕەش توشی شەڕ بووین لەگەڵ لەشکری شێخ حسێنی بۆسکێنی لە ڕۆژی ١٦ی ٩ی ١٩٦١ خۆم و ڕەشاشەکە چوومە ڕیزی پێشمەرگەی کوردستان و لە ماوەی دەربەدەری و لەماوەی عەسکەری و لە ماوەی پێشمەرگایەتی سەرانسەری کوردستان گەڕام جا لەبەر ئەوەی ئەو هەموو گەڕان و سوڕان و دەربەدەری و هەژاری و بێکەسییەی نەمتوانی نە لە مەکتەب نە لە حوجرەی فەقێیان بخوێنم هەر خۆم بە هەوڵ و کۆششی خۆم، خۆم فێری ئەم خوێندەوارییە خۆرسکە کردییە، من ڕۆژانی خۆشیشم هەر ناخۆشی بووە، بەڵام هەندەك جار لە ناو خۆشیش ناخۆشی هەیە و لە ناخۆشی خۆشی هەیە جا من لەناو ئەو هەموو خۆشی و ناخۆشیانە دەربەدەرییە سودەکی زۆرم وەرگرتیە، هەندەك کەس بە دەربەدەری کز وکۆر و زەینکۆر دەبن، بەڵام من خواو ڕاستان ئەوەندە زەینم ڕۆنە هەر لەو ڕۆژەی دنیام وەبیردێ و تا ئێستا هەموو قسە و باس و خواس و کەلەپوری کوردەواری و داب و نەریتی کوردەواریم لەبیر ماوە، لەبەر ئەوەی هەموو کردەوەکانی خۆمن، بۆیە ئێستا زۆر بەسەربەستی و بێباکانە باسی کەلتور و کەلەپوری کوردەواری دەکەم و دەیاننووسم و بڵاویان

دەکەمەوە، هیوادارام ئەو هەوڵدانەم بۆ خزمەتی گەلەکەم هەژمار بکرێ، با بگەڕێمەوە سەر باسی سەروسەربردەکەم، من پێشتر باسی ئەوەم کرد گۆتم ١٩٦١/٩/١٦ یەکەم سەرباز بووم لە لیوای هەولێر خۆم و ڕەشاشەکەم چوومە ناو ڕیزی پێشمەرگەی کوردستان و ئەم نازناوەی حەمید ڕەشاش لە مانگی ١١ی ١٩٦١ لە گوندی شیوەشان بەڕێز مام جەلال بۆ منی دانا، لەبەر ئەوەی لە ناو هێزی پێشمەرگە هەر ئەو ڕەشاشەمان هەبوو، لێرەدا پێویستە هەندەك باسی قۆناغەکانی پێشمەرگایەتیش بکەین من لەماوەی پێشمەرگایەتی لە سەرەتای ١٩٦٢ بوومە یاریدەدەری سەرپەل سەرپەلەکەم خوالێخۆشبوو حەمید کاوانی بوو لە مانگی ٣ی ١٩٦٢ لە سەر داوای بەڕێز مام جەلال گوازرامەوە بۆ چەمی ڕێزان لەگەڵ مام جەلال بەشداری هەموو شەڕەکان و ڕزگارکردنی ناوچەکانی شاربازێڕ و شلێر و ناوچەی ماوەت و سورداش و قەشقۆڵی و زۆر جێگای تر، لە مانگی ٦ی ١٩٦٢ بە فەرمانی مەکتەبی سیاسی بوومە لێپرسراوی بارەگای مەکتەبی سیاسی لە ئەشکەوتەکەی گوندی مالومە لە دۆڵی جافایەتی، لە ساڵی ١٩٦٣ لەسەر داوای خۆم گوازرامەوە بۆ حاجی قەڵاو بوومە سەرپەل، لە زستانی ١٩٦٣ دووبارە لەسەر فەرمانی مەکتەبی سیاسی گوازرامەوە بۆ بارەگای مەکتەبی سیاسی و بوومە لێپرسراوی ئیدارەی ئەکادیمی شۆڕش و لە هەمان کاتیش مامۆسیتای مەشق بووم.

لە ساڵی ١٩٦٤ لە بەر شەڕی براکوژی لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسی چووینە ئێران و هەمەدان، لە مانگی ٧ی ١٩٦٤ ماوەی ساڵەك لە هەمەدان بووین و لە ساڵی ١٩٦٦ لە هەمەدان گەڕاینەوە بەپێی ڕێککەوتن لەگەڵ بارزانی، بەڵام ئەو ڕێکەوتنە سەری نەگرت و لە ساڵی ١٩٦٧ بووە شەڕی

براکوژی لە نێوان هێزەکانی بارزانی و باڵی مەکتەبی سیاسی، من بە فەرمانی مەکتەبی سیاسی لەگەڵ ٨ پێشمەرگە لەلای عەباس مامەند ئاغاماینەوە لە دۆڵە ڕەقە بۆ کاری حزب، لە ساڵی ١٩٦٨ بە فەرمانی بەڕێز مام جەلال چووینە بەکرەجۆ بوومە لێپرسراوی ئیدارەی بەشی تەقەمەنی لە هێزی ڕزگاری و لە ساڵی ١٩٦٩ بە فەرمانی مەکتەبی سیاسی بوومە فەرماندەی هێزی هەولێرو لە پاش بەیانی ١١ی ئادار هێزەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی بڵاوەی پێکراو بەپێی ڕێککەوتن باڵی مەکتەبی سیاسی و پارتی تێکەڵ بوونەوەو لە ساڵی ١٩٩١ بەشدار بووم، من چوومەوە ناو ڕیزەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و لە ئازادکردنی شاری هەولێر بەشدار بووم و لە پاش ئازادکردنی هەولێر کرامە فەرماندەی کەرتی ٣ لە هێزەکانی بروسك لە هەولێر، لە ٢٠٠٤ بوومە کارگێڕ لە ناوەندی کۆمەڵایەتی هەولێر وەك لێپرسراوی بەشی ئیدارە تا ئێستاش بەردەوامم و تەمەنم گەیشتە ٨٧ ساڵە لە کارەکەم، لە پاش کاری پێشمەرگایەتی دەستم کرد بە نووسین بە هاندانی برای زۆر بەڕێزم مامۆستای مێژوونووس عبدالرقیب یوسف دیارە زۆر سوپاسی دەکەم، ئەوەی ڕاستی بێ من خۆشم شتێکم لە باراندا هەبوو لە بارەی کەلتور و کەلەپوی داب و نەریتی کوردەواری هەر چەندە خوێندەوارییەکەم خۆرسکە، بەڵام ئەم بەرهەمانەشم چاپ کردییە و بەردەوامیشم لە نووسین.

١. لە ساڵی ٢٠١٠ کتێبی پەندی کوردەواری ئەکادیمیای کوردی چاپی کرد.

٢. لە ساڵی ٢٠١١ کتێبی ژیانی کوردەواری ئەکادیمیای کوردی چاپی کرد.

٣. لە ساڵی ٢٠١٢ کتێبی هەوارگەی شەو و کەلەپوری کوردی لەسەر ئەرکی بەڕێز کاک ئەرسەلان بایز چاپکرا.

٤. ساڵی ٢٠١٧ بەشی دووەمی ژیانی کوردەواریم لە ئەکادیمیای کوردی چاپکرا.

٥. ئێستا فەرهەنگی کەلەپور تەواو بووە لە ژێر تایپ و بژارکردن دایە.

٦. بیرەوەری ژیانی خۆم نووسیەوە، بەڵام تا ئێستا چاپ نەکراوە.

٧. چەندین ووتارم نووسیوە لەم گۆڤار و ڕۆژنامانە:

١) ڕۆژنامەی بەدرخان ٢) ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ٣) ڕۆژنامەی هەولێر ٤) گۆڤاری سلێمانی ٥) گۆڤاری کەکۆن ٦) گۆڤاری پێشمەرگە ٧) گۆڤاری کەلتوری کوردی سلێمانی و چەندین گۆڤاری تر، هەروەها چەندین چاوپێکەوتنم لەگەڵدا کراوە لە بەشی هەرە زۆری کەناڵەکانی تەلەفزیۆنی هەرێم، هیوادارم ئەمانەی سەرەوەم بۆ خزمەت بنووسرێ لەبەرئەوەی هەمووی خۆبەخشانەیە.

# خەبات و تێکۆشانی پێشمەرگەی دێرین شەهید
# ( عبدالخالق مەعروف )

شەهید (عبدالخالق) نەك هەر پێشمەرگەکی دڵسۆز و بەجەرگ بوو ئەندازیارەکی زۆر بە توانا بوو لە بواری کارەبایات، شەهید (عبدالخالق) پیاوەکی نەترس و نەگۆڕ و خاوەن بیروباوەڕەکی کوردپەروەرانە بوو، کاك عبدالخالق بە درێژایی تەمەنی و قەت و قەت لە خەبات و کوردایەتی دانەبڕا، شەهید (عبدالخالق) تێکۆشەرێکی ڕێکخەر و مشور خۆر بوو بۆ ڕێبازەکەی خۆی، شەهید (عبدالخالق) بۆ کوردستان وەکو ئاردی گەنمی قەندەهاری بوو، گەنمی قەندەهاری هەموو جۆرە نانەکی لێ دەهات، کاك (عبدالخالق) لەناو شۆڕش هەم پێشمەرگەکی ئازا و بەجەرگ بوو هەم لە بواری حزبایەتی مامۆستا بوو و هەم ئەندازیارەکی زۆر شارەزا بوو لە بواری کارەبایات. شەهیدی نەمر خاوەن بەهرەکی دەگمەن بوو، ئەو شۆڕە سوارە نووسەرەکی بەتواناش بوو، هەر بۆیە کتێبەکانی کاك (عبدالخالق) بوونەتە سەرچاوەی خوێندنی زانست و بنەما لە زانکۆکان لە بواری فێربوونی کارەبایات، ئەوە جێگای شانازییە مامۆستا (عبدالخالق مەعروف) ئەگەر بەعس شەهیدی نەکردبا ئێستا دەبووە گەورەترین شارەزا. کاك (عبدالخالق) لە کاتی پێشمەرگایەتی لە نەبوونەوە شتی وای دەکرد سەرنج ڕاکێش بوو.

بە داخەوە دەڵێم کورد بە سەدان شۆڕە سواری وەکو کاك (عبدالخالق)ی لە دەستدا لە پێناو ڕزگاری، مامۆستا (عبدالخالق) بەر لەوەی بێتە ناو

ڕیزەکانی پێشمەرگە ئیمام تابوور بوو لە ناو سوپای عیراقی، ئەو پیاوە هەستی کوردایەتی لەهەموو شتێ بەلاوە گرنگتربوو، هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلول ڕیزی دوژمنی بەجێهێشت و هاتە ناو ڕیزەکانی پێشمەرگەو ئەو کاتە شۆڕش زۆر بە درەنگی دەنگوباسی دەگەیشتە دەرەوە، بەڵام کاک (عبدالخالق) ئەوەندە عەبقەری و زانا بوو توانی بۆ یەکەم جار ئێزگەیەکی ڕادیۆ بە ناوی شۆڕش لە ئەشکەوتە ڕەش لەساڵی (١٩٦٣) دابنێ، ئەشکەوتەڕەش لە ناوچەی ماوەتە لە نزیك سنوری ئێرانە. ئەوانەی کاریان لەو ئێزگەیە دەکرد مامۆستای هونەرمەند (هۆمەری دزەیی) بوو لەگەڵ مامۆستا (حسێن قەرەداخی) ئەندازیارەکەشیان کاك (عبدالخالق مەعروف) بوو، لەبەرئەوەی بەشی زۆری بە کەرەستەی خۆی کرابوو زۆر دەنگی نەدەڕۆی ئەو کاتە بە هەزار حاڵ تا مۆلیدەکمان پەیدا کرد بۆ ئێزگەکە، ئەو کاتەی من باسی دەکەم بارەگای مەکتەبی سیاسی لە نزیك گوندی عیساوێ بوو، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٦٤ مەکتەبی سیاسی هەوڵی دا لە ڕێگای (شێخ عزیز شەمزینی) و ئێزگەیەکی زۆر باشترمان بۆ هات، ئەو ئێزگەیە زۆر بچووك بوو لەگەڵ مۆلیدەکەی باری ئێسترەك بوو. ئەو ئێزگەیە سەفەری بوو لە ژێر دەسەڵاتی مامۆستا (عبدالخالق) دابوو. ئەو کاتە شۆڕش لەو پەڕی بەهێزی دا بوو. بەڵام ناحەزانی ناوخۆ چاویان بەو شۆڕشە بەهێزە هەڵنەهات و تووشی شەڕی خۆکوژی هاتین و زۆر کەم کارمان بە ئێزگە تازەکە دەکرد.

شۆڕش بووە دوو بەش بەشی جەلالی و بەشی مەلایی و ئێمە لەبەر براکوژی چووینە ئێران هەمەدان و ئێزگەکەشمان لەگەڵ خۆمان بردە هەمەدان. ئێمە ژمارەمان (٤٦٠) پێشمەرگە بووین ئەو ماوەی لە هەمەدان

بووین ماوەکەی ساڵەك بوو، لەو ماوەیەدا هەر جلوبەرگی پێشمەرگەمان لەبەردا بوو. ئەو ماوەیەش کە لە هەمەدان بووین دەستەوەستان نەوەستاین و هەر خەریکی خوێندن و خۆ ئامادەکردن بووین. لەوێش مامۆستا (عبدالخالق) لەکۆنە ڕادیۆیەکان ئێزگەکی ڕادیۆی بۆمان دروست کرد. دەنگەکەی هەموو شاری هەمەدانی دەگرتەوە. لە پاشان حکومەتی ئێرانی پێیزانی و ئێزگەکەی برد و سەریان لە دروستکردنەکەی سوڕما بوو. لە پاش گەڕانەوەی هێزەکەمان لە ساڵی (١٩٦٦) کە گەڕاینەوە ناو شۆڕش بارزانی داوای ئێزگەکە و کاك (عبدالخالق)ی کرد. ئەو کاتە من لە دۆڵەڕەقە بووم بە ماڵەوە کاك (عبدالخالق) ژن و منداڵەکانی لە هەولێر هێنا. خۆی و منداڵەکانی بۆ ماوەی (٣) شەو لای من مانەوە، کاك (عبدالخالق) زۆر هەوڵی دا منیش لەگەڵی بچمە ناو پردان بە ماڵەوە، بەڵام من ڕازی نەبووم، کاك (عبدالخالق) دوو جار بە نامە داوای لە من کرد بچم لەگەڵی بم من هەر قبوڵم نەکرد ئەوە بوو من و کاك (عبدالخالق) لە یەکتر دابڕاین.

کاتێك من کاك (عبدالخالق)م دیتەوە دوکاندار بوو لە بن قەڵاتی هەولێرێ. ئەو پیاوە دڵسۆزە هەر خۆی ڕاگرت تا شۆڕشی نوێ سەری هەڵدا بە سەرکردایەتی تاکە سەرکردەی کورد بەڕێز (مام جەلال). دیسان کاك (عبدالخالق) خۆی پێڕانەگیرا و هاتەوە ناو ڕیزەکانی یەکێتی. ئەو پیاوە چاونەترسە لە کاتە هەرە ناخۆشەکان هەر لە شاری هەولێر بوو. هەمیشە خەریکی کوردایەتی بوو، ئەو پیاوە کوردپەروەرە وەکو خەنجەری دەبان بوو لە هەر جێگایەك کوردایەتی لێبایە ئەو لەوێ بوو تا ئەو ڕۆژەی بە داخەوە بە دەستی حکومەتی بەعس لە (١٩٨٥/٤/١٠) شەهید کرا، هەزاران ڕەحمەت لە گۆڕەکەی بێ لەگەڵ هەموو شەهیدانی کوردستان.

تێبینی: ئەم وێنانە لەلایەن مامۆستا (عبدالرقیب یوسف) گیراوە.

## خەبات و ڕۆڵی سەرکردایەتی
## مامۆستا شەمسەدین موفتی لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلول

لە ساڵی (١٩٦١) لە پاش کوشتنی میرانی (صدیق بەگ) مەفرەزەکی چەکدار لە دانیشتوانی گوندی کاوانیان و گوندی حوجران و بەشەك لە ئەندامانی حزب بەچەکەوە چوونە شاخی سەفین لە سەرەتای مانگی (٨ی ١٩٦١) مامۆستا شەمسەدین کە ئەو کاتە ئەندامی سەرکردایەتی حزب بوو بە فەرمانی حزب دەچێتە شاخی سەفین و دەبێتە سەرکردەی ئەو چەکدارانەی شاخی سەفین، لە پاشان حزب چوار پۆلیسی تر دەنێرێتە ناو لەشکرەکەی سەفین بەم ناوانە:

١) عەریف سلێمان ٢) ئەنوەر جۆخین ٣) ڕەشید شێرە ٤) عبدالرحمن مەلا قادر

لە پاشان (٨٠) پۆلیس بە جارێك دەچنە ناو ڕیزەکانی چەکدارانی سەفین دوا بە دوای ئەو پۆلیسانە پێنج پۆلیسی تر چەك و جبەخانەی سەرای هەولێریان لە سەیارەیەك بار کرد و چوونە ناو هێزەکەی سەفین، ئەمەش ناوی ئەو پۆلیسانەیە کە چەك و جبەخانەی سەرای هەولێریان گواستەوە:

١) عەریف عوسمان یوسف ٢) حەمە صالح عبدالله ٣) هەمزە جبرائیل ٤) قادر حەمەد ٥) کریم حەسەن بەگ

ئەو شۆڕشەی سەفین پەرەی سەند و گەورە بوو ژمارەیان گەیشتە (٢٠٠) چەکدار بە سەرکردایەتی بەڕێزان (مامۆستا شەمسەدین و مامۆستا مەلا عەولا

ئیسماعیل)، ئەو لەشکرە هەردەم لە شەڕدا بوو لەگەڵ جاشەکانی ناوچەکەو لەگەڵ هێزی پۆلیسی گەڕۆك، ئەو هێزەی سەفین حکومەتی هەراسان کردبوو لە ناوچەی شەقڵاوە، چەند جار تووشی شەڕی گەورە گەورە دەبوون بە تایبەت لەگەڵ جاشەکانی گوندی ئەسپیندارە و گوندی بالیسان و دەوروبەری شەقڵاوە، ئەو کاتە حزب بڕیاری شۆڕشی نەدابوو پارەو پولیشی نەبوو ئەرکی ئەو هێزە لەسەر گوندەکان بوو، ئەو هێزە بەردەوام بوو لە کارو چالاکی لە پاشان لە ڕۆژی (١٩٦١/٩/١١) حکومەت بۆ بڵاوەپێکردن و سەرکوتکردنی جوڵانەوەی عەشائیری لە ناوچەکانی دۆڵی خەلەکان و چنارۆك و دێگەڵە و دەربەندی خان و دەربەندی بازیان هێزی سەربازی ناردە سەریان بە پاڵپشتی تۆپخانەی گەورە و فڕۆکەی جەنگی، هەر لە هەمان ڕۆژ واتە ڕۆژی (١٩٦١/٩/١١) هێزەکانی عەشائیری بڵاوەیان کرد و چوونەوە ماڵەکانیان ئەوەی لە مەیدانی شەڕ مابوو ئەو هێزەی سەفین بوو، ئەو هێزەش لە شەڕ و بەرگری دابوو بارەگاکانیان لە کانی شیلانە و لە کانی گوێز بوو لە هەموو شەڕەکان سەرکردەکان لە ڕیزی پێشەوەی لەشکرەکە بوون، بەڵام ئەوەی لەشکرەکەی کوردستانی بێزار کردبوو کەم فیشەکی و کەمی پارە و پول بوو ناچار بوون لە کاتی شەڕ هەموو پێشمەرگەکان دەبایە قەوانەکانی خۆیان ببەنە لای ئەو وەستایە دایبگرنەوە بۆ شەڕەکی تر، جا ئەو هێزە و هەردوو سەرکردەکە بە برسیەتی و ڕووتی بە بێ فیشەك خۆیان ڕاگرت تا مانگی (١١)ی (١٩٦١) بەڵام لە بەرئەوەی تەقە لە کوردستان نەما بوو حکومەتیش هەموو گرانایی خستبووە سەر ئەو هێزەی سەفین بۆ لەناوبردنیان، زستانیش بەسەر داهات هێزەکە لە سەرمان و لە برسان و لەبەر کەم فیشەکی ناچار بوون سەفین چۆڵ بکەن و پاشەکشەیان کرد بۆ

٢٠٢٢/٨/٢١

دەشتی بالیسان شەڕیشیان هەر لە سەر بوو، لە پاشان ئاوا بوون چوونە دۆڵی مەلەکان لەوێشەوە چوونە ساوسێوکان لەوێندەر هێزەکە پەکی کەوت لە سەرمان و لە برسان، ئەو کاتە من و کاك عومەر دەبابە لە دۆڵەڕەقە بووین شەو بوو نامەیەکی بەپەلە لە مامۆستا شمس الدین و مامۆستا مەلا عەولا بۆ کاك عومەری هات لە نامەکە نوسرابوو: ئەگەر فریامان نەکەون نان و پێڵاومان بۆ نەنێرن هێزەکەمان حاڵیان زۆر شڕە، هەر بەو شەوە من نامەکەم بۆ عەباس ئاغا بردو عەباس ئاغا لە گوندی سەرکەپکان بوو نامەکەم دا دەستی کە خوێندیەوە هەر بەو شەوە چەکدارەکانی خۆی نارده ناو گوندی دوو بار نانیان کۆکردەوە لەگەڵ بارەك پێڵاو یەکسەر ڕەوانەی کرد بۆ هێزەکەی ساوسێوەکان ئەو نان و پێڵاوە هێزەکەی بوژاندەوە.

ئەو کاتە لە هەموو کوردستان تەقە نەما و حکومەت وای زانی جارەکی دیکە شۆڕش سەرهەڵناداتەوە، لە پاشان عەباس ئاغا جێگای ئەو هێزەی کردەوە لە ناوچەی دۆڵەڕەقە هەمووی دابەش کرد لە سەر گوندەکان، مامۆستا شمس الدین و مامۆستا مەلا عەولا لە گوندی قەڵا سەیدە بوون، بەڵام ئەوان لە ماڵان نەبوون ڕۆژەك من هەندەك ئازوقەم بۆیان برد چووم مامۆستا شمس الدین برینەکەی حەمەدئەمین گورگۆی دەرمان دەکرد، حەمەدئەمین گورگۆ لە شەڕێ گوللەکی بە ملی کەوتبوو، جا ئەو هێزە کە ژمارەیان (٢٠٠) پێشمەرگە دەبوو زستانەکەی عەباس ئاغا و عەشیرەتەکەی بەخێوی کردن، بۆ مێژوو دەڵێم مامۆستا شمس الدین یەکەم سەرکردە بوو چووە ناو شۆڕش و شۆڕشی بەرپا کرد لە سەرەتای مانگی ئاب نەك لە ئەیلول ئەو سەرکردە خۆبەخشە کە هاتە ناو شۆڕش بە پارەی خۆی

تفەنگەکی برنۆی بۆ خۆی کڕی، جا ئەگەر باسی سەرکردەکان بکەین کە هەمیشە ژیانیان لەگەڵ ژیانی پێشمەرگە بوو هەردەم گیرفانیان بەتاڵ بوو دەبێ باسی مامۆستا شمس الدین و مام جەلالی ئەو کاتە و مامۆستا مەلا عەولا و کاک عەلی عەسکەری و کاک عومەر دەبابە و مامۆستا عەلی عبداللە بکەین ئەگەر مێژوو لە بیر نەکات شۆڕش لە سەفین سەری هەڵدا و پۆلیسی هەولێر و دانیشتوانی گوندی کاوانیان بوونە بناغەی دانەری شۆڕشی ئەیلول، لە هەندەك ناوچان شۆڕش زۆر درەنگ دەستی پێ کرد، مامۆستا شمس الدین لە بنەماڵەکی ئاین پەروەری هەرە ناودارەکانی شاری هەولێر بوو لە ساڵی ١٩٣٣ لە شاری هەولێر لە قەڵاتێ لە دایك بووە، بە داخەوە لە ڕۆژی (٢٠١٢/٩/٥) لە هەندەران بە نەخۆشی کۆچی دوایی کرد، هەزاران ڕەحمەت لە گۆڕی مامۆستا شمس الدین و هەموو شەهیدانی کوردستان بێت.

٩

## هەزاران ڕەحمەت لە گۆڕی هەڤاڵی دێرینی پێشمەرگەی سەرەتای شۆڕشی ئەیلول مامۆستای کوردایەتی هەڤاڵ ( مەلا موسا ) بێت

کورتەباسێك دەربارەی ڕابردووی پێشمەرگەی ڕاستەقینەی شۆڕشی کوردستان هەڤاڵی نەمر خەڵکی کوردستانی تورکیا بوو بۆ خوێندنی ئاینی هاتبووە کوردستانی عیراق و دێتە شاری هەولێر لە مزگەوتێك لە مزگەوتەکانی هەولێر دەخوێنێت، لە ساڵی ١٩٥٧ لە هەمان مزگەوت ناوی خۆی تۆمار دەکات لەسەر ژمێری ساڵی ١٩٥٧، بەردەوام دەبێت لەسەر خوێندن، هەر بۆ خوێندن دەچێتە چەمچەماڵ لە مزگەوتێك لە مزگەوتەکانی چەمچەماڵ دەبێتە مەلا لە هەمان کاتیش ئەندامی پارتی دەبێت، لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلول مزگەوت بەجێدەهێڵێ و دەچێتە ناو ڕیزەکانی پێشمەرگە لە بنکەی خاڵ خالان دەبێتە لێپرسراوی ئازوقە لەگەڵ هەڤاڵ عادل عیزەت لەبەرئەوەی ئەوەندە دەست پاك و دڵسۆز دەبێت و زۆر دەست کراوە نابێت و ماڵی حزب دەپارێزێ و نازناوی دەبێتە مەلا نینە، مەلا نینە لەلای هەموو پێشمەرگە دێرینەکان ناوبانگی هەیەو لەلای سەرکردەکانیش ناسراوە، لە ساڵی ١٩٦٤ لەگەڵ باڵی (م.س) هاتە هەمەدان لە پاش گەڕانەوەمان لە ئێران لە دۆڵە ڕەقە لێپرسراوی ئازوقە بوو لە هێزەکەی خۆمان لە گوندی قەڵا سەیدە بوو، لە ساڵی ١٩٦٧ من و مەلا موسا و چەند پێشمەرگەیەك بە فەرمانی حزب لە گوندی سەرکەپکان بووین لەلای عەباسی مامەند ئاغا هەر لە هەمان ساڵ مەلا موسا بریندار کرا بە دەستی

پێشمەرگەیەکی پارتی سەر بەهێزەکانی بارزانی ناوی ئەحمەد سەمی نۆڤبوو لەبەر برینەکەی مەلا موسا بردمە نەخۆشخانەی کەرکوك، مەلا موسا چاك بۆوە لە پاشان چووینەوە ناو هێزەکەی خۆمان لە قەلادزێ، لە ساڵی ١٩٦٨ چووینە بەکرەجۆ و مەلا موسا بووە ئەندامی ناوچەی پێشمەرگە، هەر لە بەکرەجۆ ژنمان بۆ هێنا ئەو کاتە هەر پێشمەرگەیەك ژنی هێنابا مام جەلال تەنەکەك ڕوون و فەردەیەك برنجی دەدایە لە ساڵی ١٩٧٠ لە پاش بەیانی ١١ی ئادار هێزەکانی (م.س) بڵاوی کردەوە ئێمەش گەڕاینەوە سەر کاری پێشوومان و هەموومان لە بەغدا بووین مەلا موسا ناسنامە و ڕەگەزنامەی عێراقی نەبوو، من لەگەڵی چوومە هەولێر و ناوەکەمان دیتەوە لەسەرژمێری ١٩٥٧ هەر لە هەولێر ناسنامەم بۆ دەرهێنا واتە دەفتەر نفوس لە بەغداش بەهۆی کاك حەمەدەمین فەرەج ڕەگەزنامەی عێراقیمان بۆ دەرهێنا و لە شەریکەی نەوت بە کرێکار دامەزرا و لە پاشان گوازراوە بۆ سلێمانی، ئەم پیاوە هەر چەندە خۆی کوردی کوردستانی تورکیا بوو، بەڵام زۆر لە کوردی عێراقی دڵسۆزتر بوو بۆ کورد و کوردستان، لەو کاتەوەی من مەلا موسا دەناسم تا مردیش لە ڕێبازی کوردایەتی لای نەداوە وەکو پێشمەرگەی دێرینیش حسابی بۆ نەکراوە داواشی نەکردووە و ساردیش نەبۆتەوە لەسەر بیروباوەڕەکەی خۆی. ئەوانەی زۆر دۆست و برادەری مەلا موسا بوون من و مامۆستا عبدالرقیب یوسف بوون، ئێمە قەت قەت مەلا موسا لەبیر ناکەین، بەڵام لەگەڵ مردن دەسەڵات نیە، ئەوە زۆر بە کورتی ئەم کورتەباسەمان نووسی بۆ منداڵەکانی.

## گرتنی مەرکەزی قەزای پێنجوێن و هەموو مەخفەرەکانی

ئێمە پێشتر باسی ئەوەمان کرد لە پاش ڕزگارکردنی ناوچەی شارباژێر هێزەکەمان گەڕاینەوە گوندی دڕی بۆ حەسانەوە و خۆئامادەکردن بۆ شەڕەکی تر، ئەوەبوو لەپاش پشودان ڕۆژەك پێشی ڕۆژهەلات هێزەکەمان لە گوندی دڕێ بەڕێکەوتین بەرەو قەزای پێنجوین، هەر لەگوندی دڕی دەرچوین دوو فڕۆکەی مێك گەیشتە سەرمان و یەکسەر ئێمەیان بۆردوومان کرد، ئێمەش بلاوەمان کرد فڕۆکەکان ماوەی سەعاتێك بەردەوامبوون، دوو دەڕۆیشتن و دوویتر دەهات، هاتنی ئەو فڕۆکانە لەو کات و ساتەیدا پێدەچوو ئێمە دەست نیشان کرابین، مام جلال گومانی لە معاون جەلالی حاجی علی کرد لە ماوەت بەبێتەلێ شوێنەکەی ئێمەی بۆ حکومەت دەستنیشان کردبی، هەرواش بوو، لە پاش تەواو بوونی بۆردومانەکە، ڕۆیشتین، خۆشبەختانە کەسمان بریندار نەبوین، مام جلال بڕیاریدا لەمەودوا هەر بەشەو بڕۆین، لەدواییدا بۆمان دەرکەوت هاتنی فڕۆکەکان بۆ سەر هێزەکەی ئێمە لە گوندی (دڕی)یەوەدێو هەمووشی لە سەر داوای معاون جلال بوو، لەسەرەوە دەیگوت من ئەندامی حزبم، بەلاّم لە ژێرەوە لەگەلێ حکومەت بوو و بەبێتەلێ جێگایەکانی ئێمەی بۆ حکومەت دیاری دەکرد، معاون جلال لەپاش گرتنی دانی بەتاوانەکەی خۆی ناو هەر لەبەر ئەو کردەوانە بوو مام جلال فەرمانی دا مەرکەزی ناحیەی ماوەت بگیرێت ئەوەبوو هەر لیژنەی ناوچەی ماوەت بەبێ شەڕ ماوەتیان گرت و معاون (جەلال)یش گیرا، ئێمەو هێزەکەمان بەردەوام

بوین لەگەشتەکەمان بۆ ناوچەی پێنجوێن، لەم سەفەرەماندا چەند ئاغا و کوێخایەکمان لەگەڵ بوو لەمانە: شێخ تەیفوری باوکی عارف تەیفورو حاجی حەمەدەمین رەشکەیی گوندی سابور ئاواو شێخ محمودی گوندی کارێزەو شێخ رەوفی گوندی هەنجیرەو کەریم ئاغای موغاغ، ئەو ئاغانە هەموویان بە سواری وراغ بوون هەریەکەو چەند چەکداری لەگەڵدا بوو، گەشتەکەی ئەم جارەشمان هەروەکو گەشتەکای ناوچەی شاربازێر بوو، بەڵام ڕێگەمان گۆڕیبوو لەم گەشتەش مام جەلال دەوری خۆی دەدیت و ئێواران لەمزگەوتەکان خەڵکەکەی جۆش دەداو هانی دەدان بەشداری شۆڕش بکەن، لەسەفەری ئەم جارەمان مام منی لەخۆی دانەبڕی هەر لەگەڵ ئەو بووم، ئەو کاتیش سەرکردەکان پاسەوانی تایبەتیان نەبوو. چوینە شیوەکەڵ ئەو گوندە مەخفەرەکی لێبوو، بەڵام لەترسان مەخفەرەکەیان چۆڵ کردبوو، لەپاش گرتنی ناحیەی باسنێ چوینە گوندکانی بارێ و باری و چوینە گوندی نۆرک، میوانی ئاورەحمان ئاغای نۆرک بووین نامەیەکی شێخ لەتیف شێخ محمودی نەمر بۆ مام جلال هات، هەر وەکو مام جەلال خۆی قسەی بۆ ئێمە کرد کە گوایە شێخ لەتیف زۆری پێناخۆش بوە هێزی پێشمەرگە هاتیتە ناوچەکە وەکو لە نامەکە نوسرابوو شێخ گۆتبوی چۆن ڕێگا بە خۆتان دەدەن بە چەکەوە لە ناوچەی شێخ مەحمود بسوڕێنەوە...!!! مام جلال وەڵامی دایەوەو گۆتی: ئێمە چاوەڕوانی ئەوەبوین جەنابت سەرکردەمان بی لەجێگای شێخی گەورە، ئێمە هاتووین سەنگەرەکانی باوکت ئاوەدان بکەینەوەو درێژە بە شۆڕشەکەی شێخی گەورە بدەی، دە فەرموو سەرکردەمان بەو سەرکردایەتی شۆڕش بکە، بەهەر حاڵ ئێمە بەردەوام بوین لەگەشتەکەمان، چوینە ناڵپارێزو گوندەکانی دەوروبەری پێنجوێن، ڕۆیشتین

بەرەو سنوری ئێران و چوینە گوندی میشیاو سەردانی شێخەکانی نەزارەو شێخ عەبدولقادری کوێسە و سەردانی ئەحەی مینەرەندان و سەردانی حەمەرەشید خانی بانەمان کرد، لە گوندی دارۆغان بووین لەلای حەمەرەشید خان خەبەرمان بۆ هات کاك مەحمود کاوانی هاتییەو چەند پێشمەرگەکی لەگەڵە، کەیف خۆش بووین بە هاتنی مەحمود کاوانی نەمان دەزانی مەحمود کاوانی هاتیە کاوانیەکان بگێروێنەوە بۆ ناوچەی خۆشناوەتی، مەحمود پەیوەندی بەکاوانیەکان کرد و داوای لێیان کرد وەرنەوە ناوچەی خۆتان لێرە بۆ کێ خۆتان بەکوشت دەدەن، ئەوەبوو لەسەر داوای مەحمود کاوانی بەشەك لە کاوانیەکان لە ئێمە جیابونەوەو لەگەڵ مەحمود کاوانی گەڕانەوە، مام جەلال ئەو کارەی زۆر پێناخۆش بوو، بەڵام ئێمە لێنەگەڕاین لەم کاتە ناسکە ناخۆشی ڕوویدا، مەحمود کاوانی هەر لەسەرەتایی شۆڕش دژی ئەندامانی سەرکردایەتی حزب بوو، ئاگری دووبەرەکی خۆش دەکردوو هەوڵی دەدا ئاژاوە بنێتەوە، ئەم ڕاستیە عبدالله ئاغاش لە بیرەوەریەکەی لە لاپەڕە (٧٥) و کاك خورشید شێرەش لەیاداشتەکەی ئاماژەی پێداوەو دەڵێت مەحمود کاوانی پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەبوو لەگەڵ سەرۆك بارزانی، کە کاك خورشید شێرە هاتە ناو شۆڕش و هاتە سەفین لەگەڵ مامۆستا مەلا عەولا نەدەگونجا، کاك خورشیدو مەلا عەولا قسەیان لەسەر یەکتر دەکرد بەتایبەتی دوای ئەوەی کە کاك خورشید بریندار بوو و بەتەواوی چووە پاڵ مەحموود کاوانی، چونکە مەحمود کاوانیش زۆر دژی مەلا عەولا بوو، هەر لەو کاتەوە ئاگری دووبەرەکی دوکەڵی پەیدا بوو، بەهەر حاڵ مەحمود کاوانی توانی بەشەك لەکاوانیەکان بگێڕێتەوە، بەڵام ئێمە لەو سەردانانە زۆر سەرکەوتوو بووین و دانیشتوانی هەموو ئەو گوندانەی سەردانمان کردن زۆر

بەدڵخۆشی چەکدارەکانی خۆیان دەکردە دوو بەش و هەموویان هاوکار بوون لەگەڵ پێشمەرگەو شۆڕش، حوکمەتیش لەترسان هەموو ناحیەو مەخفەرەکانی خۆی بەبێ شەڕکردن کێشاوە ناو سەرای شاری پێنجوێن، بەس یەك مەخفەر مابوو ئەویش مەخفەرەکەی گوندی قزڵجە بوو ئەویش جێگای ئەوەندە عاسێ بوو بەشەڕ نەدەگیرا، لەپاش چۆڵکردنی مەخفەرەکە مام جەلال هێزێکی پێشمەرگەی نارد بەسەرکردایەتی عەبدوڵلا ئاغای پشدەری کە منیش یەکێك بووم لەگەڵیان و هەموو مەخفەرەکانمان سووتاند، یەکێك لەمەخفەرەکان سەرەکەی کۆنکرێت بوو نەدەسووتا خۆمان و خەڵکی گوندەکە ئاگرەکی گەورەمان لەناو مەخفەرەکە کردەوە نەشماندەزانی یەکێك لەپێشمەرگەکانی خۆمان لەناو مەخفەرەکە مابوو ئاگرەکە ئەوەندە گەورەبوو پێشمەرگەکە ڕێگای لێگیرا لەناو مەخفەرەکە گیانی لە دەست داو مرد ناوی (قالە قوچ) بوو و جەنازەکەمان هەر لە گوندەکانی هەرمێ ناشت، ئەو کاتە بەڕێوەبەری پۆلیسی پێنجوێن معاون کەمال شێخ غەریب بوو لەژێرەوە پەیوەندی لەگەڵ مام جەلال هەبوو بەشێوەیەکی زۆر نهێنی، ئەو تاکە مەخفەرەی مابوو ئەویش لەسەر داوای معاون کمال مام جلال هەمویانی ئیزندان بەچەکەوە لەپێش ئێمە ئەوانیش چوونە ناو سەرای پێنجوێن بەسەلامەتی، لەپاش ئەوەی هەموو کارەکانمان تەواو بوو بەشی زۆری گوندەکان گەڕاین و هێزەکی باشمان کۆکردەوە مام جەلال هەموو سەر پەلەکان و یاریدەدەری سەرپەلەکانی لەگەڵ خۆی بردە دۆڵی ناڵپاریز بۆ دیاری کردنی جێگای شەڕکردن، بۆ ئەوەی لەکاتێکدا ئەگەر حکومەت هێزی خۆی نارد بۆ یارمەتیدانی پۆلیسەکانی ناو سەرای پێنجوێن لەکاتی ئابلوقەدانی مەرکەزەکە، ئەو هێزە پێش لەهێزی حکومەت بگرێت لەناو دۆڵی

ناڵپارێز، گوندەکی بچوك هەبوو ئەو گوندە گوندی شێخ نەسرە بوو بۆ نان خواردنی نیوەڕۆ شێخ نەسرە دەعوەتی کردین، شێخ نەسرە لەقسەکردن هەڵسوکەوتی خۆی وا نیشاندەدا کوردەکی دڵسۆزەو زۆریش خزمەتی کردین ئێمەش لەشێخ نەسرە دڵنیا بووین وامانزانی پیاوێکی کورد پەروەرە لەکاتی دیاریکردنی سەنگەرەکان و جێگاکانمان شێخ نەسرە هەندەك جێگای دیاری دەکرد لەبەر ئەوەی ئەو خەڵکی ناوچەکە بوو زۆر لەئێمە شارەزاتر بوو هەر سەر پەلەو جێگای سەنگەرەکانی خۆی زانی و ڕووبەری شەڕەکە زۆر گەورە بوو هێزەکەی ئێمەش بەشی زۆری هێزی عەشائیری بوو، واتە نۆرەدار بوون بۆ ڕۆژی ئایندە ئەو هێزەی بۆ ناڵپارێز دانرابوو شوێنەکانی خۆیان گرت، پردەك هەبوو لەناڵپارێز پێشمەرگە پردەکەیان ڕووخاند، مام جەلال بەشی هەرە زۆری هێزەکەی لەناڵپارێز دانابوو بۆ گرتنی ڕێگای سلێمانی - پێنجوێن مام جەلال ئەو بەشە پێشمەرگانەی بۆ سەر سەرای پێنجوێن و شارەکەی دانابوو ژمارەیان زۆر کەم بوو، ئەندامانی حیزبیش ئاگادار بوون و بنکەکیشمان لە گوندی بناوە سوتە دانابوو بۆ دابین کردنی پێداویستیەکانی شەڕی ئەو بنکەش بەسەر پەرشتی سدیق ئەمین بوو، ئێوارێ مام جەلال لەگەڵ پێشمەرگەکانی بۆ ناو شار داندرا بووین چوینە گوندی بوبان ئەو گوندە گوندی شێخ عبدالکریمی کەرەبچنە بوو شێخ محمودیش لەو گوندە بووە، لەپاش نان خواردنی ئێوارێ لەگەڵ مام جلال چوینە ناو شاری پێنجوێن لە قەراغی شار مام جلال بە منی گوت بەڕەشاشەکەت مەخزەنەکی تەواو بەسەر شاردا باوێ، منیش لولەی ڕەشاشەکەم بڵند کردو ۳۰ فیشەکم بەسەر شاری دا هاویشت ئەو ۳۰ فیشەکە وەکو نیشارەتێ بوو بۆ ئەندامانی حزب کە نیشانەی ئەوە بوو هێزی پێشمەرگە گەیشتە ناو شارو هەروەها

ئاگادارکردنەوەش بوو بۆ معاون کەمال کەوا دەورەتان گیراوە، لەپاشان مام جەلال ئێمەی ناردە ناو شار چەند کار بەدەستەك هەبوون لەناو شار بیانگرن، بەڕێوەبەری ناحیە بەبەر من کەوت من چووم مدیر ناحیەم لەماڵەکەی خۆی بەبێجامەوە دەرهێناو هێنامە لای مام جەلال لە پاش من مدیر مالیشیان هێنا، مام جەلال ئەو گیراوانەی ناردە بنکەی بناوەسوتە، گرتنی مدیر مال بۆ کلیلی قاسەکەی ناو سەرا بوو، بەڵام کلیلەکە لای ئەو نەبوو، لەپاشان مام جەلال گەڕاوە بۆ لای بەرەکانی هێزەکەی ناڵپارێز، ئێمە ئەو پێشمەرگانەی لەناو شار بووین لەدەورەی سەرای پێنجوێن بووین ژمارەمان ١٧ پێشمەرگە بوو لەو ١٧ پێشمەرگەیەش ٣ کەس بێچەك بوون لەو بێچەکانە یەکێکیان ناوی عبدالخالق نەریمان بوو نائب زابتی فێراری عەسکەری بوو.

ئەو پێشمەرگانەی لە ناو شار بوون

١.عەریف عەلی ڕەقم دوو بوو خەڵکی گوندی سەرگەڵوو بوو

٢.ئەنوەر مستەفا ناسراو بە ئەنوەر نیتم پۆلیسی فێرار بوو خەڵکی هەولێر بوو

٣.حەمید ڕەشاش عەسکەری فێرار خەڵکی شاری کۆیە بوو

٤.علی مام ڕەشیدە کەڕی خەڵکی شاری کۆیە بوو

٥.خالید مام ڕەشید کەڕی خەڵکی شاری کۆیە بوو

٦.قادر حەمەد پۆلیسی فێرار بوو خەڵکی هەولێر بوو

٧.عبدالخالق نەریمان عەسکەری فێرار بوو خەڵکی کەرکوك بوو

٨.عادل عزەت ناسراو بە عادل کەوڵ سور خەڵکی کەرکوك بوو

من بەداخەوە هەر ئەوەندە ناوەم لەیاد ماوە، ئەو ١٧ پێشمەرگانەی لەناو شاری پێنجوێن بووین کەسمان خەڵکی سلێمانی نەبووین، ئێمە دەورەی سەرامان گرت پێشەکی داوامان لە معاون کمال و پۆلیسەکان کرد بەناوی شۆڕش بەناوی کوردایەتی بەبێ شەڕ خۆیان وەدەست بدەن و ئێمەش برای ئێوەین با شەڕ نەکەین و وەلامی پۆلیسەکان بۆ ئێمە تەقەکردن بوو هەر ئەو شەوەش دانیشتوانی پێنجوێن شاریان چۆڵکرد و کەس لەناو شار نەما، ژمارەی هەموو پۆلیسەکانی ناو سەرای پێنجوێن ٣٦٠ پۆلیس بوون، تەقە دەستی پێکرد بۆ بەیانی فڕۆکە جەنگییەکان هاتن ناو شاریان بۆردومان دەکرد، ئێمە بۆ خۆپاراستن لە فڕۆکە زۆر خۆمان لەسەرا نزیککردبۆوەو ئەوەندە نێزیك بووین بەشەو قسەمان لەگەڵ یەکتر دەکرد، دانیشتوانی شارەکەش هەرچەندە ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێ هێشتبوو چوبوونە گوندەکانی دەوروبەر، بەلام هەر دڵخۆش بوون، ئێمە نانمان لە بنکەی بناوەسوتە بۆ دەهات هەر چەندە ئێمە ژمارەمان کەم بوو بەلام من هەموو شەوێك جێگۆڕکێم دەکرد لە سێ لاوە بەڕەشاشەکەم تەقەم لەسەرا دەکرد، پۆلیسەکان وایان دەزانی ئێمە سێ ڕەشاشمان هەیە، بۆیە پۆلیسەکان نەیاندەزانی ژمارەی پێشمەرگە ئەوەندە کەمە من هاوەنەکی دوو گرێشم لەلا بوو جاروبار قومبەلەکم دەهاویشتە مەرکەزەکە بۆ ترساندن، معاون شێخ غەریب خوشکەزای سەعید قەزاز بوو هەر چەندە خۆی بەکوردپەروەر دەزانی، بەلام حەزیشی نەدەکرد پێنجوێن بگیرێ بۆیە شەڕەکە ئەوەندە درێژەی کێشا، پۆلیسەکانی لیوای سلێمانیش ئەوەندە هەستی کوردایەتییان نەبوو پۆلیسەکانیش لەهەموو جۆرە دەنگوباسێك خەبەرییان نەبوو، لەبەر ئەوەی کەس لەناو شار نەمابوو، دەربارەی خواردن و خواردنەوە پۆلیسەکان

هەر ئەوەندە خواردن و خواردنەوەیان هەبوو پێشتر بۆ خۆیان دایاننابوو، بەڵام ئەو شەڕە درێژەی كێشاو ئێمە هەموو شەوێك قسەمان لەگەڵ پۆلیسەكان دەكردو داوامان لێیان دەكرد واز لەحكومەت بێنن وەرنە ناو ڕێزی شۆڕشگێڕان، فایدەی نەبوو زۆر جار نامەمان بۆ معاون كەمال دەنوسی لەبەر دەركەمان دەبەستاو فرێمان دەدا سەریانی سەرا بەهەمان شێوە وەڵامەكەیان بۆ ئێمە دەهاویشتەوە هەر سوودی نەبوو، پۆلیسەكان ئەوەندە بێباوەڕ بوون وایان دەزانی ئەگەر تەسلیم بن هەموویان دەكوژین، ئەو شەڕە ١٤ ڕۆژ درێژەی كێشاو كار گەیشتە ئەوەی پۆلیسەكان ئاوو ئەرزاقیان كەم بۆوەو برسیەتی كاری تێكردن، بۆیە ناچاربوون داوا لەحكومەت بكەن چارەیان بۆ بدۆزنەوە، ڕۆژەك لەگەڵ ڕۆژهەڵات فڕۆكەیەكی گەورەی بارهەڵگر لەگەڵ دوو فڕۆكەی شەڕكەر هاتنە سەر مەرزەكە، فڕۆكە شەڕكەرەكان یەكسەر شاریان بۆردومان كردو فڕۆكە هەڵگرەكەش خۆی شۆڕكردەوە، نیازی وابوو ئازووقە باوێتە ناو سەرا ئێمە زۆر بەتوندی تەقەمان لە فڕۆكە گەورەكە كردو نەیتوانی ئەرزاق باوێتە خوارێ بەپەلە گەڕاوە لەگەڵ گەڕانەوەی فڕۆكە گەورەكە پۆلیسەكان ورەیان بەرداو ئەوەندەی نەبرد دووبارە فڕۆكە گەورەكە گەڕاوە ئەمجارە ٤ فڕۆكەی شەڕكەری لەگەڵ بوو، فڕۆكە گەورەكە لەسەر مەركەزەكە هەوڵیدا ئەرزاق فڕێبدات، دووبارە تەقەمان لێكردو دیسان گەڕاوە لەپاش ئەو هەوڵدانەش داوامان لە پۆلیسەكان كرد با بەس بێ ئەو شەڕە، ئەوان ڕازی نەدەبون، بۆیە ئێمە بیرمان لەوە كردەوە ئەو شەڕە زیاتر درێژە بكێشێو حكومەت جەیشێكی زۆر بێنێو نەتوانین مەركەزەكە بگرین، بیرمان كردەوە كە ڕێگایەك بدۆزینەوە، قومبەلەیەكی گەورە نەتەقیبۆوەو لەنزیك سەرایێ كەوتبوو، هەوڵماندا بەناو

مەجاری بیبەینە بن سەرایێو بەپاتری لەبن سەرایێ بیتەقێنینەوە، لەپاش ١٠ رۆژ ئابلۆقەدان حکومەت لیوایەك عەسکەری نارد لە سلێمانی یەوە بۆ پێنجوێن، هێزی پێشمەرگەش ماوەیەکی زۆر بوو لەناو سەنگەر لەچاوەڕوانیدا بوون، هێزەکەی ئێمە عبدالله ئاغای پشدەری بەهاوکاری شەهید مەلا رەسولێ گەرۆتی و عەریف عەلی مەولود سەرپەرشتی دەکرد، جەیشەکە گەیشتە دۆلچی نالپارێز، لەگەڵ هێزی پێشمەرگە بەرەنگاری یەکتر بوونەوە، هەرچی عەسکەر بوون لەهێرش کردندا بوون و هەرچی پێشمەرگەش بوو لەحاڵەتی بەرگریدا، هەر چەند جارێ حکومەت هێرشی دەکرد دەشکان و دەگەڕانەوە حکومەت لەو شەڕە هەموو جۆرە چەکێکی بەکارهێنا ئەوەندەی هەوڵیدا نەیتوانی بێتە پێش، جا پەندێکی کوردی هەیە دار دەڵێ ئەگەر بیور کلکی دار نەبوایە نەماندەتوانی بیبڕینەوە، بەڵام شەڕەکەی نالپارێزیش ئەگەر خۆفرۆشێکی وەکو (شێخ نەسرە) جاسوسی و چاوساغی بۆ جەیشەکە نەکردبا، جەیش بەئاسانی نەدەگەیشتنە پێنجوێن، ئەو خۆفرۆشە چووە لای ئامر لیوا عەقید عەسکەر محەمەدەوە پێش جەیشەکە کەوت، چونکە ئەو پێشتر سەنگەرەکانی پێشمەرگەی دەست نیشان کردبوو، جەیشەکەی بەلایەکیتر سوڕاندەوەو پشتی هێزەکەی پێشمەرگەی گرت، ئەوەبوو جەیشەکەی هێنا سەر سەنگەرەکانی پێشمەرگە، ئەوە کردەوەی (نەسرە) بوو کە بووە هۆی شکانی هێزی پێشمەرگەو هۆکارەکانی شکانی هێزی پێشمەرگەش لەنالپارێز ئەمانەی خوارەوەن:

١.خیانەتی (شێخ نەسرە)و هاوکاری کردنی لەگەڵ دوژمن

٢.بەشی هەرە زۆری هێزی پێشمەرگە لە ئورەدار پێکهاتبوو کە عەشایری بوو

٣.ڕووبەری جێگای شەڕ پان و بەرین بوو کۆنتڕۆڵ نەدەکرا

٤.شەهید بوونی (٤) پێشمەرگەی قارەمان لەوانە شەهید مەلا رەسولی سەرکردەو جەنازەکانیشیان لە مەیدانی شەڕ بەجێمان و ئەو شەهیدانە لەکاتی کشانەوەی هێزەکە ئاگادار نەکرابوونەوە، چەند بریندارێکیشمان هەبوو ئەو (٤) شەهیدانە هەر لەناو سەنگەرەکانیان بەئەمانەت.

دێمەوە سەر باسی سەرای پێنجوێن، ئەو سەرایە زۆر گەورە بوو و زۆریش قاییم بوو، دەرگایەکی دوو دەری داری پێوە بوو گوللە نەیدەبڕی، پۆلیسی قەزاو (١٢) مەخفەرو ناحییەیەکی تێدابوو، بەشەك لە پۆلیسەکان پۆلیسی سوارە بوون، ڕۆژەك دایکی معاون کەمال بەهەڵە داوان هاتە سەردانی کوڕەکەی، ئێمە ئاگادار بووین لە هاتنی دایکی معاون کەمال و شەڕمان ڕاگرت بۆ ئەوەی دەرگای سەرا بکەنەوە بۆ دایکی معاون کەمال، بەلاّم پۆلیسەکان لەترسان دەرگای سەرایان نەکردەوەو بەگوریسی دایکی معاون کەمالیان هەرکێشا سەربانی، ئێمە پۆلیسەکانمان ئاگادار کردەوە تەقەتان لێناکەین تا دایکی کەمال دەگەڕێتەوە، بەلاّم دەرگایان نەکردەوەو لەگەڕانەوەش بەگوریسی شۆڕیان کردەوەو دایکی کەمال گەڕاوەو دیاربوو ئەو چوونەی بۆ لای کوڕەکەی زۆر کاری لەکەمال کردبوو بۆ تەسلیم بوون هەروەها پۆلیسەکانیش خواردن و خواردنەوەیان نەماو ئەسپەکانیان ئالیکیان نەما، لەئێوارەی (١٤) ڕۆژەی گەمارۆدانەکە نامەیەکیان بۆ ئێمە نارد ئامادەیی خۆیان دەربڕیبوو و نووسیبویان خۆمان تەسلیم دەکەین بەلاّم بەکەفالەتی حەمەڕەشید خان نەوەك بمان کوژن، ئێمەش هەر ئەو شەوە ناردمان سدیقە فەندی و حەمەڕەشید خان هاتن و چوونە بەردەرگای سەراو پۆلیسەکان دەرگای سەرایان کردەوەو ئێمەش لەبەر ئەوەی ژمارەمان

ئەوەندە کەم بوو نەماندەوێرا بە باشی خۆمان ئاشکرا بکەین، گوتمان پۆلیسەکان بزانن ژمارەمان ئەوەندە کەمە ڕەنگە لێمان هەڵگەڕێنەوە، بۆیە ئێمە بەپەلە هەموو پۆلیسەکانمان بەسەرکردایەتی معاون کەمال و (٤) پێشمەرگەی خۆمان ڕەوانەی بنکەی بناوەسووتە کردو واشمان لەپۆلیسەکان گەیاند تا دەگەنە بناوەسووتە ڕاست و چەپتان پێشمەرگەیە، لەپاشان ئێمە چوینە ناو سەراو قاسەکەمان شکان (١١) هەزار دیناری تێدا بوو، پارەکەمان لەناو جەمەدانی کردو سەرای پێنجوێن زۆری شت تێدابوو هەموومان بۆ قوتار نەکرا ئەو دەستکەوتانەی قوتارمان کرد، ئەمانە بوون:

١- (١١) هەزار دیناری پارەی عێراقی

٢- (١٢) جیهازی لاسلکی جۆراوجۆری تێدابوو

٣- (١) جیهازی لاسلکی گەورەی تێدابوو، دەیانگوت دەکرێتە ئیزاعە ئەو جیهازە زۆر خۆشەویست بوو لای هەموومان

٤- (٥) سندوق فیشەکی تێدابوو، ئەوەبوو ئێمە تا پێشی ڕۆژهەڵات توانیمان ئەو شتانە لەشار دوور بخەینەوە، دەشمانزانی هێزی پێشمەرگە لەناڵپارێز شکایە، بۆیە ئێمە پێشی ڕۆژهەڵات لەشار چوینە دەرێ، هەر زووش پێشەنگی دەبابان گەیشتنە ناو شاری پێنجوێن، بەڵام شار چۆڵکرابوو کەس لەناو شار نەمابوو، هەر ئەو ڕۆژەی جێش گەیشتە ناو شار پۆلیسەکان زانییان جێش لەناو شارە دەوری ٥٠ پۆلیس خۆیان دزییەوەو گەڕانەوە ناو حکومەت، گەڕانەوەکەش بەردەوام بوو، ناچار بووین بەفێڵی ئیجاز توانیمان ٣٩ پارچە چەکییان لێوەربگرین، ئەو پۆلیسانەی لەناو سەرای پێنجوێن بوون کە ژمارەیان ٣٦٠ پۆلیس بوون هەموویان گەڕانەوە ناو حکومەت، بەس یەك پۆلیس ماوە ئەویش بووە پیاوی حەمەڕەشید خان و معاون کەمالیش ماوە

لەپاش تەواو بوونی شەڕ هەموو هێزی پێشمەرگە لەگوندی بناوەسووتە یەکترمان گرتەوە، گوندی بناوەسووتە ئەوەندە لەسنووری ئێران نزیك بوو فڕۆکەکان ئەو گوندەیان بۆردومان دەکرد، لەپاش تەواو بوونی کارەکان گەڕاینەوە بۆ لای چەمی ڕەزان، بەڵام لەکاتی گەڕانەوەماندا دەرکەوت حکومەت بەشی زۆر ڕێگاکانی گرتبوو، بۆیە بۆ سەلامەتی خۆمان ناچاربوین بچینە ناو خاکی ئێران و بەشەو هەموومان بەقۆناغ گەڕاینەوە چەمی ڕەزان، واش پێویست دەکا باسی دڵسۆزی و دەست پاکی و فیداکاری پێشمەرگەی ساڵانی ٦١ و ٦٢ و ٦٣ بکەم کە ئێمە لەسەرای پێنجوێن (١١) هەزار دینارمان گرت ئەو پارە لەناو جەمەدانی دابوو و هەر شەوەی لەلای پێشمەرگەك بوو، تا گەیشتە چەمی ڕەزان پارەکە حیساب کرا فلسەکی لێ کەم نەبوو ئەو کاتە دزی کارێکی شەرمەزاری بوو نە جیاوازی نە خزم خزمێنەو نە دەستەگەری هەبوو، ئەو کەسانە لەپێش بوون ئازاو دڵسۆز بانە، سەرکردەکانیش پاسەوانی تایبەتیان هەبوو، چەکی باش بۆ شەڕکەری باش بوو، لەکاتی گەڕانەوەماندا بۆ چەمی ڕەزان مام جەلال پەلەك پێشمەرگەی ناردە ناو قەزای چوارتا، هەموو دەرمان و ئاردی ئیماشایان هێنا لەپێش چاوی حکومەت، چونکە وا ترسابوون نەیانوێرا دەنگ بکەن تا ئێمە گەڕاینەوە، ناحیەی ماوەتیش گیرابوو، ناحیەی ماوەت توتنەکی زۆری تێدابوو، ئەو توتنە بەشەك فرۆشرا بەشەکیش لەسەر بنکەکان دابەشکرا، دەنگودۆڵو کاردانەوەی ڕزگارکردنی ناوچەی شارباژێڕو ناوچەی پێنجوێن لەسەرەتای ساڵی ١٩٦٢ سەدایەکی گەورەی هەبوو و خاڵەکی وەچەرخانیش بوو، ئەو دوو سەرکەوتنە گەورانەی یەك لەدوای یەکی هێزی پێشمەرگەی کوردستان کە بەسەرکردایەتی مام جەلال وەدەست هاتن لەکاتێکدا بوو بەشی زۆری

دانیشتوانی کوردستان باوەڕیان نەدەکرد پێشمەرگە ئەو هێزو توانایەی هەیە، ئەو چالاکییە گەورانە وای لەگەلی کورد کرد دووبارە باوەڕ بەبوونی پێشمەرگەو شۆڕش بکەنەوە لەلایەکی تریش حکومەت توشی سەرسوڕمان بوو، هەموو هێزەکانی حکومەت ورەیان دابەزی و مەخفەرو مەرکەزەکانی حکومەت توانای بەرگرییان نەماو لەهەموو لایەك پێشمەرگە دەستی بە چالاکی کرد، لەبەشێکی زۆری ناوچە ڕزگارکراوەکان بنکەو بارەگا داندران، بەشەکی زۆری پۆلیسی مەخفەرەکان لەحکومەت هەڵگەڕانەوەو هاتنە ناو شۆڕش و بەکۆمەڵیش خەڵك دەهاتنە ناو ریزەکانی پێشمەرگەو حکومەت ئیتر توانای نەما مەرکەزو مەخفەرەکانی ئاوەدان بکاتەوە، قەبارەی شۆڕش گەورە بوو و بەشەکی زۆر لەکوردستان ڕزگار کرا، بەڵام پەیوەندی و گەیاندنی هەواڵ و ڕێنمایی لەنێوان بنکەکان و هێزەکان لاواز بوو، هەمووی بەهۆی تەتەرەوە بوو، هەر ئەوەشبوو لەپاش ڕزگارکردنی ناوچەی شاربازێر کاك عومەر دەبابەو مامۆستا مەلا عەولاش دەستەوەستان نەوەستان، ئەوانیش پۆلیسی شەریکەی نەوت و ناحیەی تەقتەقیان هێنا، بەڵام ئێمە لەناوچەی بادینان زۆر خەبەردار نەبووین، بەس ئاگاداری شەڕە مەزنەکەی گەلی زاوێتە بووین لە مانگی ١٢ی ١٩٦١ لەو شەڕەدا خەسارەتەکی گەورە لەحکومەت کەوت و چەك و تەقەمەنیی زۆر کەوتە دەست پێشمەرگە، ئەو شەڕە بەسەرکردایەتی مەلا مستەفای بارزانی بوو، بەڵام ئەم شەڕە شەڕی یەکەم نەبوو لەگەڵ حکومەت، شەڕی یەکەم لەگەڵ جەیشی عێراقی لە ١٩٦١/٩/١٥ کرا لەشاخی کێوەڕەش لەڕانیە لەپشت گوندی سەیداوە بوو.

# دڵسۆزی شەهیدی قارەمانی گەلەکەمان
# هەڤاڵ ( جەعفەر عبدالواحد کۆیی )

شەهید جەعفەر یەکێك بوو لەپێشمەرگە دڵسۆزەکانی شۆڕشی ئەیلول، سەرەتای ناسینم لەگەڵ ئەو قارەمانە دەگەڕێتەوە بۆ هاوینی ساڵی (١٩٦٣) کە بەفەرمانی مەکتەبی سیاسی من گوازرامەوە بنکەی حاجی قەلا ئەو کاتە شەهید دکتۆر خالید سعید لێپرسراوی بنکەی حاجی قەلا بوو منیش سەرپەل بووم، ڕۆژێك گەنجێکی ڕێکوپێکی قسەخۆش نامەیەکی دکتۆر خالیدی بۆ هێنام منیش نامەکەم کردەوە دکتۆر خالید نووسیبوی وا هەڤاڵ (جەعفەر عبدالواحد)مان گواستەوە بۆ سەر میلاکی پەلەکەتان بەپلەی ڕابەری سیاسی کار دەکات لەپەلەکەتان هیوادارم هاوکاری بکەن، من بەهاتنی کاك جەعفەر زۆر کەیفخۆشبووم لەبەر ئەوەی ڕابەری سیاسیمان نەبوو، کاك جەعفەر بەماوەیەکی کەم لەبەر دڵسۆزی و کردوە باشەکانی خۆی جێگای خۆی لەناو دڵی هەموومان کردەوە، کاك جەعفەر کوڕێکی خوێندەوار و قسەخۆش و شارەزا بوو لەکاروباری ڕێکخستنی حزبی، هەموو مەرجەکانی کوردایەتی و کوردپەروەری تێدابوو، خوێندەواری باش بوو و زمانی ئینگلیزیشی دەزانی و لەگۆرانی گووتن دەنگی زۆر خۆشبوو، ئەو کاتی هەموو پێشمەرگەیەك دەبوایە لەشانەی حزبی بەشداری کۆبوونەوەکانی حزبی بکردایە، ئەو کاتە پێشمەرگە ئابوونەی نەدەدا لەبەر ئەوەی کەسمان مووچەمان نەبوو، شەهید جەعفەر کادیرێکی زۆر بەتوانا بوو ئەو ماوەی لەگەڵ یەکتر بووین زۆر

سوودمان لەکردەوەکانی کاک جەعفەر وەرگرت لەهەموو ڕوویەکەوە، ئەو ماوەی لەئێرانیش بووین بەشی زۆری هاتوچۆی ناو شارمان لەگەڵ یەکتر بوو، ئەو برادەرانەی زۆر لەکاک جەعفەر نزیك بوون دکتۆر حەسەن ئیسماعیل و دکتۆر حوسێن ئیسماعیل و مستەفا ڕابەر بووین، لەکاتی لەهەمەدان بووین لەناو خۆمان چەند خولێکمان کردبووەوە، لەو خولانە خولی فێربوونی زمانی ئینگلیزی بوو مامۆستایەکانی زمانی ئینگلیزی (تەها بابان و کاک جەعفەر عبدالواحد) بوون هەر ئەو ماوەی لەهەمەدان بووین من و کاک جەعفەر و کاک مستەفا ڕابەر مانگانە بەشێوەیەکی نهێنی بەیاننامەیەکمان دەردەکرد بەئاگاداری سەرکردایەتی بەناوی (سەرچڵ) لەسەر ئەو کەسانەمان دەنووسی کە کردەوەیەکی نارێکیان کردبا، بەبۆنەی جەژنی نەورۆز لەساڵی (١٩٦٥) لەشاری هەمەدان ئاهەنگێکی گەورەمان گێڕا بۆ ئاهەنگی نەورۆز و داوامان لەحکومەتی ئێران کرد هۆڵێکی زۆر گەورەیان بۆمان تەرخانکرد، ئەوەبوو مانگێك پێش جەژنی نەورۆز خۆمان ئامادەکرد بۆ ئاهەنگەکەو چەند تیپێکمان ئامادەکرد وەکو تیپی گۆرانی و سروود گوتن و تیپی هەڵپەڕکێ و تیپی تەمسیلی، لەو تیپە هونەریانە کاک جەعفەر دەورێکی زۆر باڵای هەبوو بەتایبەتی لەتیپی گۆرانی و سرود ووتن و هەروەها کاک جەعفەر خۆی جۆرە هەڵپەڕکێیەکی دانا بوو خۆشی سەرچۆپی گرتبوو، منیش بەشداری هەردوو تیپەکان بووم بۆ ئاهەنگی نەورۆز، سەرکردایەتی خەڵکێکی زۆر لەدانیشتوانی شاری هەمەدانی داوەت کردبوو لەکاربەدەستانی حکومەت و پیاو ماقوڵان و کەسایەتی شارەکە بەشدار بوون و حکومەتی ئێران تیپی مۆسیقای داینێو پێشەکی ئاهەنگەکە بەسروودی ئەی ڕەقیب دەستپێکرد، لەپاشان کاک عومەر دەبابە ووتارێکی بەزمانی فارسی و کوردی خوێندەوە ئینجا سروودی

نەورۆز لەلایەن تیپی گۆرانی و بەهاوکاری تیپی مۆسیقا دەستی پێکرد ئەو سروودە لەدانانی مامۆستا خالید دلێر بوو من بەشێکم لەیاد ماوە:

سالێکی تریش وا داهاتەوە ڕۆژی نەورۆزی کورد وا هەلاتەوە

بەم هاتنەوەیەش نەورۆز ئەم جارە دەرسی تێکۆشان دا ئەداتەوە

ئێمەش وا سلاو لەدوور وولاتەوە بەگولی سووری ڕێی خەباتەوە

دەینێرین بۆ هەر نەبەردێکەوە مەشخەلی شۆڕش هەلێ بکاتەوە

ئاهەنگەکە زۆر سەرکەوتوو بوو جێگای دلخۆشی هەمووان بوو، ئەوە لەکاتێ لەهەمەدان بووین لەدوای گەڕانەوەمان لەسالی (١٩٦٥) مامۆستا جەعفەر گەڕاوە سەر کاری خوێندن لەدوای بەیانی (٢٩)ی حوزەیران، کاک جەعفەر بووە مامۆستاو لەپاشان ژنی هێناو بەداخەوە لەسالی (١٩٧٦) لەگەلێ سێ قارەمانی تر لەسێدارەدران و لەدوای شەهید بوونی ژن و مندالەکانی لەڕێگای هەولێر ـ موسلێ تووشی کارەساتێکی دلتەزێن بوون و کوڕەکەی زۆر بەسەختی بریندار بوو بۆ چارەسەری کوڕەکەیان هێنایە بەغداو لەنەخۆشخانەی جوملەی عەسەبی بوو بۆ ماوەی شەش مانگ لەنەخۆشخانە ماوە ئەو کاتە من مالم لەبەغداد بوو من و مامۆستا مەلا عەولا زۆر یارمەتیماندا بەتایبەتی مامۆستا مەلا عەولا ئەو کاتە وەزیر بوو و سەردانی دکتۆر سعد الوتری کرد داوای لێکرد زۆر ئاگای لەو مندالە بێت و منیش وەکو مامێك خەم خۆریان بووم، ئەمە بەشێك بوو لەو زانیاریانەی لای من بوو دەربارەی شەهید جەعفەر عبدالواحید، ئەم شەهیدانە هەر چواریان بەیەك ڕۆژو كات لەسێدارە دران، بەلام ئێستا سەرکردەکان کە باسیان دەکەن یان سەردانی مالەکانیان دەکەن هەندێك جار بەزۆری هەر باسی یەکێکیان زیاتر دەکەن باشتر وایە وەکو یەك باس بکرێن.

## مام جەلال
## ئێستا لەبەرچاوان نییە، بەڵام لەناو دڵانە

پەندەکی کوردی دەڵێ (بەهەزار دەرزی گاسنەکی تێ نابێ) شۆڕە سوارەکەی کوردستان بەڕێز مام جەلال لەگەرمەی شەڕو لەناو سەنگەری خەبات و بەرگریدا تووشی نەخۆشی بوو بەداخەوە.

*** رۆڵی سەرۆك مام جەلال**

ئەوەی مام جەلال–ی نەدیبێ و نەیناسێ و شارەزای خەباتی ئەو شۆڕە سوارە نەبێ نازانێ بەدرێژایی ٧٠ ساڵی رابردوو چەند فیداکار بووە بۆ کوردستان، ئەوە بەو نەخۆشیە بۆ هەموو خەڵك ساغ بۆوە مام جەلال شورەکی پۆڵایین بوو بۆ هەموو عێراق و دەوڵەتانی دەوروبەریش، ئەوەش بۆ ئێمەی کورد سەربەرزیە، مام جەلال هەر لەتەمەنی منداڵی چوویتە ناو کۆڕی خەبات و کوردایەتی وحزبایەتی و لەکاتی سەرهەڵدانی جوڵانەوەی عەشائیری لەساڵی ١٩٦١، مام جەلال خۆی گەیاندە ناو ریزەکانی عەشائیری لەناوچەی رانیە، لەو ماوەیەشدا دوو جار چوویتە لای بارزانی لەو کاتەدا بارزانی لە بارزان بوو، پەیامی بارزانی بۆ سەرۆك عەشیرەتەکان دەهێناو پێیانی دەگۆت بارزانی دەڵێ کاتی شۆڕش نییە، بەڵام سەرۆك عەشیرەتەکان بەقسەی (مام جەلال)یان نەکردو بەردەوام بوون لەهەڕوگیف دەیان گۆت دەچین شاری کەرکوك دەگرین، جا ئەو خۆپیشاندانانە بەردەوام بوو تاڕۆژی

١٩٦١/٩/١١ حکومەتی عەبدولکەریم بە هێزی عەسکەری و فڕۆکە هێرشی کردە سەر هێزەکانی عەشائیری بۆ ماوەیەکی کەم هێزەکانی عەشائیری خۆیان ڕانەگرت و بڵاوەیان کرد، پاشان مام جەلال و هاوڕێیەکانی وەکو مەلا ناسح و شێخ عەبدوڵڵای عەسکەری و شێخ عەزیزی شێخ یوسفی شەدەڵەو کوڕەکانی شێخ فەتاحی عەواڵان و چەند پێشمەرگەیەکی قارەمان کەژمارەیان لە ٢٠ کەس زیاتر نەبوون بەبێ پارەو پوول و چەك چوونە ناو ئەشکەوتەکانی چەمی ڕەزان بۆ ئەوەی بناغەی شۆڕش دامەزرێنن، پاشان ناردی لەهێزی سەفین چەند پارچە چەکێکی جۆری ئینگلیزی بۆ هات خۆیان چەکدار کرد لەمانگی ١٩٦١/١١ حزب کۆبوونەوەیەکی گەورەی بەست لەگوندی عەواڵان لەو کۆبوونەوەیەدا هەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و لیژنەی مەرکەزی ئامادەبوون، بەڵام سەرۆکی حزب لەگەڵ ئەو کۆبوونەوەیە نەبوو ئەوەبوو لەو کۆبوونەوەیەدا بڕیاردرا درێژە بەشۆڕشی چەکداری بدەن، لەپاش کۆبوونەوەی عەواڵان مام جەلال و کاك عومەر دەبابە هاتنە گوندی شیوە شەن لەدەشتی کۆیی. هەر لەمانگی ١٩٦١/١١ مام جەلال پارەکەی ڕێگای کۆیی گرت و هەر لەگوندی شیوە شانیش ناوی لەمن نا حەمید ڕەشاش جا لەپاش گرتنی پارەی کۆیلە گوندی ڕێزینە لەدۆڵەڕەقە مام جەلال و عومەر دەبابەو مامۆستا مەلا عەوڵا کۆبوونەوەیەکی گەورەیان بەهەموو هێزی پێشمەرگە کردو لەو کۆبوونەوەیەدا هێزی پێشمەرگە کرا بە دوو لق ناوی دەستە پەل و لق دانراو سەر لقی یەك مامۆستا مەلا عەوڵا بوو، سەر لقی دووش عەریف سلێمان، منیش کرام بەیاریدەدەری سەر پەل لەلقی دوو سەر پەلەکەم حەمید کاوانی بوو لەپاش ڕێکخستنی هێزی پێشمەرگە مام جەلال گەڕاوە چەمی ڕێزان، پاشان مام جەلال داوای ٧٥ پێشمەرگەی کرد

لەلقی دوو کە بچینە لای مام جەلال لەو ٧٥ پێشمەرگانە منیش لەگەڵ بووم کەچووینە چەم، مام جەلال هەندەك پێشمەرگەی تری کۆکردبۆوە لەوانە عەبدوڵا ئاغای پشدەری بوو، عارف قەرەچەتانی و کەریم ئاغای مووغاغ و چەند پێشمەرگەکی تر، مام جەلال بەهاوکاری ئەندامانی لقی حزب لەسلێمانی و پۆلیسەکانی سەرای سلێمانی پلانێکیان دانابوو لەشەوی جەژنی ساڵی ١٩٦٢ بچێت سەرای سلێمانی بگرێت ئەوکاتە نووری ئەحمەدی تەها لێپرسراوی لقی حزب بوو لەسلێمانی، جا هێزەکەمان بەسەرکردایەتیی مام جەلال لەشەوی جەژن چووینە ناوشاری سلێمانی، بەڵام نەلێپرسراوی لق و نەپۆلیسەکان هاوکارییان لەگەڵمان نەکردو پەشیمان بوونەوە ئێمەش ناچار بوو بەرەبەری بەیانی لەشار چووینە دەرێ، بۆ نموونە بەرێکەوت نهێنی شەومان لەگەڵ نهێنی شەوی عەسکەرەکانی سلێمانی وەکو یەك بوو هەردووکمان عارفات بوو ئەوەندە نزیك بووین لەعەسکەرەکان گوێمان لە فیق و نهێنی ئەوان بوو، جا ئەوە بوو ئێمە بەسەرکردایەتیی مام جەلال چووینە گوندی هەڵەدن نانی جەژنمان لەمزگەوتەکەی گوندی هەڵەدن خوارد، مام جەلال گایەکی بۆ پێشمەرگەکان سەربڕی.

### * هەر مامی ئێمە نییە

ئەوکاتە ئەگەر لێپرسراوی لق و پۆلیسەکان هاوکارییان لەگەڵمان کردبایە ئەوا سەرای سلێمانی ئازاد دەکراو هەموو ئەو چەکو تەقەمەنییە دەکەوتە دەست پێشمەرگەو گورزی گەورەش بەحکومەت دەکەوت، مام جەلال زۆر بیری لەپلانی گەورە گەورە دەکردەوە بۆ هەر پلانەکی دابنابایە باش ئامادەکاری بۆ دەکرد بۆ نموونە کەپلانی گرتنی قەزای چوارتای دانا بیری

لەوەکردەوە پێویستی بەهێزەکی زۆرتر هەیە لەبەر ئەوەی ئەو کاتە پێشمەرگە کەم بوو، بۆ مەبەستی کۆکردنەوەی هێز مام جەلال خۆی و هێزەکەی سەردانی بەشی زۆری گوندەکانی ناوچەی سیویلی کردو لەهەر گوندەو ئێواران خەڵکی گوندەکەی لەمزگەوت کۆکردەوەو داوای لەدانیشتووانی گوندەکە دەکرد بەچەکدار پشتگیری لەشۆڕشەکەیان بکەن.

مام جەلال ئەوەندە قسەخۆش و شۆڕشگێرانە قسەی دەکرد گوندەکان بەخۆیان و چەکدارەکانی خۆیان وەکو هێزی بەرگری (نۆرە دار) دەنارده ناو هێزەکانی پێشمەرگە، بۆیە مام جەلال توانی لەماوەیەکی کەمدا هەموو ناوچەکانی سلێمانی ئازاد بکات بەتایبەتی لەسەرووی سلێمانی لەو ماوەی من لەگەڵ مام جەلال بووم نەمدیت مام جەلال رۆژەك نانەکی تایبەتی بەبێ پێشمەرگەکانی خۆی بخوات، بەڵێ مام جەلال جاروبار دەعوەت دەکرا، مام جەلال لەکاتی پێشمەرگایەتی بەتایبەتی لەشۆڕشی ئەیلول شەوو رۆژ لەپێشمەرگەکانی دانەدەبڕاو قەت سواری وڵاخیش نەدەبوو ئێمەی پێشمەرگە دێرینەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی کە باسی مام جەلال دەکەین بەقوڕگی پڕ لەگریان باسی دەکەین، بەڵام بۆمان دەرکەوت مام جەلال هەر مامی ئێمە نییە، مام و خۆشەویستی هەموو پێکهاتەکی عێراقەو بێ (مام جەلال)یی پێوەدیارە، تا مام جەلال نەخۆش نەکەوت زۆر کەس نەیدەزانی غیابی مام جەلال چەند گەورەیەو کەسیش ناتوانێ ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە، ئێستا ئەوەی مام جەلال دەناسێ و ئەوەی ناوی (مام جەلال)ی بیستبێ دوعای چاکبوونەوەی بۆ دەکەن.

## * هەموومان شانازیی پێوەدەکەین

بەکردەوە دەرکەوت مام جەلال وەکو تەرازوو لەنگەی عێراق و دەوروبەری عێراقی ڕاگرتیە، جا ئێمەی کورد دەبێ هەمووومان شانازی بەو سەرۆک کۆمارەوە بکەین کە تاکە سەرۆک کۆماری کوردە لای هەموو گەلی عێراق و دەوڵەتانی دەوروبەر ئەوەندە خۆشەویستە کەم سەرۆک کۆمار هەیە وڵاتەکەی خۆی ئەوەندە لێی ڕازی بن، ئێمە لەشاشەکانی تەلەفزیۆن هەموو شتێك دەبینین و دەزانین حاڵی سەرۆك کۆماری وڵاتان چۆنە، ئەوە مام جەلال تاکە سەرۆك کۆمارە ئەوەندە جێگای باوەڕی هەموو دانیشتووانی عێراق بێ.

من دەڵێم خوای گەورە دوعای ئەو هەموو خەڵکە قبوڵ بکات و بەگەورەیی خۆی، مامە بە سەلامەتی بگەڕێتەوە.

# مام جەلال و گرنگیدان بەکاری ڕێکخستن

سالّی ١٩٦٨ کە ئەوکات مام جەلال فەرماندەی هێزی ڕزگاری بوو، ئەوەندە گرنگی بەڕێکخستن دەدا، هەموو هێزەکە دابەش کرابوو لەسەر شانە حزبییەکاندا، ئەوکاتە من لێپرسراوی بەشی تەقەمەنی هێزەکە بووم و ئەندامی ناوچەی پێشمەرگەش بووم، لەگەڵ خوالێخۆشبوو ئەحمەدی دادی و قارەمان شەوکەت و مەلا موساو حەمید سوری. مام جەلال ٨ پێشمەرگەی لەگەڵ بوو پێیان دەگوت دەستەی مام جەلال، سەردەستەکەشیان پێشمەرگەی دێرین ئەنوەر جۆخین بوو، سەرشانەی دەستەکەو خۆیشی لەشانەکەی من بوون. ئەو کارە بۆ ئێمە کارێکی ئاسان نەبوو، زۆر بەشەرمەوە لەگەڵی دادەنیشتین هەر لەسەرەتای کارەکەمان دەستەکەی مام جەلال هاتنە لام و گوتیان ئێمە زۆر شەرم دەکەین لەڕووی مام جەلال باسی ڕێکخستن بکەین، لەبەر ئەوەی شەرمی لێدەکەین، منیش گوتم: لەکاتی کۆبوونەوەکان من کارێکی وا دەکەم و پرسیاری لێدەکەم و کۆبوونەوەکان دەخەینە ئەستۆی مام جەلال، جا هەر چەند جارێ کۆبوونەوەمان دەکرد مام جەلال ئامادە دەبوو، نەك وەکو فەرماندەو ئەندامی مەکتەبی سیاسی، بەڵکو وەکو ئەندامێکی شانەی کۆبوونەوە بەشداریی کۆبوونەوەکانی دەکرد. هەموو جارێك وامان دەکرد باسی شۆڕشەکانی چین و ڤێتنامی بۆ دەگێڕاینەوە، زۆرباش لەیادم ماوە جارێك لەکۆبوونەوە باسی سەرکردەیەکی بۆ دەگێڕاینەوە بەناوی سەرکردەی زەنگە زۆرە، وەکو مام گوتی: لەسەرەتای شۆڕشی ڤێتنام ئەو سەرکردە شۆڕشگێڕە چەکی نەبوو، بیری لەوە

دەکردەوە بەچ شێوەیەك چەك پەیدا بکات، تا لەناوچەکەی خۆی دەست بەشۆڕش بکات دژی داگیرکەران. بەڕێکەوت ئەو ساڵە (زەنگە زۆرە) زۆر دەبێ و ڕۆژانەش جێبێکی سەربازیی لەگەڵ چەند سەربازێك لەنزیك گوندەکەیان هاتوچۆ دەکەن. ئەو سەرکردەیە بیر لەوە دەکاتەوە بەهۆی چەند شارە (زەنگە زۆرە)یەکەوە سەربازەکان بشێوێنێ و چەکەکانیان لەدەست دەربهێنێت. ئەو شۆڕشگێڕە دەچێ ٤ ـ ٥ زەنگولۆکەی وردیلە دەکڕێ و هەر زەنگولێك لەداوە دەزوێك گرێدەداو شەو دەچێ لەتەنیشت کەندێکی نزیك جادەکە قورتەکی هەردەقەنی و لەپاشان دەچێ لەهەر شارە زەنگە زۆرەیەك زەنگوڵەیەکی شۆڕ دەکاتەوە بۆ ناو کونە زەنگە زۆرەکان، سەرە دەزوەکانیش دەباتە لای خۆی و چاوەڕوان دەکا تا جێبە سەربازییەکە دێت، جێگاکەش کەند دەبێ، پێش ئەوەی جێبەکە بگاتە کەندەکە، ئەو داوەکانی رادەکێشاو زەنگوڵەکانی لەناو کونە زەنگە زۆرەکان دەجووڵاند، هەموو کونە زەنگە زۆرەکان هار دەکات، جێبە عەسکەریەکەش دەگاتە سەر لێواری کەندەکەو هەندێك سەبر دەکاو ئەو زەنگە زۆرانە هەموویان لەعەسکەرەکان دەئالێن، عەسکەرەکان هەریەکەو بەلایەکدا هەڵ دێن و چەکەکانیان لەناو جێبەکە بەجێ دەهێڵن، شۆڕشگێڕەکەش دەچێ چەکەکان هەر دەگری و عەسکەرەکان دەکوژێ و ٤ ـ ٥ چەکی دەست دەکەوێت و دەچێ چەکەکان دابەشدەکات و دەست بەچالاکی دەکەن، چەند جارێکی تر چەك لەدوژمن دەگرن و دەبنە لەشکرو ئەویش لەناوچەی خۆی دەست بەشۆڕش دەکات و ئەو نازناوەشی بە بەردەکەوێ پێیدەڵێن سەرکردەی زەنگە زۆرە، مام گۆتی: ئەوەندە سەرکردەیەکی ئازاو بەناوبانگ بوو هەر وەفدێك بۆ سەردانی بچوایەتە ڤێتنام، بەتایبەتی سەردانی

سەرکردەی زەنگە زۆرانی دەکرد. جارێکی دیکە لەکۆبوونەوە باسی سنیادسنی بۆ کردین، لەپاشان چۆن لەوڵاتەکەی تر بەدەستی کرێکارێك کوژرا، یان باسی گیڤارای بۆ دەکردین، یاخود باسی ماوی دەکرد جگە لەڕێکخستن وای کردبوو هەموو هێزەکە بیروڕای ئازادیان هەبێ، چ لەنووسین، چ لەرەخنەگرتن بۆ نموونە جارێك مام جەلال سەفەرێکی کرد کە لەسەفەرەکە گەڕایەوە، هەموو سەر لق و سەرپەلەکانی کۆکردەوەو قسەی بۆکردن، دەربارەی سەفەرەکەی، بەڵام رابەرە سیاسییەکانی بەشداریی پێ نەکرد، کاتێك کۆبوونەوەکە تەواو بوو، مام جەلال گۆتی: کێ پرسیاری هەیە؟ من دەستم هەربڕی و مام گۆتی فەرموو: من گۆتم: من پرسیارم نییە، بەس رەخنەم لەجەنابت هەیە، کە باسی رەخنەم کرد، مام جەلال هەستا سەرپێ و لەشێوەی عەسکەریی ڕاوەستاو گۆتی: من وەکو عەسکەر ئامادەم هەر کەسەك رەخنەی لەسەر من هەیە من سوپاسی دەکەم، منیش گۆتم: مام، جەنابت ئەوەندە پابەندی بەڕێکخستن ئەدی بۆ رابەرە سیاسییەکانت لەکۆبوونەوەکە بەشداریی پێنەکرد؟ مام جەلال گۆتی: رەخنەکەت زۆر راستەو زۆر سوپاست دەکەم و داوای لێبوردن دەکەم، ئەوە بوو لەگەڵ رابەرە سیاسییەکانیش کۆبۆوە، مام جەلال لەبەردەم ژوورەکەی خۆی کە هەیوانەك هەبوو، بەرنامەکی دانابوو وەکو سەکۆی ئازاد ڕێگای بەهەموو پێشمەرگەکان دابوو ئەو کەسەی دەتوانی شت بنووسی دەربارەی، هەموو شتێك چ رەخنە بێ چ داواکاری بێ چ پێشنیاز بێ چ شکات بێ بینووسێ و نووسراوەکەی لەبن هەیوانەکەی مام جەلال دەدا، جا دیوارەکەی بەردەرگای مام جەلال رۆژانە چەندین نووسراوی جۆراوجۆری پێوە بوو، هەموو کەسەك ئەو نووسراوانەی دەخوێندەوەو مام خۆیشی هەموو بەیانیان تەماشای

نووسراوەکانی دەکرد. ئەوە کردەوەکانی مام جەلال بوو لەناو پێشمەرگەکان من بۆیە ئەو بابەتەم نووسی، شوکر بۆ خوای مەزن تائێستا هەردووکمان ماوین. ئەگەر نەم نووسیبایە ئەوە بزر دەبوو. من هیوادارم جەنابیشی ئەو بابەتە بەبەرچاوی بکەویٚ بۆ بیرەوەریی.

## وێنەی مام جەلال
## ئاشتیو هیواو زەردەخەنەی بۆ کوردستان هێنا

ئەو ماوەی (٥) مانگە دانیشتوانی کوردستان دەستیان لەسەر دڵیانەو لەناو گێژاوی خەمو خەیاڵی ناخۆشدانە لەپاش نەخۆشکەوتنەکەی مامە خۆشەویستەکەی کوردستان، بابە کوردییەکەی خۆمان بیڵێم هەموومان دڵمان دەقرقراو هەزار ڕێی دەکرد لەو دابڕانەی بەڕێز مام جەلال چارەو قودرەتمان نەبوو لەپاڕانەوە زیاتر لەخوای گەورە داوامان لێدەکرد بەگەورەیی خۆی مام جەلال-مان بەسەلامەتی بداتەوە، خوای مەزن کەرەمی کردو ڕۆژی (٢٠١٣/٥/١٧) لەشاشەی کوردساتو تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان تاقانە خۆشەویستەکەی کوردستان وێنەکەی دەرکەوتو ئەو دەرکەوتنەوەی مام جەلال لەهەموو کوردستان دەنگیداوە، هەر لەگەڵ دەرکەوتنی بەڕێز مام جەلال هەموو خەمو پەژارەکان ڕەوینەوەو دەرگای هیواو ئاوات لەدڵی خەڵکی کرانەوە.

هەر لەپاش دەرکەوتنی وێنەی سەرۆکی خۆشەویستی گەلەکەمان بەهارو نەورۆز دووبارە سەریهەڵداوەو هەموو دانیشتوانی شارو شارۆچکەکان لەخۆشی مام جەلال ڕژانە سەر شەقامەکان بەجۆشو خرۆشو چەپڵە ڕێزان، ئەو خۆشەویستییەو ئاهەنگگێڕانە بەتەواوی هەستی نەتەوایەتی بەرزکردەوەو خۆشەویستیو تەباییو برایەتی نۆژەن کردەوە لەناو دانیشتوانی کوردستان.

منیش وەکو کۆنە پێشمەرگەکی مام جەلال کە هەردووکمان لاو بووین

لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلول ئەو کاتەو ئێستای خۆمانم وەبیر دەهاتەوە لەپێش تەلەفزیۆنەکە وێنەکەی مام جەلالم دەدیت لەخۆشیان زەردەخەنەی تێکەڵاو لەگەڵ گریان دەهاتە سەر لێوەکانم. جەماوەری یەکێتیو هەوادارانی بەهاوکاری دانیشتوانی کوردستان هەر هەمووماں بەسۆزەکی پڕ لەخۆشەویستیو هەستی کوردایەتی بەشداری ئەو خۆشییە بوون و لەهەموو لایەك شیرینی دابەش دەکرا لەخۆشی سەلامەتی بەڕێز مام جەلال. با ئەوەش بڵێین تاك تاك کەسیش هەبوون زیندەخەونیان بەمام جەلالەوە دەدیت ئەوانیش لەگەڵ دەرکەوتنی مام جەلال هۆیەکیان لەخۆیان زانیو چوونەوە ناو قاوغەکانیان.

مام جەلال لەکاتی منداڵی هەندەك جیاوازی هەبوو لەگەڵ منداڵانی دەوروبەری خۆیان وەکو باوکی باسی دەکرد کە چووە قوتابخانەش هەر جیاوازی هەبوو لەبارەی زیرەکی و لێهاتوویی وەکو هاوڕێیەکانی باسی دەکەن، کە چووە ناو حزبی پارتیش برادەرەکانی هەر باسی زیرەکی ئەو پیاوە دەکەن، لەکاتی سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلولیش من پێشمەرگەی ئەو بووم سەرکردەکی زۆر خۆشەویستو نەترسو سەرکەوتوو بوو، ئەوەش هەموو پێشمەرگەکان دەزانن. لەکاتی شۆڕشی نوێش ئەوە مام جەلالەو پێویست بەباسکردن ناکات. خۆ لەکاتی ئاشتیش مام جەلال دەوری کاریگەرو سەرەکی هەبووە لەهەموو پارچەکانی کوردستان، لەکاتی سەرۆك کۆماریش مام جەلال خۆشەویستترین سەرۆك کۆمارە. ئەوە کردەوەکانی مام جەلالە.

ئێمەی پێشمەرگە دێرینەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی کە پێمان دەڵێن جەلالی زۆر شانازی بەو ناوە دەکەینو مام جەلالیش لای ئێمە قەت قەت پیر نابێتو هەر سەرکردەمانە لەکۆتاییدا ئێمە وەکو پێشمەرگە دێرینەکان پڕ

بەدڵ خۆشحاڵین بەباشبوونی تەندروستی ماممان، نازانین بەچ زمانێك خۆشحاڵی خۆمان دەربڕین. هیوادارم مام جەلال زوو بگەڕێتەوە سەر کارەکانی خۆیو ئێمەش بەدیداری شاد بین.

## ڕۆڵی سەرکردایەتیی
## هەڤاڵ مام جەلال لەشۆڕشی ئەیلولدا

لەپاش بۆردومانکردنی هێزەکانی عەشایەری لەلایەن حکومەتی (عەبدولکەریم قاسم)ەوە، لەڕۆژی (١١/٩/١٩٦١) لەناوچەکانی دۆڵی خەلەکان و چنارۆك و دێگەڵەو دەربەندی بازیان و دەربەندیخان و هەروەها کشانەوەی هێزی پێشمەرگە لەچیای سەفین بۆدۆڵە ڕەقە لەبەر برسێتی و نەبوونی فیشەك و بەردەوامی شەڕ لەوەرزی زستاندا، حکومەت وایزانی کورد چەکداری نەماوەو توانای شۆڕشی نییەو ئەوانەی ماویشن بڵاوە دەکەن، دانیشتوانی کوردستانیش ساردبوون و باوەڕیان بەوە نەبوو کە شۆڕش درێژەی پێبدرێت، پاش ئەم دامرکانەوەی جموجۆڵی چەکداری سەرکردایەتی حزب کۆبوونەوەیەکی گەورەی لەگوندی عەودالآن ئەنجامداو لەو کۆبوونەوەیەدا سەرکردایەتی حزب بڕیاریدا درێژە بەشۆڕشی چەکداری بدات، لەپاش تەواو بوونی کۆبوونەوەی عەودالآن (مام جەلال و کاك عومەر دەبابە)، هاتنە گوندی شیوە شان لەسەرەتای مانگی (١٢)ی ١٩٦١دا، مام جەلال لەگەڵ دەستەیەك پێشمەرگە لەنزیك گوندی شێخ خەروان پارەکەی کۆیەی گرت، کە بڕەکەی (٣١) هەزار دیناری ئەو کاتە بوو، مام جەلال پارەکەی هێنایە گوندی ڕێزینە لەگەڵ گرتنی ئەو پارە زۆرە شۆڕش چووە قۆناغێکی تر لەهەموو ڕوویەکەوە، بڕێك لەو پارەیە بەبڕی (١٣) هەزار دیناری نارد بۆ سەرۆك بارزانی نەمرو لەپاش گرتنی پارەکە هەر لەگوندی ڕێزینە (مام جەلال

و کاك عومەر) لەشکرەکەی دۆڵە ڕەقەو ناوچەی خۆشناوەتیان کۆکردەوەو دوو لقی پێشمەرگەیان پێکهێنا، سەر لقی (١) مامۆستا (مەلا عەولا) بوو، سەر لقی (٢) (عەریف سلێمان) بوو و هەر لەو کۆبوونەوەیەشدا ناوی لق و پەل و دەستە دانرا، لەو ڕێکخستنەیش من بەیاریدەدەری سەر پەل داندرام کە سەر پەل شەهید (حەمید کاوانی) بوو، ئەو کاتە هێزی پێشمەرگەی کوردستان زۆر کەم بوو لەناوچەی خۆشناوەتی، دوو لقی پێشمەرگە هەبوو لە (چەمی ڕێزان)، (١٧) پێشمەرگە هەبوو کە (مام جەلال) سەرکردایەتی دەکردن، لەبنکەی گوندی (دڕێ) (٢٠) پێشمەرگە هەبوو بەسەر کردایەتی (عەبدوڵلا ئاغا پشدەری) لەناوچەی شوان شێخ بزینی پەلێك پێشمەرگە هەبوو بەسەر کردایەتی (شێخ قادری سۆتکە) ئەوە هەمووی هێزی پێشمەرگەبوو لەسەرەتای بەهاری ساڵی (١٩٦٢)دا.

## گرتنەکەی سەرای سلێمانی

لەمانگی ڕەمەزاندا (مام جەلال) پلانی گرتنی سەرای سلێمانی دانا بەهاوکاری ئەندامانی لقی حزب و پۆلیسەکانی سەرای سلێمانی بۆ ئەو مەبەستە (مام جەلال) هێزێکی کۆکردەوە کەپێکهاتبوو لە(٧٠) پێشمەرگەی ناوچەی خۆشناوەتی کە بەندەش یەکێك بوو لەوانە، لەگەڵ پێشمەرگەکانی چەمی ڕێزان و ناوچەی شوان و گوندی دڕێ، کاتی جێبەجێکردنی دەست بەسەرداگرتنی سەرای سلێمانی شەوی جەژن بوو کە پێشمەرگە بەسەرکردایەتی (مام جەلال) چوونە ناوشاری سلێمانی و هەموو ئەوجێگایانەی بۆیان دانرابوو لەچاوەڕوانی جێبەجێکردندا بوون، بەڵام نەئەندامانی لق و نەپۆلیسەکان هاوکاریی هێزی پێشمەرگەیان نەکرد، کە ئەو

کاتە بەرپرسی لقی سلێمانی (نوری ئەحمەد تەها) بوو، لەبەر هاوکاری نەکردنی لق و پۆلیسەکان بەرەبەیان هێزی پێشمەرگە گەڕاینەوە گوندی (هەڵەدن).

لەگوندی هەڵەدن بۆ نانی جەژنە (مام جەلال) گایەکی سەربڕی نانی جەژنمان لەمزگەوتەکەی ئەو گوندە خوارد، پاشان (مام جەلال) کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ سەر پەلەکان کردو بڕیاردرا مادام ئەو هێزە کۆبووینەتەوە دەبێ چالاکی چەکداری دەست پێبکرێت، هەر لەکۆبوونەوەکە پلانی گرتنی (قەزای چوارتا و ناحیەی باسنێ و مەخفەری گوندی گرگاشەو مەخفەری گوندی مۆکەبەو مەخفەری گوندی گاپیلۆن) دانرا، بەڵام هێزەکەمان کەم بوو نەمان دەتوانی ئەو هەموو جێگایانە بگرین بۆئەوەی سەرکەوتوو بین، (مام جەلال) وتی: دەبێ چەکدار لەگوندەکان وەربگرین و بەنۆرە کارەکان ئەنجامبدەین، هەموومان کۆك بووین لەسەر پلانەکەو بڕیارەکە بۆ جێبەجێکردنی لەگوندی (هەڵەدن) بەرێکەوتین بەرەو (قەزای ماوەت)، ئەوکاتە قەزای ماوەت نەگیرابوو حکومەتی تێدا بوو، معاونی پۆلیسی ماوەت ناوی (جەلالی حاجی عەلی) بوو وا خۆی نیشاندەدا ئەندامی حزبە، بەڵام پێیخۆش نەبوو (ماوەت) بگیرێ، ئێمە خۆمان و هەموو هێزەکەمان چووینە ناو ماوەت و دابەش بووین بەسەر ماڵەکانی ماوەتداو تەنانەت ماڵە پۆلیسەکانیش پێشمەرگە میوانیان بوو تا هێزی پێشمەرگە لەناو قەزای ماوەت بوو پۆلیسەکان لەناو مەرکەزەکە نەهاتنەدەر، ئێمە چوار شەو و چوار رۆژ لەماوەت ماینەوە، لەو ماوەیەدا هەموو پێشمەرگەکان جلوبەرگیان بۆ شۆراو خۆشیان شوشت، کە لێرەدا پێویستە سوپاسی دانیشتوانی ماوەت بکەین بۆ ئەو هەموو چاکەو خزمەتەی لەگەڵ هێزی پێشمەرگەدا کردیان.

## سیاسەتەکەی مام جەلال

لەدوای مانەوەمان لەماوەت دەرچووین و چووینە گوندەکانی (ژاژڵە، ئاوکورتێ، شاناخسێ، سوورە قەڵات، سیرەو سیرێ، گوندی سەراو و میراوە) لەهەموو گوندەکاندا ئێواران (مام جەلال) خەڵکی گوندەکانی لەمزگەوتەکاندا کۆدەکردەوەو وتارێکی بۆ دەخوێندنەوە، وتەکانی ئەوەندە شۆڕشگێرانە بوو هەموو خەڵکەکەی دەهێنایە جۆش و خرۆش و پاشان داوای هاوکاری لەگوندەکان دەکرد بەشداری لەشۆڕشەکەی خۆیان بکەن بەچەکداری بەشێوەی نۆرەدار هەموو گوندەکان چەکدارەکانی خۆیان دەکردە دوو بەش هەر بەشەو ماوەی (١٥) ڕۆژ لەگەڵ هێزی پێشمەرگە دەمانەوە، بەو شێوەیە یەکتریان دەگۆڕی، ئەو کاتە تەنیا چەکی گەورەمان هەر ئەو ڕەشاشەی لای من بوو، ئێمە لەو گەشتەماندا بەردەوام بووین تا گەیشتینە گوندی ڕەشەکانی ئەو گوندە لەپشت ناحیەی باسنێ بوو، لەگوندی ڕەشەکانی مام جەلال نامەیەکی بۆ بەڕێوەبەری ناحیەو بەڕێوەبەری پۆلیسی ناحیەی باسنێ نارد داوای لێکردن جێگایەك دیاری بکەن بۆ دانیشتن و گفتوگۆکردن ئەو کاتە بەڕێوەبەری ناحیە ناوی جەمال ڕەمزی بوو و بەڕێوەبەری پۆلیسیش ناوی (فازڵ ئەشگەر) بوو کە عەرەب بوو، ئەوانیش لەسەر داواکارییەکەی مام جەلال ڕازیبوون، جێگای دانیشتنەکە چایخانەیەك بوو لەپاڵ مەرکەزەکەی پۆلیسی باسنێ بوو بۆ ئەو دانیشتنە مام جەلال چوار پێشمەرگەی لەگەڵ خۆی برد کە ئەوانیش (عەبدوڵڵا ئاغای پشدەری، عەبدولڕەحمان ڕووتە، حەمید ڕەشاش، حەمە ساڵح عەبدوڵڵا) تا ئێمە چووین ئەوان لەچایخانەکە دانیشتبوون چاوەڕوانمان بوون لەپاش چاك و خۆشی کردن مام جەلال بەڕێوەبەری ناحیەی دڵنیا کرد، کە ئێمە بۆ شەڕ نەهاتووین و فەرمانی شەڕمان نییەو شەڕتان لەگەڵ ناکەین، بەڵام مافی خۆمانە بەسەربەستی

لەوڵاتی خۆماندا بگەڕێین، ئەوانیش وتیان ئەگەر بەبن مەرکەزەکەماندا بڕۆن ئێمەش تەقەتان لێناکەین، ئەو زیارەتەی مام جەلال تەکتیکێك بوو، ئێمە گەڕاینەوەو بەردەوام بووین لەسەر گەشتەکەمان هێزەکەشمان ژمارەی لە(٢٠٠) کەس زیاتر بوو تا گەیشتینە گوندی کەناروێ ئەو گوندە دواقۆناغی گەشتەکەمان بوو شەو لەگوندی کەناروێ کات و ساتی جێبەجێکردنی پلانەکە دانرا بۆ گرتنی مەرکەزی ناحیەی باسنێ دوو پەل پێشمەرگە دانرا بەسەرکردایەتی (عەبدوڵڵا ئاغای پشدەری و حەمە سالح عەبدوڵڵا) ئەوان هەر هەمان شەو بەڕێکەوتن و گەڕانەوە بۆ گرتنی ناحیەی باسنێ ئێمەش ئەو هێزە مابوو لەگەڵ (مام جەلال) چووینە گوندی بێورێ لەگوندی بێورێ (مام جەلال) منی تاقیکردەوە بۆئەوەی بزانێ ئەو رەشاشە تا چەند کاریگەرە لەشەڕدا پێیوتم (سەڵییەك فیشەك بەرەشاشەکەت بەو بەردەی بەرامبەرمانەوە بنێ کەدیارە)، منیش سەڵییەك فیشەکم بەبەردەکەوە ناو بەردەکە بوو بەتۆزو (مام جەلال) دەستخۆشی لێکردم، هەر لەگوندی بێورێ دابەشکراین بەسەر ئەو جێگایانەی کەجێی مەبەست بوون بەمشێوەیە:-

١. کوێخا کەریم ماوەتی لەگەڵ دەستەیەك پێشمەرگە بۆ سەر مەخفەری گوندی گرگاشە.

٢. شەهید حەمید کاوانی و کاکۆل سەعید بەنگینەیی لەگەڵ دوو پەل پێشمەرگە بۆ گرتنی رێگای سلێمانی - چوارتا، نەوەك حکومەت هێز بنێرێ لەکاتی شەڕدا، کە لەنزیك گوندی تەگەران دامەزرابوون.

٣. حەمید رەشاش واتە بەندە لەگەڵ (٨) پێشمەرگە بۆ سەر مەرکەزی پۆلیس قەزای چوارتا جێگامان لەسەر بەردە قەل بوو ئەو جێگایە زۆر زاڵ بوو بەسەر مەرکەزەکەدا.

٤. مام جەلال خۆی لەگەڵ عەریف عەلی مەولود لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك لەناو شاری چوارتا بوو سەرپەرشتی بەرەکانی شەڕی دەکرد ئەو کاتە معاون (عەبدولوەهاب ئەتروشی) بەڕێوەبەری پۆلیسی چوارتا بوو، عەبدولوەهاب زوو خۆی گەیاندە ناو مەرکەزەکە.

٥. بۆگرتنی مەرکەزی گوندی مۆکەبەو گوندی گاپیلۆن مام جەلال داوای لەعەریف مەجید گوروون کرد فەرماندەی هەردوو مەخفەرەکە بوو ئەندامی حزب بوو، کە لەکاتی دیاریکراودا هەردوو مەخفەرەکە لەگەڵ خۆی بێنێ و بیبەنە ناو ڕیزەکانی پێشمەرگە، عەریف مەجید ئەوەی کردوو هاتە ناوریزی پێشمەرگەو هەردوو مەخفەرەکەشی هێنا.

### پێشمەرگەو سەرسامکردنی دوژمن

لەشەوی نەورۆزی ساڵی (١٩٦٢)دا ئاگری نەورۆزمان بەتەقەکردەوەو شەڕ دەستپێکرد لەهەموو لایەك بەرەبەیان فڕۆکە هاتە سەر بەرەکانی شەڕو بەبەردەوامی هێزەکانی پێشمەرگەی بۆردوومان دەکرد بۆ ڕزگارکردنی چوارتا، حکومەت هێزێکی پۆلیسی گەڕۆکی نارد لەگوندی تەگەران هێزی پێشمەرگە پێشی لەهێزەکانی حکومەت گرت و توانیان چەندجارێك هێزەکەی حکومەت بشکێنن و سەرکەوتنی باش بەدەستبهێنن، هەر لەو کاتەشدا دوو سەیارەی پۆلیس گیران کە پڕبوون لەچەك و فیشەك جگە لەکوژراوو بریندار حکومەت گەڕایەوە، بەڵام بۆ جاری دووەم بەهێزەکی گەورەترەوە بەپاڵپشتی تۆپ و فڕۆکە دووبارە گەڕایەوە لەگەڵ هێزی پێشمەرگە بەرەنگاری یەکتربوون تاپێش ڕۆژئاوابوون، بەڵام بەداخەوە حەمید کاوانی و کاکۆل سەعید بەگوللەی فڕۆکە شەهیدکران، لەپاش شەهیدکردنی ئەو دوو

سەرکردەیە هێزەکەمان تووشی شکست بوو، دوو پێشمەرگەمان بەبرینداری کەوتنە دەستی دوژمن بەناوی (حسێن حاجی وەستاو شێخە بنزرێری)و دوو پێشمەرگەی تریش بریندار بوون بەناوی (محەمەد رەسولّ و شێخ عوزێری شەدەڵە) لەبەر شەهیدبوونی ئەو دوو قارەمانە ناچار بووین پاشەکشە بکەین و مەرکەزی قەزای چوارتامان بۆ نەگیرا، بەڵام مەرکەزی ناحیەی باسنێ بەتەواوی گیراو مەخفەری گوندی گرگاشەو مەخفەری مۆکەبەو گاپیلۆنیش گیران و خۆیان هاتنە ناو شۆڕش، ئەگەر ئەو دووپێشمەرگەیەمان شەهید نەبوونایە مەرکەزی قۆزاش دەگیرا، ئەو شەڕە لەناکاوەو ئەو سەرکەوتنانە حکومەتی سەرسام کرد، چاوی حکومەتی شکاندو دانیشتوانی ناوچەکەش ورەیان بەرزبووەوەو باوەڕیان بەبوونی شۆڕش هێناو ناوچەی شاربازێڕیش بەتەواوی رزگارکراو حزب بنکەو بارەگای لەناوچەکە دەرکردو هێزی پێشمەرگەش لەزیادبوون و گەشەکردندابوو، لەپاشان هەموو دەستکەوتنەکانمان کۆکردەوەو هەموو هێزەکەمان چووینە گوندی ئاشی بارام و مام جەلال هەموو ئەو چەك و فیشەکانەی بەدوژمن گیرابوون لەجێگایەك کۆیکردەوەو خەڵکێکی زۆری گوندەکەش دەهاتن بۆ بینینی ئەو هەموو دەستکەوتە، مام جەلال چەکی بەسەر پێشمەرگە بێچەکەکاندا دابەشکردو پاشان بۆ حەسانەوەو خۆئامادەکردن بۆ گرتنی شوێنێکی تر هەموو هێزەکەمان چووینە گوندی دڕێ و لەو ماوەیەشدا پشوومانداو مام جەلال-یش رۆژی ژەمێك گۆشتی دەدا بەهێزەکە، بۆئەوەی بتوانین بەتێری شۆڕش بکەین.

## *پێشمەرگەی هەڤاڵ مام جەلال

گرتنی مەرکەزی قەزای پێنجوێن و هەموو ناحیەو مەخفەرەکانی لەساڵی ١٩٦٢دا لەپاش رزگارکردنی ناوچەی شارباژێر، هێزەکەمان بەتەواوی و بەسەر کردایەتی بەرێز مام جەلال گەڕایەوە گوندی (دڕی) بۆ پشوودان و جارێکی دیکە خۆئامادەکردن بۆ رزگارکردنی ناوچەیەکی تر، گوندی دڕی بەرامبەر ناحیەی ماوەتەو پاشئەوەی هێزەکەمان بەباشی رێکخستەوەو ئەوانەی چەکیان نەبوو چەکیان پێدراو فیشەکیان بەسەردا دابەشکراو ئەوانەشی پێلاوی باشیان نەبوو پێیاندرا، لەو ماوەیەدا ئەندامانی حزب زۆر بەگەرمی دەهاتنە ناو ریزەکانی پێشمەرگەوەو هێزەکەش بەتێری و بێئەوەی برسیبن لەپاش حەسانەوەیان و لەسەرەتای مانگی نیسانی ١٩٦٢دا سەر لەبەیانییەك بەهێزەکەمانەوە لەگوندی دڕی دەرچووین و بەرێکەوتین بەرەو ناوچەی پێنجوێن، هەر کە لەگوندەکە دەرچووین دوو فڕۆکەی جۆری مێك گەیشتنە سەرمان و راستەوخۆ دەستیان بەبۆردومانکردنی هێزەکەمان کرد، لەوکاتەشدا مام جەلال هاتنی ئەم فڕۆکانەی لەم کاتە ناسکەدا بەکردەوەی (......) داناو وتی: (.....) حکومەتی ئاگادار کردووەتەوەو لەرێگەی بێتەلەوە جێگای ئێمەی دەستنیشانکردووە، بەلام خۆش بەختانە هیچ پێشمەرگەیەك لەو بۆردوومانەدا بریندار نەبوو، لەوکاتەدا ماوەت نەگیرابوو معاون جەلالی حاجی عەلی خۆی بەئەندامی حزب دەزانی دەیووت: (هەرکاتێك حزب بلێت خۆم و پۆلیسەکان دێینەوە ناو رێزی پێشمەرگە)، بەلام ئێمە هاتنی ئەو فڕۆکانەمان بەکاری (....) دەزانی و ئەوەش بوو لەپاش دەستگیرکردنی (....) دانی بەتاوانەکەیدا ناو وتی: (ئەوەی حکومەتی ئاگادار کردەوە من بووم کاتێك ئێوە لەگوندی دڕی دەرچوون)، لەدوای ئەو

بۆردومانکردنە بەڕێکەوتین و بڕیارماندا لەترسی فڕۆکەکان هەر بەشەمان بەجیا بڕۆین و لەو سەفەرەشماندا هەندێك لەسەرۆك هۆزەکان لەگەڵماندابوون و هاوکارمان بوون ئەوانیش: (شێخ تەیفوری گوندی تۆبزاوە باوکی عارف تەیفور، حاجی حەمەد ئەمین ڕەشکەی گوندی سابور ئاوا، شێخ مەحمودی گوندی کارێزە کەپیاوێکی خاوەن کەسایەتی بوو، شێخ ڕەووف گوندی هەنجیرەو کەریم ئاغای موغاغ) بوون، کە بەسواری وڵاغ لەگەڵماندا بوون تا ناڵپارێزو دواتر گەڕانەوە.

## وتەکانی مام جەلال

ئێمە بەرەو بناری سورکێو، گوندەکانی شێوەکەڵ، باریێ–ی گەورە، گوندی باریێ–ی بچووك، گوندی سێرین و گوندی تۆڕك چووین هەموو ئەو گوندانەش لەسنووری ئێرانەوە نزیکبوون و لەهەموو ئەو گوندانەشدا پێشمەرگەکان دابەشدەکران بەسەر ماڵەکانداو مام جەلال و سەرپەلەکان دەچوونە مزگەوتی گوندەکانەوەو لەپاش نوێژی عیشا خەڵکی گوندەکان لەمزگەوت کۆدەبوونەوەو مام جەلال قسەی بۆ دەکردن و خەڵکەکەی هاندەدا پشتگیری شۆڕشەکەی خۆیان بکەن، لەو ڕۆژەدا بۆنانی نیوەڕۆ لەماڵی عەبدولڕەحمان ئاغای تۆڕك ماینەوەو نامەیەکی شێخ لەتیفی شێخ مەحمودی نەمر، بۆ مام جەلال هات و بەنامەکەدا وا دیاربوو شێخ لەتیف زۆر پێی ناخۆشبوو کە هێزی پێشمەرگە هاتبووە ئەو ناوچەیەو بەشێوەیەك نامەکەی نووسی بوو کە ئێمە چۆن ڕێگەمان بەخۆمان داوە بەچەکەوە لەناوچەی شێخی گەورەدا بسووڕێینەوە، (مام جەلال)یش لەوەڵامی نامەکەی شێخ لەتیف–دا نووسیی (جەنابی شێخ لەتیف ئێمە چاوەڕوانی ئەوە بووین

بەڕێزت لەجێگای شێخی گەورەی باوكتان سەركردەمان بیت و درێژە بەشۆڕشەكەی باوكت بدەیت، ئێمە هاتووین سەنگەرەكانی شێخی نەمر ئاوەدان بكەینەوە)، بەهەرحاڵ ئێمە بەردەوام بووین لەگەشتەكەمان و چووینە دۆڵی ناڵپارێزو لەو گەشتەماندا سەردانی بەشی زۆری گوندەكانی دەووروبەری قەزای پێنجوێنمان كردو سەردانی شێخەكانی نزارەو شێخ عەبدول قادری چوێسە و مینەی ئەحەرەندان و حەمە سدیق خانی گوندی میشاو و حەمە رەشید خانمان كردو هەموو گوندەكان و سەرۆك هۆزەكان ئامادەبوون لەهەركاتێكی پێویستدا هاوكارمان بن، بەڵام مەحمود بەگی گۆڵی هاوكاری نەكردین، ئەو كاتە مامۆستا قانعی شاعیر لەگوندی حەمەد ئەمین خان مامۆستای قوتابخانە بوو هاتە لای مام جەلال، كە ئەو كاتە لەگوندی دارۆخان بووین خەبەرمان بۆ هات خوالێخۆشبوو مەحمود كاوانی لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك هاتوونەتە ناوچەكە ئێمە زۆر دڵ خۆشبووین بەهاتنی و وامانزانی وەكو دڵسۆزێك هاتووە یارمەتیمان بدات، بەڵام بەپێچەوانەوە هاتبوو هێزەكەمان كەم بكاتەوەو پەیوەندی بەكاوانییەكانەوە كردو پێیوتن: (ئێوە بۆ كێ خۆتان بەكوشت دەدەن، باشتروایە بگەڕێنەوە وڵاتی خۆمان)، ئەو قسانەی وایكرد كە بەشێك لەكاوانییەكان لێمان جیابوونەوەو چوونەوە لای مەحمود كاوانی كە هەر لەسەرەتای شۆڕشەوە ئاگری دووبەرەكی خۆشدەكرد، كە ئەو راستییەش كاوانییەكان بەباشی دەیانزانی، ئەوەش كارێكی ناخۆشبوو لەلامان كە مەحمود كاوانی بەرامبەرمان كردی، بەڵام ئێمە بەردەوام بووین لەسەر بەرنامەی خۆمان تا ئەو كاتەی حكومەت لەترسان بەخۆی و هەموو مەخفەرەكانییەوە چۆڵیان كردو بەبێ تەقەكردن هەموو پۆلیسەكانی كێشانەوە ناو سەرای قەزای پێنجوێن و تەنیا مەخفەری گوندی

قزڵجە مابوو کە لەشوێنێکی چەپەکدا بوو نەدەتوانرا لەڕێگەی شەڕکردنەوە دەستی بەسەردا بگیرێت، بۆیە بڕیارماندا ڕێگەی نان و ئاویان لێبگرین تا بتوانین دەستی بەسەردا بگرین، بەڵام معاون کەمال کە لەناو سەرای پێنجوێندا بوو نامەیەکی بۆمام جەلال ناردو داوای لێکرد ڕێگا بەپۆلیسەکانی ناو مەخفەری قزلجە بدەن بگەڕێنەوە ناو سەرای پێنجوێن. ئەوەبوو لەسەر فەرمانی مام جەلال پۆلیسەکان لەبەرچاوی ئێمە گەڕانەوە ناو سەرای پێنجوێن، وادیاربوو معاون کەمال بەشێوەی نهێنی پەیوەندی لەگەڵ مام جەلال-دا هەبوو ئێمەش گەشتەکەمان تەواو بوو کاتی ئەوەهات پلانەکە جێبەجێ بکەین. پاش ئەوەی حکومەت مەخفەرەکانی چۆڵ کرد مام جەلال بڕیاریدا هەموو مەخفەرە چۆڵەکان بسووتێنن کە ژمارەیان ١٣ مەخفەربوو، لەبەرئەوەی نەوەك جارەکی تر حکومەت بگەڕێتەوەو ئاوادانیان بکاتەوەو پۆلیسیان بۆبنێرێتەوە، بۆیە لەسەر فەرمانی مام جەلال پەلەك پێشمەرگە بەسەرکردایەتی عەبدوڵڵا ئاغا پشدەری و بەندە سەرجەم مەخفەرەکانمان سووتاند، بەڵام بەداخەوە لەکاتی سووتاندنی مەخفەری گوندی هەرمێدا پێشمەرگەیەکمان بەناوی قالە فوجەوە ئاگر ڕێگای نەدا بێتەدەرێ و ئێمەش نەمان توانی رزگاری بکەین و گیانی لەدەستدا، لەماوەی ئەو گەشتانەشدا مام جەلال هەر بەپێ لەگەڵماندا دەڕۆیشت و جل و بەرگەکانیشی لەهی پێشمەرگەکان باشتر نەبوو، دەستەو پاسەوانی تایبەتیشی نەبوو، باشترین سەرکردەبوو لەهەموو روویەکەوە.

## گرتنەکەی سەرای پێنجوێن

دوا قۆناغمان ڕۆیشتنبوو بەرەو گوندی بوبان، کەچووینە ئەوێ حەمەی شێخ عەبدولکەریم لەگوندەکە بوو دەستەیەك پێشمەرگەی لەگەڵ بوو، لەناو گوندەکەدا مام جەلال هێزەکەی کرد بەسێ بەشەوە بەشی هەرە زۆری هێزەکەی بۆرێگای سلێمانی پێنجوێن دانا، ئەو هێزەی لەناڵپارێز بوو بەسەرکردایەتی عەبدوڵڵا ئاغای پشدەری و بەیارمەتی هەر یەك لە:- عەریف عەلی مەولود، مەلا رەسولێ گورونی کە پیاوێکی ئازاو دڵ سۆزو خوێندەواربوو جێگری سەرۆکی یەکێتیی جوتیارانی گشتی بوو، لەگەڵ جەلال کاوانی بوون، ئەو ماوەیەی هێزەکەمان لەناڵپارێز بوو (....) هەموو شوێنی سەنگەرەکانی لەشکرەکەی ئێمەی دەستنیشان کردبوو، لەشکرەکەشمان نیوەی زیاتری هێزی عەشیرەتەکانی دەوروبەری پێنجوێن بوون بۆ ناو شاری پێنجوێن ١٧ پێشمەرگە داندران منیش لەگەڵ ئەو ١٧ پێشمەرگەیەدا بووم، مام جەلال لەبنکەی گوندی بناوەسووتە کە لەسەر سنووری ئێران بوو، سدیقە فەندی و ١٠ پێشمەرگەی دانا بۆ دابینکردنی نان و ئاو و فیشەك بۆ بەرەکانی شەڕ، لەسەرەتای مانگی ٥ ی ١٩٦٢دا مام جەلال و من و ئەو پێشمەرگانەی بۆ ناو شاری پێنجوێن تەرخانکرابووین لەگەڵ نوێژی عیشادا چووینە ناو شاری پێنجوێن و مام جەلال پێی وتم: (بەرەشاشەکەت ٣٠ فیشەك بەیەك سەلییە بەسەر شاردا بتەقێنە)، منیش لوولەی رەشاشەکەم بڵند کردوو ٣٠ فیشەکم تەقاند ئەوەش نیشانەی ئەوە بوو کە ئەندامانی حزب بزانن هێزی پیشمەرگە هاتۆتە ناو شارەوە، هەروەها بۆ ئاگادار کردنەوەی معاون کمالیش بوو کەوا هێزی پێشمەرگە لەناو شاردان، ئەوەبوو مام جەلال فەرمانی دەستگیرکردنی مدیر ناحیە و بەرێوەبەری دارایی دەرکرد، دوای ئەوەی چوومە ناوماڵەکەی

مدیر ناحیەو دەستگیرم کردو هەر لەوکاتەشدا بەڕێوەبەری دارایش دەستگیرکرابوو هەردووکیانمان بردە لای مام جەلال و دواتر گواسترانەوە بۆ بنکەی بناوەسووتەو مام جەلالیش گەڕایەوە بۆ جێگای خۆی و ئێمەش سەرای پێنجوێنمان گرت کە ئەو پێشمەرگانەی لەناو شاری پێنجوێندا بوون هەریەك لە: عەریف عەلی ژمارە دوو کە خەڵکی گوندی سەر گەڵوو بوو عەسکەری فیرار بوو، حەمید رەشاش ـ هەولێری (عەسکەری فیرار)، ئەنوەر مستەفا ناسراو بە ئەنوەر نیتم ـ هەولێری (پۆلیسی فیرار)، قادر حەمەد ـ هەولێری (پۆلیسی فیرار)، عەلی مام رەشید ـ کۆیی، خالید مام رەشید ـ کۆیی، عەبدولخالق نەریمان—کەرکوکی (عەسکەری فیرار)، عادل عیزەت ناسراو بە عادل کەوڵ سوور ـ کەرکوکی بوون، کە ١٧ پێشمەرگەبووین و بەداخەوە ئێستا ناوی هەندێکیانم لەبیر نەماوە، لەو شەڕەدا پێش ئەوەی تەقە لەپۆلیسەکان بکەین بەناوی شۆڕشی کوردایەتییەوە داوامان لە معاون کەمال و پۆلیسەکان کرد و پێمان وتن کە شەڕنەکەین و هەموومان کوردین و پێویستە پێکەوە بەشداری شۆڕش بکەین، بەڵام ئەوان بەتەقە وەڵامیان دایەوە کە ژمارەی پۆلیسەکانی ناو سەرا ٣٦٦ پۆلیس بوون و لەگەڵ معاون کەمالدا لەگەڵ دەستپێکردنی تەقە شارەکە بەتاواوی هەمووی چۆڵکراو لەترسی بۆمبارانی فڕۆکە جەنگییەکان چوونە سەر سنووری ئێران، بەبەردەوامی فڕۆکە لەسەر شارەکە بوو، ئێمەش لەکاتی بۆردومانەکەدا زۆر لەسەرای پۆلیسەکان نزیك بووبووینەوەو ژمارەمان کەم بوو، بەڵام پۆلیسەکان نەیاندەزانی لەبەرئەوەی شەوانە لەسێ لاوە بەرەشاشەکەم تەقەم لەپۆلیسەکاندەکردو وایاندەزانی سێ رەشاشمان هەیە، ئەوەبوو نانمان لەبنکەی بناوەسووتەوە بۆ دەهات و هاوەنێکی دووگرێشمان هەبوو

کە لەلای بەندە بوو، هەندێك قومبەلەم دەگرتە سەرا، کە ئەوکاتەش معاون کەمال لەناوسەرادابوو، ڕاستە کە پەیوەندی هەبوو لەگەڵ (مام جەلال)دا، بەڵام حەزیشی نەدەکرد پێنجوێن بگیرێ، بۆیە شەڕەکە ئەوەندە درێژەی کێشاو پۆلیسەکان ورەیان بەرداو خواردن کەمبۆوە، ڕۆژی جارێکیش پێشمەرگەکان نامەیەکمان لەبەرد دەپێچاو دەمان هاوێشتە سەربانی سەراو داوامان لێدەکردن خۆیان بەدەستەوەبدەن، بەڵام ڕازی نەدەبوون، ئەوەبوو پۆلیسەکان برسێتی کاری تێکردن و داوایان لەحکومەت کرد بەفڕۆکە ئازوقەیان بۆ فڕێدەنە ناو سەراوە.

## دەستکەوت و شکستەکان

ڕۆژێك لەگەڵ ڕۆژهەڵاتندا فڕۆکەیەکی گەورەی بارهەڵگر دەرکەوت و دوو فڕۆکەی مێکی لەگەڵدا بوو، فڕۆکە گەورەکە خۆی نەوی کرد لەسەر سەرای ئێمە زۆر بەتوندی دەستڕێژمان کردن و نەیان توانی بنێرن بۆیان و لەپاش گەڕانەوەی فڕۆکەکە پۆلیسەکان زیاتر ورەیانبەرداو دووبارە داوامان لەپۆلیسەکان کردەوە کە ئێمە هەموومان عەسکەرو پۆلیسی فیرارین و براتانین و خۆتان بەدەستەوەبدەن، ئەوانیش دەیانووت ئێمە باوەڕتان پێناکەین و دەمانکوژن. ئەوشەڕە ١٢ ڕۆژ درێژەی کێشاو حکومەتیش بۆ ڕزگارکردنی پۆلیسەکانی هێزێکی نارد، بەڵام لەناڵپارێز لەگەڵ هێزەکانی پێشمەرگەدا ڕووبەڕووی شەڕێکی دژواربوونەوەو پێشمەرگەکان توانیان چەندین هێرشی دوژمن بشکێنن، بەڵام (....) چاوساغی بۆ هێزەکە دەکردو شارەزای ناوچەکەبوو، ئەوەبوو وایکرد کە لەجیاتی قایە سوپاکەی سەرخست و سەنگەرەکانی پێشمەرگەی پیشانی عەسکەرەکان دەدا ئەمەش

وایکرد هێزی پێشمەرگە بشکێت، کە هۆی شکاندنی هێزەکەشمان ئەمانە بوون:

١. چاوساغی (....) بۆ سوپاکە.

٢. بەشێکی زۆری هێزەکەمان خەڵکی گوندەکان بوون و بەتورە هاوکاریی پێشمەرگەکان بوون، بەڵام وەکو پێشمەرگە بەبیرو باوەڕ نەبوون زوو لەشەڕ دەشکان.

٣. رووبەری جێگای شەڕ کە زۆر گەورە بوو بەو هێزەی کە هەبوو کۆنترۆڵ نەدەکرا.

٤. چوار پێشمەرگەی قارەمانمان شەهیدکران، لەبەرئەوەی لەکاتی کشانەوەماندا ئاگادار نەکرابوونەوەو یەکێکیش لەو شەهیدانە مەلا رەسوڵی قارەمان بوو، تەرمەکانیشیان هەر بە ئامانەتەوە لەناو سەنگەرەکانی خۆیاندا بەخاك سپێردران.

سەرای پێنجوێن زۆر گەورەو کۆن بوو پۆلیسی شارەکەو پۆلیسی یەك ناحیەو پۆلیسی ١٢ مەخفەری تێدا کۆبووبۆوە، پێشی ئەوەی پۆلیسەکان خۆیان بەدەستەوە بدەن دایکی معاون کەمال هات و سەردانی کوڕەکەی کرد، کە دایکی خوشکی سەعید قەزاز بوو، بەڵام معاون کەمال نەیوێرا دەرگای سەرا لەدایکی بکاتەوەو پۆلیسەکان هەوڵیاندا بەگوریسێك هەڵیبکێشنە سەرەوە، بەڵام ئێمە نامەیەکمان نارد بۆ معاون کەمال کە دەرگا لەدایکی بکاتەوەو دڵنیابێت لەوەی کە تەقە لەهیچ کەسێك ناکەین، دەستبەجێ گوریسەکەیان شۆڕکردەوەو نەیانوێرا دەرگا بکەنەوە، لەپاش گەڕانەوەی دایکی معاون کەمال بڕیاریدا خۆی و پۆلیسەکان خۆیان بەدەستەوە بدەن، هەر ئەو رۆژەش بوو هێزەکەمان لەناڵپاریز شکاو ئێوارەی

هەمان رۆژیش پۆلیسەکان داوایانکرد حەمە رەشید خان کەفالەتیان بکات و ئەوانیش خۆیان بەدەستەوە دەدەن، ئەوەبوو حەمە رەشید خان و سدیقە فەندی چوونە بەردەرگای سەراو پۆلیسەکان دەرگای سەرایان کردەوەو هەموویان هاتنەدەرەوەو ئێمەش رەوانەی بنکەی بناوەسووتەمان کردن، لەوکاتەدا ئێمە ژمارەمان ئەوەندە کەم بوو دەترساین پۆلیسەکان رووبەروومان ببنەوە، لەپاش بەرێکردنی پۆلیسەکان چووینە ناو سەرای پۆلیسەکان بۆ رزگارکردنی دەسکەوتەکان، ئەوەی زۆر مەبەستمان بوو ئامێرێکی لاسلکی زۆر گەورەی بوو کە دەیانووت دەبێتە ئێزگە، دەستکەوتەکانیش ئەمانە بوون:-

١. (١١) هەزار دیناری ئەوکاتە کە قاسەکەمان شکاندو پارەکەمان هەڵگرت.

٢. (١٢) ئامێری لاسلکی جۆراو جۆر.

٣. (٥) سندوق فیشەکی ئینگلیزی.

## رۆڵی سەرەکی پێشمەرگە

ئێمە توانیمان تابەیانی ئەو شتانە لەشار دوور بخەینەوە لەبەرئەوەی دەمانزانی هێزەکەمان لەناڵپارێز شکاوەو پاشەکشەی کردووە، لەگەڵ رۆژهەڵاتن هێشتا ئێمە لەنێزیك شاربووین پێشەنگی دەبابەکان گەیشتنە ناو شاری پێنجوێن، بەڵام شار کەسی تێدا نەبوو بەفرۆکەو بە دەبابە دەوروبەری شاریان بۆردومان دەکرد و لەو رۆژەشدا سوپاکە گەیشتە ناو پێنجوێن کە ٤٠ تا ٥٠ پۆلیس خۆیان درێیەوەو گەڕانەوە ناو سوپاکەو بەردەوام تاك تاك خۆیان ون دەکردو دەگەڕانەوە بەپەلە توانیمان ٣٨ پارچە چەك

لەپۆلیسەکان وەربگرین و ئەوانی تر هەموویان گەڕانەوە ناو حکومەت تەنیا معاون کەمال شێخ غەریب بووە پێشمەرگە لەگەڵ یەك پۆلیس ئەویش بووە پیاوی حەمە رەشید خان، پۆلیسی سلێمانی کەسیان هەستی کوردایەتیان نەبوو ئەوکاتەو لەپاش تەواوبوونی شەڕەکان هەموو هێزەکەمان لەگوندی بناوە سووتە یەکترمان گرتەوە بەرەو چەمی رێزان گەڕاینەوە ئەو سەرکەوتنانەی یەك لەدوای یەك واتە ئازاد کردنی ناوچەی شاربازێڕ و ئازادکردن و پاك کردنەوەی ناوچەی پێنجوێن شۆڕشی زیندوو کردەوەو حکومەتی سەرسام کرد، ناوچەی سلێمانی باوەڕیان بەشۆڕش نەمابوو، بەڵام بەهۆی ئازاد کردنی ناوچەکان میللەت باوەڕی بەشۆڕش هێنایەوەو حزبیش بنکەو بارەگای پێشمەرگەی لەناوچە ئازادکراوەکان داناو ئەوچالاکیانە هەمووی بەسەرکردایەتی مام جەلال بوو بەڕاستی مام جەلال سەرکردەکی بەتواناو زانابوو زۆر خزمەتی پێشمەرگەی دەکرد زۆرجار چێشتی بۆمان لێدەناو دابەشی دەکرد بەسەرماندا هەرچەندە مام جەلال سەرکردەیەکی زۆر سەرکەوتوو بوو پێشمەرگەکانی هەولێریش لەهەموو شەڕەکاندا رۆڵی سەرەکیان هەبوو، هەرچەندە هەندێك کەس لەنووسینەکانیاندا شۆڕشی ئەیلول بەشۆڕش دانانێن و وادیارە ئەوکەسانە شارەزای شۆڕشی ئەیلول نین یان چاویان بەشۆڕشی ئەیلول هەڵنایەت لەبەرئەوەی لەکاتی شۆڕشی ئەیلولدا کەس دەوڵەمەند نەبوو نەپێشمەرگەکان و نە سەرکردەکانیش، بەهەر حاڵ ئێمە وتمان هێزەکەمان گەڕاینەوە چەمی رێزان، دەربارەی ئەو ١١ هەزار دینارەی لەپێنجوێن گیرابوو ئەو پارەیەی کە لەناوجەمەدانی بوو هەر رۆژەی لەلای پێشمەرگەیەك بوو لەچەمی رێزان پارەکەمان ژماردو فلسێکی کەم نەبوو، بەڵام بەشێك لەپارەکە زۆر کۆن و دڕاوبوو پارە

دراوەکانمان لەگەڵ مام جەلال–دا بردە لای شێخ جەنگی برای مام جەلال ئەوکاتە شێخ جەنگی ماڵی لەگوندی (قزلۆ) بوو شێخ جەنگی پارە دراوەکانی بردە بەغدا هەمووی بەپارەی باش گۆڕیەوەو هێنایەوە بۆمان و ئێمەش ماوەیەك لەچەم پشووماندا ئەو چالاکی و سەرکەوتنانەی ناوچەی شارباژێڕو ناوچەی پێنجوێن بووە هۆی زیندووبوونەوەی شۆڕش لەناوچەکانی ترو کەسانێکی زۆر هاتنە ناو شۆڕش بەشی زۆری پۆلیسی مەخفەرەکان لەحکومەت هەڵگەڕانەوەو خۆیان و چەکەکانیان هاتنە ناو شۆڕشەوە، هەروەها عەسکەری کورد کۆمەڵ کۆمەڵ دەهاتنە ناو شۆڕش، حکومەت ورەی بەرداو شۆڕش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەگەشەکردندا بوو ئەو سەرۆك عەشیرەتانەی نیازیان وابوو چەکی جاشایەتی هەڵبگرن بەشێکیان پەشیمان بوونەوەو شۆڕش دەنگی دایەوەو حکومەت چاوی شکاو وایدەزانی هەر لەڕۆژی ١١ ی ٩ ی ١٩٦١ کە لەشکری عەشائیری بەفرۆکە راونا شۆڕشیش لەناوچوو لەو باوەڕشدا نەمابوو کە کورد توانای شۆڕشکردنی مابێت و پێشمەرگە قارەمانەکان بەسەرکردایەتی پێشمەرگەی دێرین و سەرۆك کۆماری ئێستای عیراق شۆڕش زیندوو بکەنەوە.

## راستە (مامی گەورەمان) لەماڵ نییە،
## بەڵام رێنمایی و ئامۆژگارییەکانی هەردەم لەناو دڵی هەموانە

ئەگەر کورد ئامۆژگارییەکان و رێنماییەکانی بەرێز (مام جەلال) پێرەو بکەن و لەسەری برۆن وەکو رۆژانە لەسەر لاپەرەکانی رۆژنامەی (کوردستانی نویێ) بڵاو دەکرێتەوە تێدەگەین (مام جەلال) بناغەیەکی ئەوەندە پتەوی دامەزراندیە بەئاسانی لەق نابێ (مام جەلال) لەمێژە بیر لەدانانی ئەو بناغەیە دەکاتەوە، من بۆ بیرەوەری بیرکردنەوەو ئەو بناغەیە کورتە باسێك دەگێرمەوە لەساڵی (١٩٦٢) بوو لەسەرەتای شۆرشی ئەیلول بوو ئەو کاتە من و (مام جەلال) هەردووکمان گەنج بووین ژمارەی پێشمەرگەمان کەم بوو سەرکردەکەمان بەرێز (مام جەلال) بوو. بەڵام (مام جەلال) هەمیشە کەسێکی قسە خۆش و قسەزان و ورە بەرز بوو وای دەزانی بەوەندە پێشمەرگانە کوردستان رزگار دەکات، هەر بەو بیروباوەرەش بوو بەو هێزە بچووکە توانی ناوچەیەکی گەورە رزگار بکات، من ئەو کاتە باس دەکەم کەسمان خاوەنی فلوسێك نەبووین ژیانمان لەسەر گوندەکان بوو، ئێوارەیەك چووینە گوندی (شیوەکەڵ) لەپاش دابەشکردنی پێشمەرگەکان لەسەر ماڵەکانی گوندەکە ئێمە سەرپەلەکان لەگەڵ بەرێز (مام جەلال) چووینە مزگەوتی گوندەکە. لەپاش نوێژی خەوتنان مزگەوت چۆڵ بوو هەموو خەڵکەکە چوونەوە ماڵێ، ئێمەش ئاگرەکی خۆشمان کردەوەو لەبەر ئاگرەکە دەورەمان لەمام جەلال داو هەمووومان جلەکانی خۆمان داوەشاند لەبەر ئەوەی ئەسپێ زۆر بوو جل و

بەرگی مام جەلال–یشمان داوەشاند بەڕاستی ئەو زیاتر ئەسپێ لەجلەکانی دابوو لەپاشان مام جەلال قسەی خۆشی بۆمان دەکرد لەناو قسە خۆشەکانی ناوە ناوە ئامۆژگاری و ڕێنماییشی دەکردین. من قەت ئەو ئامۆژگارییەی مام جەلال لەبیرناکەم فەرموودەکانی ئەوە بوو دەیگوت ئێمەی پێشمەرگەو ئەندامانی حزب یان ئەوانە خەبات دەکەن لەپێناو ڕزگارکردنی کوردستان دەبێ خۆیان بەخزمەت کاری میللەت بزانن لەبەر ئەوەی میللەت سەرچاوەی هێزو توانایە، بۆیە دەبێ هەریەك لەئێمە بەو بیروباوەڕە کار بکەین و دەبێ هەموو پێشمەرگەیەك یان ئەندامەکی حزب بۆ بەرژەوەندیی گشتی میللەت لەڕیزەکانی پێشەوە بێت، بەڵام بۆ بەرژەوەندیی خۆی دەبێ لەڕیزەکانی هەرە دواوە بێ ئەگەر وا کار بکەین ئەوە دەبینە خۆشەویستی میللەتی خۆمان و دەتوانین وڵات ڕزگار بکەین. ئەوە بیرو باوەڕی سەرۆك (مام جەلال) بوو، ئێمەی پیرە مێردەکان تا ئێستاش لەسەر ئەو بیرو باوەڕە هەر ماوین. براینە با هەموومان ڕێنمایی و ئامۆژگارییەکانی ئەو مامە خۆشەویستەمان بکەینە ئەڵقەو لەگوێی خۆمانی بکەین و ناخۆشی لەکوردستان نامێنێت.

ئێستاش وا هەڵمەتی هەڵبژاردن لەکوردستان دەستپێکردووە ڕۆژ ڕۆژی جەماوەرە دڵسۆزەکەی یەکێتییەو گەلی کوردو سەرۆك مام جەلال چاوەڕوانی کاری مەردانەی ئێوەیە پەندەکی کوردەواری دەڵێ (شێر لەلانێ بێتە دەر چ نێر چ مێ هەر شێرە). دەبا هەموومان شێرانە قۆڵ و باسکی خۆمان هەڵماڵین و هەوڵبدەین لیستی (١٠٢) سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست بێنێ و بیکەینە دیاری بۆ سەرۆکە خۆشەویستەکەمانی بنێرین.

من وا هەست دەکەم جەماوەری یەکێتی کارێکی سەر سوڕهێنەر دەکات وا ئێمەی پیرە مێردەکان لەجۆش و خرۆشداین ئەدی دەبێ شێرە کوڕان و

شێرە کچان لەچ گەرمە گەرمی هەڵمەت دابن. جەماوەری یەکێتی جەماوەری ڕۆژی تەنگانەیە مادام خاوەنی ئەو سەرۆکە دڵ سۆزەن.

لەکۆتاییدا پڕ بەدەنگ بانگ دەکەم هۆ هۆ مامە زوو وەرەوە. بەهیوای سەرکەوتنم.

## سەرۆك مام جەلال:
## کاکە شەمسەدین موفتی لەهەموو بوارەکاندا سەرکردە بوو

دەقی وتاری سەرۆك مام جەلال کەڕۆژی ۲۰۱۲/۱۰/۱۳، لەهەولێر لەڕێوڕەسمی چلەی ماتەمینی پێشمەرگەو تێکۆشەری دێرینی کوردایەتی خوالێخۆشبوو شەمسەدین موفتی-دا پێشکەشیکرد:

**بەناوی خوای گەورەو میهرەبان**

بەڕێزان ئامادەبووانی ئەم کۆبوونەوەیە کە بۆ یادکردنەوەی رۆڵەیەکی ژیرو تێکۆشەرو خۆنەویست دەیگێڕین، کاك شەمسەدین موفتی ئەوە دەهێنێ زۆر لەلایەنەکانی ژیانی روون بکرێتەوەو بکرێت بەدەرس و پەند بۆ رۆڵە تیکۆشەرەکانی خەڵکی کوردستان، من یەکێکم لەو کەسانەی کە شەرەف هاوڕێیەتی و دۆستایەتی کاك شەمسەدینم هەبووە بۆ ماوەی ٦٢ ساڵ، ئەوەڵ ساڵی کە هاتمە هەولێر بۆ خوێندنی ناوەندی ساڵی ۱۹۵۰-۱۹۵۱، ژمارەیەکی زۆر کەم خەڵك کوردایەتیان دەکرد یان شیوعیەتیان دەکردو ژمارەیەکیش لەقوتابییەکانی سانەوی هەولێر بەشێکی زۆر کەمیان دەمیان لەسیاسەت وەردەدا، من بەشبەحاڵی خۆم پێمخۆش بوو هەولێرییەك بناسم کە لەسیاسەت بەشداری دەکات و قسە دەکات، ئەوەی کە لەپۆلەکەم لەگەڵی بووم برادەرێکی هەولێری بوو کە ناوی کاك مارف بوو خاڵی کاك شەمسەدین بوو، پاشان کاك مارف کاك شەمسەدینی پێناساندم، کاك شەمسەدین

بەڕاستی گەنجێکی بەحەماس و بەگوڕو بەتەوژم بوو، حزبی نەبوو بەلای حزبایەتیشدا نەدەچوو، بەڵام بەلای کوردایەتی و خەبات دژی حکومەت و ئەوانەدا دەچوو، لایەنگرێکی گەرمی ئەو خەباتە بوو.

### ڕۆڵی خوالێخۆشبوو شەمسەدین موفتی

ئەوکاتە تازە سەرەتای گەشەکردنی چالاکییەکانی پارتی بوو لەهەولێر، کاک شەمسەدین وەکو دۆستێکی پارتی زۆر کاری بۆ دەکردین، خەڵکی بۆ دەهێناین و ئەندامی بۆ پەیدا دەکردین، بەڵام خۆی نەببوو بەئەندام، ئەو لایەنگرێکی زۆر بەهێزو بەتوانا بوو کە لەو مووچەیەی کە پێشی دەدرا بڕێکی تەرخان کردبوو بۆ یارمەتی و دەیدا بەپارتی، دیارە ئەوکاتەش کاک شەمسەدین پیاوێکی موسڵمانی ڕاستەقینە بوو نوێژی دەکردو ڕۆژووی دەگرت و دەچووە مزگەوت و نوێژەکانی هەینی لەدەست نەدەدا، لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەی کە عەلمانی بوون دۆست و تەبا بوو لەگەڵیان، هیچ ئەوەی نەکردبووە هۆکارێك بۆ ئەوەی بۆشاییەك بخاتە نێوان خۆی و ئەوانەوە.

لەوساڵەوە کە ناسیم وردە وردە دۆستایەتییەکەمان پەرەی سەند، دواتر من لەناوەندیی هەولێر نیمچە دەرکراین، ڕۆژێکیان خوالێخۆشبوو بەڕێوەبەرکەمان ناردی بەدوای من و کاك مارفداو وتی: ئێوە هاتوون مەکتەبەکەم لێ تێکدەدەن، من بەحساب خەڵکی کۆیە بووم تەلەفۆنی لەگەڵ باوکم کردو وتی کوڕت ناردووە لێرە هەرام بۆ دروست بکات، کاك مارف توڕە بوو وتی لۆ ماڵی بابتە، مەکتەب ماڵی حکومەتە تۆ هەقت چییە بەسەر ئەوەوە، من نەموێرا وا قسە بکەم وەکو ئەو کە بەئازایانە قسەی کرد،

خولاصه من گواستمەوە بۆ كەركوك و شەمسەدین چوو بۆ بەغدا لە ناوەندی مەركەزی بوو، بەڵام پەیوەندیمان هەر هەبوو كە بەكەركوكدا تێدەپەڕی سەری لێدەدام منیش ئەگەر رێم كەوتبا بەغدا دەچوومە لای، چالاكییەكانی لەناو قوتابیان پەرەی سەند وەكو مرۆڤێكی زۆر خۆشەویست بوو هەم رەوشتی زۆر بەرزبوو، هەم خۆنەویست بوو، هەم قسە خۆش بوو، هەم بەردەوام لایەنگری كەسانی هەژارو بێدەرامەت بوو لەبەر ئەوە كە یەكێتیی قوتابیانی كوردستان دامەزرا شەمسەدین هەڵبژێردرا بەسەرۆكی یەكێتییەكەو من سكرتێری یەكێتیی قوتابیان بووم، بەڵام ئەو سەرۆكی بوو، بەڕاستی لەو ماوەیەی كە ئەو سەرۆكی بوو یەكێتیی قوتابیان چالاكیی زۆر زیادی كردو لەزۆر شوێندا بەتایبەتی لەهەولێر لقی بۆ دروست بوو لایەنگری بۆ پەیدابوو رێكخستنی پەیدابوو لەبەغداش هەروەتر، ئەو خۆی ماڵێكی بەكرێ گرتبوو ئەو ماڵەی وەكری تێكۆشەرانیش بوو، من دەمەوێت سێ رووداو كە زۆر دیارەو كەس نەیزانیووە بۆتانی باس بكەم یەكێكیان شەهید دكتۆر عەبدولڕەحمان قاسملو لەئێرانەوە بەخۆی و بەمادامیەوە هاتبوو، مادامی شەهید قاسملو كچێك بوو رەنگی، پرچی، هەمووی بێگانەیە، دوو كچی هەبوو ئەوانیشی لەگەڵ بوون، نامەوێ ناوی كەس بێنم بەڵام زۆر كەس جێگای نەكردنەوە بۆ شەوێك، بەڵام شەمسەدین بردنیە ماڵی خۆی و منداڵەكانی لەباوەش گرت، من ئێستاش دیمەنەكە لەبەرچاومە ئەگەر وێنەكێش بام وێنەم دەكرد، یەكێكی لەو باڵەی و یەكێكی لەو باڵەی تر هەردووكی هەڵگرتبوو بەپێشیان كەوتبوو بردنی بۆ ماڵی خۆی لەوە زیاتر دەچوو بۆلای دكتۆر، دەیبردن بۆ لای دكتۆرو كاری وەرگێڕانیشی بۆ دەكردن، هەتا یەكێكیان نەخۆش بوو، ماوەیەكی زۆر لەماڵی شەمسەدین مانەوە هەتا دوایی

پاسپۆرتیان بۆ دروستکراو عیراقیان بەجێهێشت و چوونەوە دەرەوەی وڵات، جارێکی تریش ئێمەمانان خەریکی ئەوە بووین کە بەرەیەکی تازە پێکبێت لەنێوان چەپەکان ئەوکات چەپەکان بریتیبوون لەحزبی شیوعی عیراقی (القاعده) حزبی شیوعی عیراقی (رایه شغیله) و حزبی وحده الشیوعی مامۆستا عەزیز شەریف و پارتی دیموکراتی کوردستانیش ئیعلانی کردبوو کە مارکسی لینینییە، ئەم چوار گروپە دەیانویست کۆببنەوە جێگایەك پێویست بوو، شەمسەدینماڵەکەی خۆی تەرخانکرد بۆ ئەو کۆبوونەوانە، لەماڵی شەمسەدین کۆدەبووینەوە، لەو شەهیدە دیارانەی کە لەوێ بوون سەلام عادل بوو ئەوەی کە بیرمە عەبدولڕەحیم شەریف بوو، هەروەها حەمزە سەلمان، ئەمانە هەموو بەبێ ئەوەی گوێبداتە نەتیجەی چییە؟، دەگیرێ چی بەسەردێ؟، میوانداریشی دەکردن و هەندێکجار دەشمانەوە، هەروەها خوالێخۆشبوو مامۆستا هەمزە عەبدوڵڵاش هەروەتر ماوەیەك لەماڵی ئەو بوو، یانی ماڵەکەی خولاصە وەکرێکی ئەم هێزە سیاسیانە بوو بەبێ ئەوەی گوێبداتە ئەوەی ئەنجامەکەی چی لێدێت و خۆی چی بەسەردێت؟، بەڕاستی لەخەباتگێڕێکی ئازاو تێکۆشەر دەوەشایەوە ئەو کارانە بکات کە ئەویش کاك شەمسەدینە.

### زۆر خاکی بوو

بێجگە لەوە بەڕاستی پیاوێکی خۆنەویست بوو نەیدەویست ناوی بێت و نەیدەویست مەدح بکرێت و ئەوانەی هەموو بەلاوە گرنگ نەبوو زۆریش خاکی بوو، دۆستێکی دێرینی خوالێخۆشبوو صاڵح شێرە بوو کە جوتیارێکی ئەو ناوچەیە بوو هەمیشە لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانە رایدەبوارد کە دەهاتەوە بۆ

ئێرە لەمەکتەبیش چالاکییەکی باشی هەبوو لەناو هێزە عەرەبییەکاندا بەسیفەتی ئەوەی کە سەرۆکی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان بوو، هەوڵێکی باشیدا بۆ ئەوەی نێوانی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان و یەکێتیی قوتابیانی عێراقی کە حزبی شیوعی سەرپەرشتی دەکرد چاك بێت و لەسەردەمی سەرۆکایەتیی ئەودا ئەو پەیوەندییە دروستبوو، پێشتر نێوانیان باش نەبوو من خۆشمی لەگەڵ بووم، بەڵام ئەوە وایلێهات کە شەمسەدین توانی لێکیانی نزیك بکاتەوەو پێکەوە کۆبوونەوەیەکی موشتەرەك دروست بکات و پاشان کۆمیتەیەکی موشتەرەك بۆ ئەوەی خەباتی موشتەرەك پێکەوە بکەن و لەخۆپیشاندانەکاندا بەشدارین پێکەوە، لەگەڵ حزبەکانی تر زۆر بەدڵی نەبوو هەرچەندە خۆی کاك شەمسەدین نوێژو ڕۆژووی دەکرد، بەڵام زۆرتر دڵی بەمەوقیفی حزبی شیوعی دەکرایەوە، ئەو سەردەمە تازە میساقی باسیل دەرچوویبوو کە تێیدا مافی چارەی خۆنووسین زۆر بە ڕەوشەن نووسرابوو لەسەر کوردستان و ئەوە، کاك شەمسەدین نوسخەیەکی لەگیرفان بوو کە باس دەکرا دەیهێنا دەرەوە کە تەماشا بکەن ئەوا حزبی شیوعی تەئیدی هەموو هەقی میللەتی کورد دەکات، برادەرێکمان هەبوو تازە هاتبووە کولیەی حقوق نەیدەزانی ئەوەندە شەمسەدین باسی تەبایی حزبی شیوعی و کوردو پارتی و یەکێتیی قوتابیانی گشتی و کوردستانی دەکرد ڕۆژێك هات و لای من وتی تۆ بڵێی ئەوە شیوعی نەبێت و خزاوەتە ڕیزەکانمانەوە، وتم بابە نەخێر ئەوە پیاوێکی ئەصلەن حزبی نییە، بەڵام دۆستی هەموو ئەو کەسانەیە کە کوردایەتیان پێباشەو کوردیان خۆشدەوێ.

باسی پەیوەندی کاك شەمسەدین کرا لەگەڵ بارزانییەکان، بەڵام ئەوە کەمە، شەمسەدین لەساڵی ١٩٥٥– ١٩٥٦، پەیوەندیی لەگەڵ خوالێخۆشبوو

شێخ صادق و خوالێخۆشبوو شێخ عوبێد پەیداکرد کە لەبەغدا بوون، ئەمانە لەبەغدا بوون و منداڵەکانی جەنەرال بارزانی-ش لەگەڵیان بوون، کاك شەمسەدین دەیزانی من پەیوەندیم لەگەڵیان هەیە داوای لێکردم و وتی: پێم بناسێنە بردم بۆلایان، ئیتر یەکێك بوو لەوانەی کە زۆر سەری لێدەدان و دەچوو بۆ لایان و نیشانی دەدا کە ئامادەیە یارمەتیان بدات و ئەوکاتە بارزانییەکان دەربەدەربوون و لەزیندان بوون و جەنابی بارزانی لە روسیا بوو، سۆزێکی زۆری هەبوو لەسەریان و دواتریش ئەوەبوو کە جەنابی بارزانی هاتەوەو کردی بەنمایندەی خۆی لەهەولێر، بەڵام من پێموایە پێشتر خوالێخۆشبوو شێخ صادق هەڵیبژارد بۆ بارزانی کە بیکاتە نوێنەری خۆی لەهەولێر، لەکارەکانی سیاسیی بەغدادا کاك شەمسەدین بەڕاستی هەتا لەخۆپیشاندانەکانیشدا پیاوێکی ئازاو بەجەرگ و نەترس بوو، هەمیشە لەگەڵ منیش گاڵتەی دەکردو دەیووت تۆ قەت لەمن چەپ تر نیت، چەندی قسە بکەیت و بڵێی، من خۆم لەتۆ بەکەمتر چەپتر نازانم، منیش ئەوەم ئیستیغلال کردو جارێکیان پێکەوە لە لەندەن بووین وتم کاك شەمسەدین رات وایە لەسەر چەپ وتی: بەڵێ، وتم باشە سبەی دەچینە سەر گۆڕی کارل مارکس وتی باشە وەڵڵا چووینە سەر گۆڕی کارل مارکس وێنەیەکمان هەیە پێکەوە، لەسەر قەبرەکە وەستاوین و وێنەمان گرت جا کردم بەگاڵتە وتم: فاتیحایەکیش بخوێنە لێرە.

### شانەی چەکداری دروستکرد

بەڕاستی چەپی خۆشدەویست، وەنەبێ بڵێی دژێتی، بەڵام ئەوەنەبوو بڵێین مارکسییە، بەڵام دۆستی مارکیسیەکان بوو، لەگەڵ پارتی زۆر نزیك بوو،

بەڵام تا ١٩٥٧= ١٩٥٨ نەبوو بەئەندام، پاشان کە هەندێك دنیا سەخت بوو، بوو بەئەندام و ئیشی باشی کرد لەهەولێر پاشان وەکو باسیان کرد ئەو برادەرانە لەهەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلول کاك شەمسەدین پێش هەڵگیرسانی شۆڕشەکە چووە دەرەوە، نەك هەر لەبەرئەوەی فەرمانی گرتنی بۆ دەرچوو، ئێمە کاتی خۆی لەکۆتایی ئەو ساڵەدا کە هێشتا شەڕەکە هەڵنەگیرسابوو لەزۆر شوێن شانەی چەکدارمان دروستکرد، شانەی چەکدارمان دروستکرد بۆ ئەوەی کە ئەگەر قەوما شتێکمان هەبێت، ئەو لێپرسراوی دروستکردنی شانەی چەکداری هەولێر بوو،ئەو شانەی چەکداری دروستکردبوو، بێجگە لەشانەی چەکدار، خۆزگە یەکێك لەوانە لێرەدەبوو، یەکێك ماوە دەنووسێت کاك حەمید رەشاش، لێرەدا سەرۆك مام جەلال رووی لە کاك حەمید رەشاش کرد کەلەڕێوڕەسمەکەدا ئامادەبوو، پێیڕاگەیاند: حەمید ئەتو ئاگات لێیە هەقە باسی ئەو شتە بنووسیت لەسەر شەمسەدین، حەمید لێپرسراوی پۆلیسەکانی پارتی بوو، کاك شەمسەدین لێپرسراویان بوو، دوایی هانیدان کە چوونە شاخ و چەکیشیان برد، یەعنی کاك شەمسەدین هەم شانەی چەکداری مەدەنی قیادە دەکردو هەم لێپرسراوی چەکداری پۆلیسی پارتی قیادە دەکرد لەشاری هەولێر، کە چووە سەفینیش لەسەفینیش دەستی کرد بەخەباتی سیاسی لەناو هێزەکاندا بۆ تەوعیەکردنیان، باوەڕی بەوە هەبوو کە دەبێ بیروباوەڕی سیاسی بڵاوبکرێتەوەو لەگەڵ جووتیارەکانیش نێوانیان باش بێت، دوای ئەوە نەخۆش کەوت کە نەخۆش کەوتنەکەی ئەو خێرەی منی تێدابوو هات بۆ چەمی ڕێزان من چەکم نەبوو ئەو سەردەمە، تاپڕێکم هەبوو ئەو تفەنگەی دامێ کە ئێستا لەوێنەکەی دەرچووە، ناردیان بۆ بەغدا بەنهێنی پێویست

دەکرا بنێردرێت بۆ دەرەوە بەوەسیلەیەك لەوەسیلەکان توانیمان بینێرینە تاران، لەتاران تەداوی کراو جارێکی تر هاتەوە پاشان کە شۆڕش پەیوەندیی پەیداکرد لەگەڵ ئێران جەنابی بارزانی و مەکتەبی سیاسی پەسەندیان کرد کە شەمسەدین ببێتە نوێنەری شۆڕش لە تاران، مەبەستم لەوە ئەوەیە کەبڵێم دیبلۆماتێکی باشیش بوو، یەعنی نەك هەر وەکو وتمان لەڕێکخەری ناو خوێندکاران باش بوو، رێکخەری ناو حزب باشبوو، هەروەها دیبلۆمات بوو، هەروەها برادەرێك ئەوەی ورووژاند کە حزب دانرا کاك شەمسەدین یەکێکە لەو کەسانەی کە مۆڵەتی وەرگرتووە، تەبعەن ئەوەش بەڕاستی بۆ دەرخستنی ناوی کاك شەمسەدین بوو، ناوی خرایە ناو لیستی ئەو برادەرانەی کە داوای مۆڵەتیان کرد، چونکە ئەوەندە خۆنەویست بوو ئەوەندە خزمەتی هەبوو خەڵك نەیدەناسی، ئەوکاتە لیژنەی مەرکەزی پارتی وای بەباش زانی کە دەربخات و هەقی خۆی بداتێ، خەڵك بیناسێ کە چەند خزمەتی هەیە لەبەرئەوە ئەو دانرا بەئیمزاکردنی لەهەولێر لەجیاتی برادەرانی تر، لەکاری دیبلۆماتیشدا بەڕاستی پیاوێکی زیرەك و بەتوانابوو، نەك هەر لەئێران ئەو برادەرانە باسیان کرد کە لە ئەورووپاش و لەزۆر شوێنی تریش کاك شەمسەدین کە دەچوو بەنوێنەرایەتی جەنابی بارزانی ئیشەکەی خۆی بەچاکی و بەڕێکوپێکی دەکردو بەسەرکەوتوویی دەگەڕایەوە.

### کاریگەریی زۆر بوو

جارێکیان منیش مەلیك حسێنم دیت، پاش ئەوەی کە دیتم ئەو هاوسۆزی زۆری نیشاندا، بەڵام وتی من هیچم نییە نەپارەم هەیە، نە چەکم هەیە بتاندەمێ دەتوانم شتێکتان بۆ بکەم لای شا تکاتان بۆ بکەم کە شا ئەوکاتە

مەوقیفی لەئێمە باش نەبوو، تازە ئینقلابی شوومی شوبات ڕوویدابوو، ئومێدیان بەوەبوو كە حكومەتی بەعس كەوتبووە قەڵاچۆكردنی شیوعییەكان و دیموكراتەكان لەعێراق كە هەموو دەوائیرە ڕەجعی و ئیستیعمارییەكان دڵیان زۆر پێی خۆشبوو كە ئەو ئیشە دەكەن كە ئەوان دەیانویست لەبەر ئەوە لەو سەردەمە لەگەڵ ئێمە سست بوون، وتی من تكاتان بۆ دەكەم لای شا كە شا ئاسانكاریتان بۆ بكات و دەرگاتان بۆ بكاتەوە، جارێكی تر دیمەوە زۆر شتی دەزانی، وتم جەلالەتی مەلیك ئەو شتانەت لەكوێ خوێندۆتەوە، وتی: وەڵڵا لاوێكتان هەیە هاتۆتە لام (سحرنی)، وتم كێیە، وتی: شەمسەدین موفتی، وتی: هەموو قسەكانی بۆ كردم و وا چۆتە دڵمەوە وەخت بوو ببمە پێشمەرگە لەگەڵی، ئەوەندە كاریگەری تێكردم كە ئەوەش نمونەیەك بوو بۆ ئەوەی كە چۆن كاریگەری دەكرد لەو خەڵكانەی دەچوو بۆ لایان بۆ یارمەتی، من حەزدەكەم شتێكیش بڵێم لەو موناسەبەتەوە ڕەخنەیەكە لەخۆشم، ئێمە كە شۆڕشمان دەستپێكرد یەك حسابی هەڵەمان كرد ئەویش ئەوەبوو حسابمان نەكرد بەدیلەكەی كێیە بیڕوخێنین و خەبات بكەین و بەندەی موخلیصتان لەموتەحەدیسەكان بوو كە شۆڕش بكەین، بۆ مێژوو جەنابی بارزانی لەگەڵ هەڵگیرساندنی شۆڕش نەبوو، من چوومە لای لەچیای شیرین بەناوی مەكتەبی سیاسییەوە، چونكە خیلاف هەبوو لەنێوان مەكتەبی سیاسی، مامۆستا برایم ئەحمەدو مامۆستا نوری شاوەیس و دكتۆر شەمزینی و دكتۆر مرادو ئەمانە لایەنگری ئەوە نەبوون كە ئێمە دەست بكەین بەخەباتی چەكداری، لایەنگری ئەوە بوون خۆمان ئامادە بكەین، بەڵام دەیانوت پێداویستی شۆڕش نییە، دوو ترسیشیان نیشاندەدا دەیانوت یەك دەرەبەگایەتی دەژێننەوەو عەشایەرییەكان دەژێنەوەو دێنەوە مەیدان، سەرۆك عەشیرەتەكان نفوزیان هەیە، دوو كەڕووخا كێ دێت، بەعس دێت،

بەعسیش خراپن، ئێمە لاکەی تر من خۆم لەموتەحەدیسەکان بووم ئەو حسابەمان نەکرد، منیان نارد بۆلای جەنەراڵ بارزانی، چوومە لای پرسی پێبکەم وتی: کاتی شۆڕش نییەو دەست پێمەکەن، بەڵام خۆتان ئامادە بکەن و وابکەن هەندێك ڕێوشوێن بکەن، ئەمە لایەنگری ئەوە نەبوو ئێمە دەست بکەین بەشۆڕش و دواتر هەتا ١٦ مانگی ئەیلول ئیشەکە لەدەست ترازاو تا ئەوان بارزانیان بۆردومان کردو تێیان گلاند، ئەگەرنا لایەنگری ئەوەنەبوو کە ئێمە شۆڕش بکەین و دەستپێشخەربین، عەللا کولین کرا، کاك شەمسەدین تێیدا دەورێکی باشی هەبوو لەسازدان و ئامادەکردنی پێشمەرگە لەناوچەکەی، کاك حەمید رەشاش ئەگەر وەختی بوو دەوری شەمسەدینی زۆر ئاگا لێیە، چونکە ئەو مەسئولیان بوو، حەلەقەی وەسلیان بوو، ئەو دەتوانێت بیگێڕێتەوەو بەڕاستی دەورێکی زۆر سەروەرانەیە، دوای ئەوەی کەکاك شەمسەدین کەوتە مەیدانی دیبلۆماسییەوە ئینجا ئیشی قورس بوو لەو جێگایەی کە ئیشی دەکرد، چونکە بەسەر فێڵەکانیاندا کەوتبوو، نەیدەهێشت ئەوەی ئەوان دەیانەوێت و شت تێپەڕێت بەسەرماندا شتەکانیانی ئاشکرا دەکرد، ئیسکی قورس ببوو دەیانویست لە کۆڵیان بێتەوە دەیانویست نەقڵ بێت، بۆیە زۆریان پێخۆشبوو کرا بە وەزیری کشتوکاڵ ئەوانە، واتە ئەوە شتێك بوو لایان خۆشبوو لەبەڵایەك ڕزگاریان بوو، دوای تەبعەن ئەوە شۆڕش چ بەسەر هات.

## لەگەڵ کاك عومەر دەبابە زۆر هاوڕێ بوون

کاك شەمسەدین لایەنگری خەباتکردنەوەو بووژانەوەی شۆڕش و ئەوە بوو، لەگەڵ کاك دکتۆر مەحمودو هەندێك لەبرادەران کەوتەوە چالاکی، لەگەڵ بەندەی موخلیصتان و کاك عومەر دەبابەش کە زۆر هاوڕێ بوون، لەگەڵ کاك

عومەر دەبابە زۆر زۆر هاوڕێ بوون وەکو سۆفی و شێخ و دەروێش وابوو، کاك شەمسەدین لەو کەسانە بوو هەرچەندە نەختێك ناساغ بوو ئەوکاتە ئەو گۆچانی پێبوو من پێم نەبوو بەگۆچانەوە هات لەگەڵمان بۆ شاخ، هات بۆشاخ ماوەیەك لەوێبوو تا ئەو برادەرانە گێڕایانەوە، بەڵام هەر نەگۆڕا، من شایەدیەکی بۆ دەدەم بەرامبەر هەمووان پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بەغدا پرسی بەمن کردو من بۆم مۆرکردو وتم: بەم سیفەتەو بەبێ مەرج، بەبێ ئەوەی کە ئەوەت پێبکەن و بچیتە سەر تەلەفزیۆن و رادیۆو رۆژنامە، لەوڵات بیت باشترە لەوەی لەدەربەدەری بیت ئەوەبو هاتەوە لەهەولێر لەپاشان لەدوای هەڵگیرساندنەوەی راپەڕین دیسان کەوتەوە چالاکییەکی زۆر، چونکە خۆنەویست بوو پیاوێك بوو بەڕاستی جوندی مەجهولی شۆڕشی کوردستان و کوردایەتی بوو، پلەو پایەی قبوڵ نەدەکرد دەنا بەڕاستی یەکێکە لەو کەسانەی کە بەهەقیقەت پێی بڵێن سەرکردە، سەرکردەبوو لەهەردوو شۆڕشدا، شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێ، لەخەباتی خوێندکاراندا سەرکردە بوو، لەخەباتی حزبیشدا سەرکردە بووەو لەخەباتی جەماوەریش لەناو جوتیارانیشدا پیاوێکی چالاك و کاریگەرو ئیشکەر بوو، بۆیە بەڕاستی هەقە شتێکی ئەوتۆی بەناوەوە بکرێت کە ژیانی بکرێت بەلێکۆڵینەوەیەك لەسەری، دەڵێن جارێکیان وەزیرێکی تورك کە باسی جوندی مەجهولی تورك دەکرێت، دەڵێت ئەگەر بوێرم ئەوە جوندی مەجهول نیە کوردە، منیش ئەگەر جوندی مەجهول دانێن، ئەگەر بوێرم دەڵێم ئەوە شەمسەدین موفتییە، جوندی مەجهول نییە، ناوی ناڵێن چونکە بەراستی وەکو جوندی مەجهول بووە لەشۆڕش و خەباتدا.

## لەسەر شەمسەدین موفتی هەرچی بڵێین کەمە

لەسەر شەمسەدین موفتی هەرچی بڵێین کەمە، من بە تایبەتی بەڕاستی زۆر زۆر هاوڕێم بووە، شانازی بەوەوە دەکەم ٦٢ ساڵ ئێمە هاوڕێ بووین و لەو ٦٢ ساڵەدا هەتا هەندێکجار سەنگەریشمان جیابوو، بەڵام هەر تەبابووین هەر برایەتیمان هەبوو، هەر پێکەوە ژیاوین، هەندێکجار لەگەڵ عەدنان قسەم کردووەو دەمووت کاکە من لەتۆ نزیکتر بووم لەو، ئەگەر باوەڕ ناکەی برۆ لەخۆی بپرسە، لەبەر ئەوە بۆ من بەڕاستی شەمسەدین خەسارەتی شەخصی و سیاسی و نیشتمانی بوو، من برایەکی زۆر خۆشەویستم لەدەستدا بەداخەوە زۆر بەداخەوە کاتی نەبوو بەڕاستی، چونکە نەخۆشییەکەی ئەوە نەبوو کە پێی بمرێت، بەڵام لەپڕ تووشی بەزمێکی تر هات، دەنا پێشتر ئەو نەخۆشیی هەبوو کە هاتەوە دواجار لێرە باسی کرد کە تەندروستی باش بووەو کێشی کەم کردبوو، بەڵام ئەو شتەی کە لەناکاو تووشی هات ئەوە هۆکارێك بوو بۆ ئەوەی کە کۆچی دوایی بکات، من پێموایە شەمسەدین جێی شانازی میللەتەکەمانە و جێی شانازی هەولێرەو جێی شانازی بنەماڵەی بەناوبانگی موفتییەو ئینشائەڵڵا لەبەهەشتی بەرین خودا جێگای دەکاتەوە، بەتایبەتی پیاوێکی موسڵمانی تەواو بوو، نوێژو ڕۆژووی بەردەوام کردووە، تەبعەن لەچەپایەتیدا دەیوت ئەمن لەهەوراز لەمن زیاتر چەپترە، منیش دەمووت لەڕۆژو نوێژدا من لەتۆ هەورازم، ئاخر دەیوت کاکە تۆ، دەموت کاکە من چوومەتە مەککەو مەدینەو هەر نوێژێك دەبێت بەسەد هەزار، من رەنگە هەزار نوێژم لەدەوروبەری کەعبە کردبێت و هەزاریشم لەمزگەوتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کردووە، مەلائیکەتەکە بۆم حساب بکات، هی من مەلایینەو هی تۆ نەفەرێکە، دەیوت نا ئەوە دادت نادات.

هەزار ڕەحمەتی لێبێت و سەروەری بۆ کاك شەمسەدین.

من سەرەخۆشی لەئێوە ناکەم کاکە عەدنان، سەرەخۆشی لەخۆم دەکەم و من لەو مەسەلەیەشدا خۆم بەنزیککتر دەزانم لێی.

ئینشائەللا ئێوە هیممەتێك دەکەن ناوی لەمێژوودا بمێنێتەوەو باسی لەمەکتەبیشدا بخوێندرێت. شیعرەکەی حاجی قادریش بنووسنەوە کە دەڵێت:

مەرگ و ژین بنووسنەوە میسلی سێبەرو تاوە

ئەوەی باقی بمێنێت هەر ناوە

ژیان وایە هەمووومان دەمرین و ئینجا کێ ناوێکی باشی بەجێهێشت ئەوا قازانج دەکات، کێ ناوێکی خراپی بەجێهێشت ئەوا قوڕی بەسەر دەبێت.

شەمسەدین ئینشائەللا ناوێکی باشی بەجێهێشتووەو ئینشائەللا لەبەهەشتی بەرین خوا جێگای دەکاتەوە.

زۆر سوپاس برادەران

**د.ئەرسەلان بایز:**

**کاك شەمسەدینو بنەماڵەی موفتی**

**جێدەستیان لەکوردایەتیو هەڵگیرساندنی شۆڕشدا دیارە**

دەقی وتاری د.ئەرسەلان بایز سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان کەڕۆژی ٢٠١٢/١٠/١٢، لەهەولێر لەڕێوڕەسمی چلەی ماتەمینی پێشمەرگەو تێکۆشەری دێرینی کوردایەتی خوالێخۆشبوو شەمسەدین موفتی-دا پێشکەشیکرد:

بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

بەڕێز جەنابی سەرۆك مام جەلال

برای بەڕێزم کاك عەدنان موفتی

نوێنەری سەرۆکی هەرێم و میوانانی بەڕێز

بەڕێزان خانەوادەو خزم و کەسوکارو هەڤاڵانی خوالێخۆش بوو کاك شەمسەدین موفتی

ئامادەبووانی بەڕێز

چل ڕۆژ لەمەوبەر لەڕۆژێکی وەك ئەمڕۆدا زەنگی تەلەفۆنی دەیان کەس لەبرازاو خزم و دۆست و هەڤاڵانی پێشمەرگەو تێکۆشەری دێرین و کەسایەتیی دیاری شاری قەڵاو منارە لێیداو بەدەنگێکی خەمناك هەواڵی ئەوەیان ڕاگەیاند کەدڵی پێشمەرگە و سەرکردەی دێرینو یەکێ لەسەرپەرشتیارەکانی یەکەمین مەفرەزە سەرەتاییەکانی شۆڕشی ئەیلول لەغوربەت و دوورە وڵاتیدا لەلێدان کەوتو بۆ دوایین جار پێڵوی چاوەکانی خستەسەر یەك و ماڵئاوایی لێکردین.

زۆر نەبوو پێش ئەو کۆستە، هەر لەبۆنەی چلەی ماتەمینی پێشمەرگەی دێرینی ئەیلول مام ئەنوەر جۆخین-دا، کاك حەمید رەشاش سەربوردەی چۆنیەتی شکاندنی مەشجەبی پۆلیس و بردنی ژمارەیەك چەکی بۆ گێڕاینەوە، بۆ دامەزراندنی مەفرەزە سەرەتاییەکانی شۆڕشی ئەیلول لەسەفین لەسەر دەستی کاك شەمسەدین و چەند هەڤاڵێکی تر.

هەرگیز ئەو دیمەن و یادەوەرییەشمان لەیاد ناچێت، کاتێ کاك عەدنان موفتی لەکاتی ناشتنی رەحمەتیو لەدوایین دیدەنیو ماڵئاوایی مامی-دا بەهەوکی پڕ لەگریان و فرمێسك لەچاوان قەتیس ماو وتی: مامە خۆشەویستەکەم ئەو رۆژانەمان هەر لەیادە کاتێ منداڵ بووین دەهاتیە ماڵە خزمانو منداڵەکانت لەباوەش ئەگرتو بەسرودە نەتەوەیی و نیشتمانییەکان

گۆشت ئەکردین. ماڵئاوا ئەی مامە پێشمەرگەو سەرکردەو تێکۆشەرەکەم ماڵئاوا.

خۆشم کاتێ لەساڵی ١٩٦٣ لەپۆلی شەشەمی سەرەتایی بووم لەئەنجامی هاتنی هێزێکی گەڕۆکی پۆلیس بۆ ناحیەی دیبەگە کەئەوسا پێیان ئەووت «قوەی سەیار»، مامۆستای وانەی کوردی لەترسی هێزەکە شارەدێکەی بەجێ هێشتو چووە زورکو گردۆڵکەکانی پشتی ناحیەکە، ئێمەش بێ ئەوەی ئاگاداری هیچ مەسەلەیەك بین، هەر لەخۆشەویستی مامۆستاکەمان بەدوای ئەودا ڕۆیشتین دوای گەڕانەوەی هێزەکە، هەرلەنێو گردۆڵکەکاندا مامۆستاکەمان دانیشتو ئێمەمانانیش بەدەوریدا جانتاکەی دەستی کردەوەو کۆمەڵێ وێنەی پیشاندابن، پێشی وتین ئەمانە سەرکردەکانی کوردو شۆڕشو پێشمەرگایەتییەو یەکێ لەو وێنانە کاك شەمسەدین موفتی بوو، وتی: بۆ ئەوەی ئەم وێنانە نەکەونە دەست پۆلیسو نەمگرن بۆیە هاتووم بۆ ئێرە. دیارە ساڵانی دواتر ئێمە زانیمان کە ئەو مامۆستایە کادیرێکی پ.د.ك بوو.

بەمجۆرە ئەبینین کاك شەمسەدینو بنەماڵەی موفتی کەیەکێ لەخانەوادە ڕووناکبیرو ڕەسەنەکانی شاری هەولێرە جێ دەستیان لەکوردایەتیو هەڵگیرساندنی شۆڕشدا دیارەو دەوری کاریگەریان هەبووە لەم شارەدا، بۆیە کۆچی دوایی ئەو تێکۆشەرە خەمێکی گەورەی خستە دڵ و دەروونی هەمووومان.

هێندە دەکرێ لێرەدا جارێکی تر سەرەخۆشی لەخۆمان و بنەماڵەو کەسوکارو هاوڕێیانی ئەکەین لەخوای گەورەو میهرەبان داواکارین گیانی خوالێخۆشبوو بەبەهەشتی بەرینی خۆی شاد بکاتو ئارامیو سەبوریش بەهەمولایەك بدات.

انا لله وانا اليه راجعون

# لەبیرەوەرییەکانم
# لەگەڵ مامۆستای کوردایەتی ئیبراهیم ئەحمەدی نەمر

مانگی (٥)ی ساڵی ١٩٦٢ بوو هێزەکەمان بەسەرکردایەتی جەنابی مام جەلال ناوچەی پێنجوێنی رزگارکرد لەپاش رزگارکردنی ناوچەکە گەڕاینەوە چەمی رێزان بۆ پشوودان و خۆئامادەکردنەوە بۆ چالاکیەکیتر، مام جەلال مۆڵەتی بەمن و عەریف عەلی و سێ پێشمەرگەیتردا بۆ ماوەی ١٥ رۆژ بۆ بینینی منداڵەکانمان چوبوینە گوندی کلێسە، مۆڵەتەکەمان تەواوبوو گەڕاینەوە چەمی رێزان و شەو چوینە لای مام جەلال، مام جەلال وتی: ئەندامانی مەکتەبی سیاسی هاتونەتە دەرێ بە یەکجاریی ئێستا لێرەن بابچین سەردانیان بکەین و بائێوەش بناسن، شەو لەگەڵ مام جەلال چوینە لای ئەندامانی مەکتەبی سیاسی ئێمە یەکەمجاربوو ئەندامانی مەکتەبی سیاسیمان ناسی ئەوکاتە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لەم بەڕێزانە پێکهاتبوون:

١. خوالێخۆشبوو مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێری حزب.
٢. خوالێخۆشبوو مامۆستا نوری شاوێس ئەندام.
٣. مامۆستا عەلی عەبدوللا ئەندام.

لەکاتی دانیشتنەکەدا بەڕێز مام جەلال زۆر بەباشە باسی ئێمەیکرد بۆ ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی، ئێمەش زۆر کەیف خۆشبووین بەو سەردانەمان پاشان گەڕاینەوەو چوینەوە سەر کارەکانی خۆمان، دوای ٣ رۆژ مام جەلال

بەدوای منی نارد فەرمووی ١٠ پێشمەرگەی چالاك و دڵسۆز لەناو هێزەکە دەستنیشان بکە لەگەڵ خۆت، دەبنە پاسەوانی ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی، وتی خۆت دەبیە سەر دەستەی پاسەوانەکان تا لەو سەفەرە دەگەڕێینەوە، منیش ناوی ١٠ پێشمەرگەم نووسی و دام بە مام جەلال، مام جەلال ١٠ پێشمەرگەی بۆم نارد، من و پێشمەرگەکان چووینە لای مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد، بۆ رۆژی دواتر خۆمان کۆکردەوە بۆ سەفەرکردن بۆ لای بارزانی ئەو کاتە بارزانی لەحاجی ئۆمەران بوو لەناوچەی باڵەکایەتی، ئەمە یەکەم سەفەری مەکتەبی سیاسی بوو لەکاتی شۆڕش، لەم سەفەرەمان خوالێخۆشبوو عەبدولرەحمان رووتەشمان لەگەڵ بوو بۆ شارەزایی، مام جەلال خۆشی لەگەڵمان هات لەڕێگا مامۆستا ئیبراهیم زۆر سەبر دەڕۆیشت ولاغی سواریمان بۆ دەهێنا سواری ولاغیش نەدەبوو، ناچاربووین بەپێی مامۆستا ئیبراهیم دەڕۆیشتین بەدەشتی کۆیەو هەیبەت سوڵتان و چنارۆك تا چوینە بارەگای گوندی بێتواتە، سێ شەو لەبارەگای بێتواتە ماینەوە لەبەر ئەوەی دوو رۆژنامەنوسی بێگانە هاتبوون و مامۆستا ئیبراهیم و مام جەلال کۆبونەوەیان لەگەڵ رۆژنامەنووسەکان دەکرد، دوای سێ ڕۆژەکە ئێمە هەموو سەروو مەتارە ئاومان هەڵگرتبوو بۆ ڕێگا، شەوەکە ئەوەندە تاریك بوو لەسەر کێوەکەی پشتی بێتواتە ئێمە ئەوانەی لەگەڵ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بووین ڕێگامان هەڵەکرد بەشەکەی لەگەڵ مام جەلال بوون رووتەیان لەگەڵ بوو ئەوان لەئێمە دابڕان، مامۆستا ئیبراهیم وتی زیاتر مەڕۆن لەجێگای خۆتان دانیشن نەوەك تووشی هەڵدێرین، لەجێگای خۆمان دانیشتین، بەڵام ئێمە پێشمەرگەکان کەسمان ئاومان پێ نەمابوو زۆریش تینوبووین بەس مامۆستا ئیبراهیم ئاوی پێمابوو، بۆ ئەوەی کەسمان لەتینواندا نەخنکێین،

ئەوەی زۆر تینوی بوایە مامۆستا ئیبراهیم بەسەرە مەتارەکەی سەرە مەتارەیەك ئاوی دەدایێ، دواتر مام جەلال لەگوندەکە چەند کەسێکی شارەزای بۆماننارد و پێشمانکەوتن چوینەوە لای مام جەلال.

هەر بەپێیان چوینە حاجی ئۆمەران ئەو کاتە لەشکرەکەی بارزانی لە دوو لا لەشەڕدابوو لەگەڵ جەیش و لەگەڵ عەشیرەتی شێخ رەشیدی لۆلان و عەشیرەتی برادۆست، هەروەها دەوری مەرکەزەکەی رایاتیشی گرتبوو، ئێمە ئەو ماوەیەی لای بارزانی بووین، پێشمەرگەکان داوامان لەمام جەلال کرد بمانباتە لای بارزانی، مام جەلال ئێمەی بردە لای بارزانی، بەڵام لەکاتی سەردانەکە بارزانی خۆی لێمان توڕەکرد لەسەر ئەوەی مام عەبدوڵڵا دەستی ماچکرد.

### یەکەم بارەگای مەکتەبی سیاسی

دوای ئەوەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی کاریان تەواوبوو بەهەمان رێگادا گەڕاینەوە، من لەڕێگا هەر لەگەڵ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد دەڕۆیشتم هەرگیز بەتووڕەیی مامۆستا ئیبراهیمم نەدیت لەقسەی خۆش زیاتر، لەڕێگا مامۆستا ئیبراهیم فەرمووی من خۆت و پێشمەرگەکان ئیزن نادەم دەبێ هەر لەگەڵ ئێمە بن، منیش وتم دەبێ (مام جەلال)یش رازیبێ، مامۆستا ئیبراهیم وتی من داوا لەمام جەلال دەکەم، دوای گەڕانەوەمان مەکتەبی سیاسی داوایان لەمام جەلال کرد بۆ مانەوەی من وەکو لێپرسراوی بارەگای مەکتەبی سیاسی لەگەڵ پێشمەرگەکان بمێنم و داواشم لە مام جەلال کرد (٥) پێشمەرگەیتریشم بداتێ، ئێمە ژمارەمان بووە (١٥) پێشمەرگە ئەوکاتە گەورەترین دەسەڵاتی شۆڕش (١٥) پاسەوانی هەبوو، باسی ئێستا ناکەم،

یەکەم بارەگای مەکتەبی سیاسیمان لەگوندی دڕی کردەوە لەسەر کانیاوەك کەپرمان کرد.

## جامە ماست و نانەڕەقە

دەربارەی خواردەمەنی بەشی زۆری نان و چا بوو رۆژێك نەمدی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی خواردنێکی تایبەتی بخۆن، هەموومان وەکو یەکبووین هەندێك رۆژ جامە ماستێکی بچووکمان بۆ دەهات ئەویش بەشی هەموومانی نەدەکرد، مامۆستا ئیبراهیم نانەڕەقەکەی لەماستەکە دەکوشی و هەندێك ئاوی لەسەر دەکرد بۆئەوەی بەشمان بکات بەکەوچك بەسەر هەموومانی دابەش دەکرد ئەو کاتە بێ تەلمان نەبوو نامەهێنان و نامەبردن بەهۆی تەتەرەوە بوو، هەر لەو کاتەش بوو رەئیس کەمال موفتی هاتە ناو ڕیزەکانی شۆڕش، بەڕێکەوت ئەو رۆژە کاریلەیەکی بچووکمان سەربڕیبوو چێشتی برنجمان هەبوو کاك کەمال وتی ئەوە حەیوانتان سەر بڕیوە؟ منیش وتم بەڵێ، کاك کەمال وتی لەمەودا ریخۆڵەی حەیوان فڕێ مەدەن خڕنوکی لەریخۆڵەکە بکەن و وشکی بکەنەوە لەکاتی تەنگانە بیخۆن، هەر لەو ماوەی لەگوندی (دڕی) بووین من و مامۆستا ئیبراهیم هێسترێکی پشت برینداری بەرەڵڵامان چاککردەوە خاوەنەکەی لەبەر برینەکەی پشتی بەرەڵلای کردبوو من ئاوم بەدەستی مامۆستا ئیبراهیم-دا دەکرد مامۆستاش برینی هێسترەکەی دەشوشت و حەبی ورد دەکردو بەبرینی هێسترەکەی دادەکرد تا هێسترەکە چاکبۆوەو دوای چاکبوونەوەی ناردمان لەماوەت کورتانمان بۆ کڕی و هەموو ئیشوکارەکانی خۆمان بەهێسترەکە دەکرد.

## جێگایەك بۆ زستان

ئێمە هەر لەگوندی دڕی بووین تا مانگی ١١ی ١٩٦٢ كاتی ئەوە هات بۆ زستان جێگایەك پەیدابكەین، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد فەرمووی پێشمەرگەیەك لەگەڵ خۆت ببە ئەشكەوتێك بدۆزەرەوە جێگایەك پەیدابكە دەستبدات بۆ بارەگای مەكتەبی سیاسیی منیش مالومەم دۆزییەوە، ئەو ئەشكەوتە لەهەموو ئەشكەوتەكانیتر باشتربوو بۆ بارەگای مەكتەبی سیاسیی لەهەموو روویەكەوە، ئەشكەوتی مالومە دوو ئەشكەوتە لەپاڵ یەكتردا لەلای ژوورەوەیان تێكەڵ دەبوونەوە، لەپاش پەسەندكردنی شوێنەكە گەڕاینەوە بارەگای خۆمان، من باسی ئەشكەوتەكەم بۆ مامۆستا ئیبراهیم كرد ئەویش ئەو ئەشكەوتەی لاباشبوو لەپاشان من (١٠) پێشمەرگەم لەگەڵ خۆم برد ئەشكەوتەكەمان پاككردەوەو بە غەرەبەرد پێش ئەشكەوتەكەمان گرت ئەشكەوتە بچووكەكەمان تەرخانكرد بۆ مەكتەبی سیاسیی ئەشكەوتە گەورەكەش بۆ كۆڕو كۆبوونەوەو میوانخانە، لەپاشان گواستمانەوە بۆ ئەشكەوتەكە پێشئەوەی بێینە مالومە مامۆستا ئیبراهیم فەرمووی نابێ ئەندامانی مەكتەبی سیاسیی ئاشكرا بكرێن كەوا لەبنكەی مالومەین دەبێ بنكەكە بەناوی تۆ بێ واتە بەناوی بنكەی حەمید رەشاش-بێ، بۆئەوەی ئەندامانی مەكتەبی سیاسیی ئاشكرا نەبن ناوەكانی خۆیانیان گۆڕی مامۆستا ئیبراهیم ناوی مامۆستا قادر بوو، مامۆستا نوری شاوێش ناوی مامۆستا رەسول بوو، مامۆستا عەلی عەبدوڵڵا ناوی مامۆستا شەریف بوو.

## دەنگی فڕۆكە دێت

ئەو نامانەی بۆ مەكتەبی سیاسیی دەهاتن لەناو دوو بەرگ دەنووسرا مەكتەبی سیاسیی بەڕێز...، لەكاتی دانیشتن و نانخواردن ئەندامانی

مەکتەبی سیاسی هەر لەگەڵ ئێمە بوون، بەڵام کاتێك میوانمان دەهات حەرەسەکە ئاگاداری ئێمەی دەکرد بەوشەیەکی نهێنی دەیوت (دەنگی فڕۆکە دێت) واتا ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی بچنە جێگای خۆیان بۆ ئەوەی ئاشکرا نەبن، ئەو ماوەی ئێمە لەئەشکەوتی مالومە بووین پشیلەیەکی رەشمان هەبوو ئەو پشیلەیە زۆر لەگەڵ پێشمەرگەکان راهاتبوو مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد پشیلەکەی زۆر خۆشدەویست، لەبەرئەوەی پشیلە قسەو باسی زۆر لەسەر دەکرا قسەکان وا دەکران و واش بڵاوبوبۆەوە دەیانوت ئەو پشیلە رەشە نامە بۆ بنکەکان دەبات و نامەش دەهێنێتەوە، بۆ وەرزی زستان من خانووەکەم لەبەر دەرگای ئەشکەوتەکە دروستکردبوو، بۆ میوانخانەو بۆ پێشمەرگەکان، لەشاری سلێمانی زۆر کەلوپەل و شەکروچا بۆ بنکەکەمان دەهات، لە زستانی ساڵی ١٩٦٣ رەئیس حەمید ئەمین فەرەج هاتە بنکەی مالومە دواتر دکتۆر سدیق ئەتروشی هات بەڵام نەخۆشبوو، لەسەرەتای ١٩٦٣ مامۆستا ئیبراهیم بۆ یەکەمجار چووە تاران بۆ رێککەوتنی هاوکاری نێوان حکومەتی ئێران و سەرکردایەتی شۆڕش، مامۆستا ئیبراهیم بەشێوەی نهێنی چوو بۆ ئێران شەو بەتەنیا چوو بەس یەك کەسی لەگەڵ بوو هەردووکیان بەسواری وڵاخ چوون، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لەو سەفەرەی (١٥) رۆژی پێچوو کە گەڕاوە هەر بەشەو گەڕایەوەو هەر هەمان کابرای لەگەڵ بوو، مامۆستا ئیبراهیم شەو بەس منی هەڵساند، ئەو شتانەی لەگەڵ خۆی هێنابووی بریتی بوو لە (٦٠) تفەنگی برنۆی تازەو لەگەڵ هەندێك دووربین و کەلوپەلیتر، مامۆستا ئیبراهیم وتی ئەو شتانە لەلای خۆت بشارەوە با کەس نەزانێ، منیش لەبنەبانی ئەشکەوتەکە جێگایەکم تەرخانکردبوو بۆ چەك و تەقەمەنی شتەکانم لەوێ شاردەوە، بۆ بەیانی

هەموومان چووینە لای مامۆستا ئیبراهیم بۆ بەخێرهاتنەوەی، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لەپشیلە رەشی پرسی وتی زۆر ئاگاتان لەپشیلە رەش بێ وتی: لەنزیک ماوەت لەگوندێك بووین و میوانی ماڵێك بووین خاوەن ماڵەکە منی نەدەناسی وایدەزانی کاروانچیم پرسیارم لەخاوەن ماڵەکەکرد لەبارەی بنکەی مالومە، کابرای خاوەن ماڵ وتی دەڵێن حەمید رەشاش لەبنکەی مالومە پشیلەیەکی رەشی هەیە نامە بۆ بنکەکانیتری دەبات و دەشی هێنێتەوە.

## پشیلەی رەش بۆ کێ بەجێ دەمێڵی؟

دوای گەڕانەوەی مامۆستا ئیبراهیم بێتەل و پاتری و ماتۆڕی شەحنکردنمان بۆ هات، بێتەل دانراو ناوی بنکەی بێتەلی مەکتەبی سیاسیی پیرمان بوو، پۆلیسێکی فیرار کاری لەسەردەکرد ناوی شێخ محەمەد بوو هەر لەپاش گەڕانەوەی مامۆستا ئیبراهیم دەرگای سنووری ئێران کرایەوە هەموو جۆرە ئازوقەو کەلوپەلی پێویست بەقافڵە بۆ شۆڕش دەهات، بۆ عەمبارکردنی ئەو کەلوپەلانەی لەئێران بۆمان دەهات حزب چەند عەمبارێکی گەورە گەورەی دروستکرد لەخوار گوندی (ئاو کورتێ)، لێپرسراوی عەمبارەکان مامۆستا نوری ئەحمەد تەهاو سەدیق فەندی بوون، لەبەهاری ۱۹٦۳ گفتوگۆ دەستیپێکرد لەنێوان سەرکردایەتی شۆڕش و حکومەتی عێراق، ئەو کاتە جەنابی مام جەلال سەرۆکی وەفدی شۆڕش بوو بارزانیش هاتە شاری کۆیە خۆی و لەشکرەکەی، من ئەوکاتە (۱٥) تفەنگم لەتفەنگە برنۆیە تازەکانی مامۆستا ئیبراهیم ئەوەی لەگەڵ خۆی لەتاران هێنابووی بردمن بۆ بارزانی لەگەڵ دوو بار قوماش، لەسەرەتای مانگی (٦) بوو

بارەگای مەکتەبی سیاسی گوازراوە بۆ گوندی (عیساویٚ) منیش بەفەرمانی مەکتەبی سیاسی گوازرامەوە بۆ بنکەی حاجی قەڵا لەکاتی دوعابوونم لەماموٚستا ئیبراهیم و ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و پێشمەرگەکان خواست، ماموٚستا ئیبراهیم بەپێکەنین فەرمووی (پشیلەی ڕەش بۆ کیٚ بەجیٚ دەهێڵی؟) منیش وتم (پشیلەی ڕەش پێشکەشە بەکاك هەڵوی کورت) من هەرماوەی (٢) مانگە لەحاجی قەلا مامەوە دووبارە ماموٚستا ئیبراهیم منی داواکردەوەو گەڕامەوە بارەگای مەکتەبی سیاسی و کرام بەلێپرسراوی ئیدارەی ئەکادیمی شۆڕش لەگوندی (عیساویٚ) لەساڵی ١٩٦٤ گفتوگۆ لەنێوان حکومەتی عیراق و بارزانی دەستیپێکرد، پاشان بارودۆخ ئاڵۆزبوو کۆنفرانسی ماوەت بەستراو دواتر من لەگەڵ کاك عومەر دەبابە لەگوندی کونە ماسی بووین هێرۆ خان هاتە گوندی کونە ماسی لەسلێمانی هاتبوو دەچووە ماڵی باوکی ئەوکاتە لەگوندی ئاوکورتیٚ بوو.

## پیاوێکی قسەخۆش و خوێن شیرین بوو

ماموٚستا ئیبراهیم ئەحمەدو ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی چەندجاری بۆ گفتوگۆکردن بچوونایە لای بارزانی منیشیان دەبرد لەگەڵ خۆیان وەکو حیمایە من نامەویٚ لەسەر باسەکە بڕۆم و کۆنە برینان بکوڵێنمەوە، بەڵام دەبیٚ ئەوە بڵێم من ئەو ماوەیەی لەگەڵ ماموٚستا ئیبراهیم بووم ڕۆژێك نەم دیت خۆیان جیابکەنەوە لەگەڵ پێشمەرگەکان جا چ لەڕووی خواردن و جلوبەرگ و پارەو پوڵ، ماموٚستا ئیبراهیم پیاوێکی قسەخۆش و خوێن شیرین بوو ڕۆژێك نەمدیت بەتووڕەیی قسە لەگەڵ پێشمەرگەیەك بکات، زۆر کەسێکی بەئیداریو دڵسۆزی کوردستان بوو، بەداخەوە لەپاش چوونمان بۆ

هەمەدان من لەمامۆستا ئیبراهیم دابڕام تا لە ساڵی ١٩٦٧ جارێکیتر بەدیداری شادبوومەوە کەبارەگای مەکتەبی سیاسیی لەبەغدا لەشەقامی (٥٢) بوو من ئەو زانیاریانەم هەر لەیادماوە چاوەڕوانی ئەوە بووم منداڵەکانی داوام لێبکەن و ئەو مێژووە گرنگەیان بۆ باس بکەم بەڵام وا پیربووم و کەس نەیپرسی، بۆیە وام بەباشزانی بەهەر شێوەیەك بێ بیدەمەوە دەست هێرۆخان لەگەڵ ئەوپەڕی رێزم بۆ مامۆستای هەمیشە زیندوو و هەموو منداڵەکانی خوشکی گەورەم گەلاوێژ خان.

لەکۆتایی نووسیکەم داوا لەبنەماڵەی خوالێخۆشبوو مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد دەکەم ئەشکەوتی مالومە بکەن بەشوێنێکی گەشتیاریی هەر بەناوی بارەگای مەکتەبی سیاسیی، منیش ئامادەم تا ماوم جێگایەکە وەکو ئەو کاتە چۆن دروست کرابوو وای لێبکەم.

# کورتەیەك لە
# خەباتی تێکۆشەری نەمر ئەنوەر جۆخین

بەداخەوە، هەرناوەناوە یەکێك لەشۆڕەسوارەکانی شۆڕشی ئەیلول لێمان دادەبڕێ، کاك ئەنوەر جۆخین یەکێکە لەوانەو خەباتێکی زۆر و خزمەتێکی زۆری بەوڵات کردووە، کەئەوەش سامانێکی گەورەیە بۆ بنەماڵەو هەڤاڵەکانی.

خوالێخۆشبوو ناوی (ئەنوەر ڕەشید قۆیتاس) بوو ناسرا بوو بەئەنوەر جۆخین، ساڵی ١٩٢٨ لەشاری هەولێر لەدایکبووە، لەعەشیرەتی گەردی زراری–یەو لەبنەڕەتدا خەڵکی گوندی (شەویتە)ی ناوچەی هەکاری کوردستانی باکورن، لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهانی مام قۆیتاس و خونچەخانی خوشکی بەئاوارەیی هاتوونەتە کوردستانی عیراق و لەشاری هەولێر جێگیربوون.

کاك ئەنوەر لەسەرەتای لاویدا بۆتە پۆلیس، لەساڵانی پەنجاکاندا چۆتە ناو ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و لەکاری سیاسیدا هێندە کاراو دڵسۆز بووە بۆتە جێگای باوەڕو متمانەی حزب.

### * بەر لەشۆڕش

پێش سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلول مەفرەزەکی چەکدار لەشاخی سەفین درووستبوو کەدواتر بووە بناغەی شۆڕشی ئەیلول، مەفرەزەکەش پێکهاتبوو لەدانیشتووانی گوندی کاوانیان و گوندی حوجران و ئەندامانی حزب

لەناوچەی شەقڵاوە بەسەرپەرشتی مامۆستا مەلا عەولا و مامۆستا شەمسەدین موفتی.

حزب بۆ بەهێزکردنی مەفرەزەکەو هاوکاری کردنیان، داوای لەچوار ئەندامی دڵسۆزی خۆیکرد کەپۆلیس بوون دەست لەکاری پۆلیسی هەڵبگرن و بچنە ناو ڕیزەکانی هێزی سەفین، ئەوانیش فەرمانی حزبیان بەجێهێناو لەمانگی ئابی ١٩٦١ پێش دەستپێکردنی شۆڕش چوونە شاخی سەفین و بوونە پێشمەرگە، کەبریتی بوون لە: عەریف سلێمان، ئەنوەر جۆخین، ڕەشید شێرە، عەبدولڕەحمان مەلاقادر.

ئەو مەفرەزەیە حکومەتی هەراسانکردبوو لەناوچەی شەقڵاوە، دەستی باشیان لەدوژمن دەوەشاند، لەچالاکییەکدا لەنزیك گوندی حوجران جێگری موتەسەریف (جێگری پارێزگار)ی هەولێریان گرت و پاشان گۆڕیانەوە لەگەڵ دیلەکانی حزب.

ڕۆژی ١٩٦١/٨/٢٤ کاك ئەنوەر جۆخین و کاك سابیر قادر و کاك سەمەد محەمەد چوونە ناو مەخفەرەکەی گوندی (قەڵاسنج) و قسە لەگەڵ پۆلیسەکان دەکەن بۆ ئەوەی ئەوانیش بچنە ناوڕیزی چەکدارانی سەفین، کاك ئەنوەر بەپۆلیسەکان دەڵێت: براینە جۆخینی شەڕەف لەسەفینە، وای بۆنەوکەسەی زووتر خۆی دەگەینیتە ئەوجۆخینەی، ئێوەش تا زووە وەرن بەشداربن.

پۆلیسەکانی ناومەخفەرەکە بەقسەی کاك ئەنوەر دەکەن و هەموویان لەگەڵی دەچن، ئیتر بەوهۆیەوەو لەسەرەتای شۆڕشدا، ناسناوی (جۆخین) بەسەر کاك ئەنوەردا بڕا.

کاك ئەنوەر کەسێکی قسەخۆش و قسەزان و پێشمەرگەیەکی ڕەشید بوو، خۆشەویستی هەمووان بوو، سەرەتای ساڵی ١٩٦٢ لەکاتی دامەزراندنی هێزی

پێشمەرگەی کوردستان کە ئەوکاتە تەنیا ٢٠٠ پێشمەرگە هەبوو لەناوچەی سۆران، ناوی دەست و پەل و لق دانرا لەگوندی ڕیزینە و کاک ئەنوەر کرایە سەرپەل، هەرهەمان ساڵ ماوەیەك بووە سەرۆکی پاسەوانەکانی بەڕێز مام جەلال، منیش بوومە سەرۆکی پاسەوانانی (م.س).

پاسەوانەکانی مام جەلا ژمارەیان ٩ پێشمەرگە بوون ئەمەش ناوی بەشێکیانە: ئەنوەر جۆخین- سەردەستە، بەکری حەلاو، سەلامی مەلا سابیر، عونیل، قالە سوور، عومەر سام سام، مام عەوڵا، ساڵی ١٩٦٣ش لێپرسراوی بنکەی گوندی ئەشکەوسەقا بوو.

ئەنوەر جۆخین لەزۆر شەڕی گەورە بەشداری کردووە، لەوانە: شەڕی چیای سورکێو-ساڵی١٩٦٤ کەرۆڵی پاڵەوانی تێدابینی.

* ڕووداوەکەی هەمەدان

ئەنوەر جۆخین پێشمەرگەی هەمەدانە، لەوێش حکومەتی ئەوسای ئێران ئەم پێشمەرگانەی هەڵبژارد و لەخاکی ئێران دەریکردن ( د.حەسەن ئیسماعیل، ئەنوەر جۆخین، حەمید ڕەشاش، خالید ئاژگەیی، ئەو دەرکردنەکەش لەبەر ئەم هۆکارەبوو: گۆڕەپانێکی گەورە لەناوەندی شاری هەمەدان بوو، لەناوەڕاستی گۆڕەپانەکە پەیکەرێکی شای ئێران هەبوو بەسواری وڵاخەوە، کۆڵانێك بەرامبەر کلکی پەیکەری وڵاخەکە هەبوو ئێمە ناومان نابوو(کۆڵانی کلکی شـای)، ئیتر لەبەر ئەمە شتێکیان بۆدرووستکردین کەئێمە بیرو باوەڕی کۆمەنیستیمان هەیە، سەرەتا زیندانییان کردین و ویستیان لەڕێگەی پێنجوێنەوە بماندەنەوە دەست حکومەتی عیراق، بەڵام ئێمە بڕیارمان دا پێش ئەوەی تەسلیممان بکەنەوە

هەر چوارمان خۆمان بکوژین، ئیتر حکومەت بڕیارەکەی گۆڕی و لەسنووری ناحیەی باسنێ ئاودیوی عیراقی کردینەوە.

ئەو کاتەش ناحیەی باسنێ لەدەست هێزەکانی بارزانی دابوو، ئێمەش کەلە هەردوو حکومەتی عیراق و ئێران قاچاغ بووین و لەگەڵ هێزەکانی بارزانیش نەیار بووین و ناوەکانمان ناسرابوو، بۆیە ناوەکانی خۆمان بەم شێوەیە گۆڕی: د.حەسەن ـ ئەحە هێڕ، ئەنوەر جۆخین ـ ڕەفیق، حەمید ڕەشاش ـ شەریف، خالید ئاژگەیی ـ ڕەزا.

ئیتر بڕیارماندا هەر لەکێوەکان خۆمان بشارینەوە، وەرزی بەهار بوو زۆر سەرمامانبوو، بڕیارماندا شەوان بچینە ناو گوندەکان بۆنان پەیدا کردن و ماوەی سێ مانگ ئێمە هەر شەوەی لەسەر کانییەك بووین، پارەمان نەبوو بەناچاری (مازوو)مان لەدرەختەکان دەکردەوەو بەپارەکی کەم دەماندا بە حەمەد ئاغای گوندی دوونێز، ئەوگوندە سەر بەئێران بوو، پارەکەمان بەشی هەندێك پێداویستی کەمی دەکرد، وەك: توتن و پەڕەسیگار و سابوون و ... هتد، ئەوە ژیانی ئێمە بوو تاهێزەکەمان لەهەمەدان گەڕایەوە، لەو ماوەیەشدا بۆ پاراستنی خۆمان توانیمان بەهۆی شێخ حەسەن بۆسکانی–یەوە دوو تفەنگ پەیداکەین. جا ئەوە بەشێکی کەم بوو لەجۆخینەکەی خەباتی کاك ئەنوەر.

بەداخەوە ئەو پێشمەرگە قارەمانە، ڕۆژی ٢٠١٢/٧/٢٤ماڵئاوایی لەهەموومان و کوردستان کرد، بەڵام ئەوەی مایەی خۆشحاڵییە کاك ئەنوەر هەرسێ کوڕەکەی (لیوا عەزیز جۆخین، زاهیر جۆخین، هیوا جۆخین) بەگیانی کوردایەتی و کوردپەروەری پەروەردە کردووەو ئەوانیشن ناسنامەی باوکیان پاراستووە.

## بیرەوەریی ٤٦ ساڵیادی شەهیدبوونی حەمە ئەمینی مام کەریم قەمچوغەیی

لەوەتەی من دونیام وەبیر دێت و تادەگاتە ئەمڕۆش، دانیشتوانی کوردستان بەردەوامن لەخوێن بەخشین و شەهیدبوونی ڕۆڵەکانیان لەپێناو بەرگری لەخاك و کوردستانێکی سەربەخۆ، جا دانیشتوانی گوندی قەمچوغەش پێشەنگ بوونە لەشەهیدبوونی ڕۆڵەکانی لەپێناو ڕزگاری کوردستان.

ئەوەتا یەکەم شەهیدی گوندەکەشیان شەهیدی نەمر حەمە ئەمین مام کەریم بوو، ئەم گوندە سەر بەناحیەی سورداشە، سورداشیش سەر بەقەزای دوکانە، شەهید حەمەد ئەمین مام کریم لەساڵی ١٩٢٨ لەگوندی قەمچوغە لەبنەماڵەیەکی جوتیار لەدایکبووە، هەر لەگوندەکەی خۆیان خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە، بەڵام لەبەر هەژاری و کاسبی نەیتوانیوە بەردەوام بێت لەسەر خوێندن.

لەساڵی ١٩٦٢ من لەگەڵ بەڕێز مام جەلال چووینە گوندی قەمچوغە، شەو میوانی ماڵی کاك حەمەدئەمین بووین، ئەوە سەرەتای ناسینم بوو لەگەڵ کاك حەمە ئەمین، لەکاتی قسەکردندا وا دیار بوو کاك حەمەد ئەمین و مام جەلال پێشتر یەکترییان دەناسی، ئەو کاتەی من باسی دەکەم حەمەد ئەمین مام کریم ئەندامێکی چالاکی حزب بوو لەگەڵ شەهید مەلا ڕەسوڵ هەڵەدنی کەدەکاتە باوکی حاکم فەرهاد، هەردووکیان لەیەکێتی جوتیاران کاریان دەکرد، بەداخەوە مەلا ڕەسوڵ پاشتر شەهید کرا.

لەساڵی ١٩٦٢ ئێمە لەگەڵ بەڕێز مام جەلال بۆ ئەوە چووبوینە ماڵی کاك حەمەد ئەمین مام کریم کەوا کاك حەمەد ئەمین و ئەندامانی حزب و خزمانی کاك حەمەدئەمین هاوکاریمان بکەن لەکاتی گرتنی مەرکەزەکەی پۆلیسی دوکان، جا بۆرۆژی دووەم بۆ دیاریکردنی شوێنی شەڕکردن ئێمە لەگەڵ کاك حەمە ئەمین چووینە سەری شاخی سارا، ئەوشاخە ئەوەندە بەرزە ماڵبەماڵی دوکانی لێوە دیارە، بەڵام بەپێی لێکدانەوەی بەڕێز مام جەلال ئەو شەڕە لە بەرژەوەندی ئێمەدا نەبوو، لەبەرئەوەی زەرەرمان زۆرتر بوو لەقازانج، بۆیە پلانەکەی گرتنی مەرکەزی دوکان دواخراو هەر لەو سەفەرەش بوو مام داوای لە کاك حەمەئەمین کرد پەلێك پێشمەرگە پێکبێنێ و بێتە ریزی پێشمەرگایەتی، لەپاش ئەوەی ئێمە گەڕاینەوە بۆ چەمی رێزان، کاك حەمەد ئەمین پەلێك پێشمەرگەی پێکهێناو هاتە پاڵ لەشکرەکەی مام جەلال.

کاك حەمەئەمین کەسایەتییەکی دیارو ناوداری دۆڵی سورداش بوو، پیاوەکی قسەخۆش و قسەزان و بەهەڵوێست بوو، ڕاستگۆو خاوەنی قسەی خۆی بوو، کاك حەمەئەمین خۆشەویستی مام جەلال بوو، لەکاتی کۆڕوکۆبوونەوەکان قسەکانی کاك حەمەئەمین لەلای مام بەهەند وەردەگیرا، کاك حەمەئەمین لەبەشی هەرە زۆری شەڕەکاندا بەشدار دەبوو و لەگرتنی مەخفەرەکەی قەشقۆڵی رۆڵی باڵای هەبوو. کاك حەمەئەمین جگە لەوەی پێشمەرگەیەکی زۆر ئازاو بەجەرگ بوو، لەبواری هونەریش زۆر بە توانا بوو گەلێك سرووودی نیشتمانی و چیرۆکی خۆشی لەبەر بوو، دەنگەکی شیشی هەبوو.

کاك حەمەدئەمین هەموو مەرجەکانی پیاوەتی و نەتەوەیی تێدا بوو، من و ئەو زۆر برادەر بووین، ماوەیەکی زۆر بەیەکەوە بووین، خۆی و بەشێك لە

پێشمەرگەکانی و دوو ئامۆزای بەناوەکانی ئەبو بەکر غەفوور و حەکیم حەمەرەش لەگەڵ هێزەکەی باڵی مەکتەبی سیاسی پ.د.ك لەساڵی ١٩٦٤ هاتنە هەمەدان، لەپاش گەڕانەوەشمان بۆ کوردستانی خۆمان لەساڵی ١٩٦٦، کاك حەمەئەمین کرا بەسەرلق لەهێزەکەی مام جەلال، باشترین سەر لق بوو لەکاتی شەڕەکان لە ریزی پێشەوە بوو، بەر لەشەهیدبوونی، لە شەڕێکی قارەمانانەدا بە سەختی بریندار بوو لەپشتی گوندی گەورەدێ، ئەوکاتە کاك حەمە ئەمین ماڵی لەبەکرەجۆبوو.

بەداخەوە ئەو قارەمانە لەرۆژی ١٩٦٩/٨/٧ لە کۆتەڵ شەهید کرا، شەهید لەدوای خۆی هاوسەرەکەی و چوار کوڕو دوو کچی بەجێهێشت بۆ کوردستان، منداڵەکانی ئێستا ماڵیان لەگوندەکەی خۆیانەو بەردەوامن لەسەر رێبازەکەی باوکیان.

جێگای داخە ئەو شەهیدە دێرین و قارەمانە خانەنیش کراوە بەبێ ئەوەی پلەی شەهیدی سەنگەری پێ بدرێت، هەروەها وەك باقی شەهیدەکانی دیکە کەپارچە زەویی نیشتەجێبوونیان پێدەدرێت، وارسەکانی ئەوشەهیدە زەویی نیشتەجێبوونیان پێنەدراوە.

لەکۆتاییدا دەڵێم هەزار رەحمەت لەگیانی کاك حەمەئەمین و هەموو شەهیدانی کوردستان.

### باسی دەستپاکی پێشمەرگە دەکەم

لە ڕۆژی ٢٠١١/٩/١١ لەشاری هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستان لەکوردستان تیڤی ئاهەنگێکی شکۆداری مێژوویی یۆبیلی زێڕینی شۆڕشی ئەیلولی پیشاندا، لەو ئاهەنگە پیرۆزەدا چەند پێشمەرگەیەکی دێرینی

شۆڕشی ئەیلول بەخەریتەو تفەنگی برنۆ لەریزی پێشەوە دانیشتبوون، هەر پێشمەرگەو ئاڵایەکی کوردستانی لەدەستبوو، بەبینینی ئەو دیمەنەو ئاڵوگۆڕکردنی پەیامی شۆڕشی ئەیلول لەگەڵ نەوەکانی ئێستامان منیش وەك پێشمەرگەیەکی سەرەتای شۆڕشی ئەیلول رۆژانی پێشمەرگایەتی خۆم بیرهاتەوەو خۆم رانەگرت قورگم پڕ بوو لەگریان و ئەو دیمەنە منی گەڕاندەوە بۆ ساڵانی ١٩٦١-١٩٦٣ وامدەزانی گەنج بوومەتەوەو وەك جاران رەشاشەکەم لەدەستەو پێشمەرگەم، کە هاتمەوە سەر خۆم زگم بەخۆم سووتاو لەدڵی خۆم بەقورگی پڕ لەگریانەوە دەموت لەکاتی شۆڕشی ئەیلول هەموو دانیشتوانی کوردستان یەکگرتوو بووین، یەك بیروباوەڕ بووین جیاوازیمان نەبوو، خۆ منیش پێشمەرگەی سەرەتای شۆڕشی ئەیلولم و یەکەم سەرباز بووم لەلیوای هەولێر چوومە ناو ریزەکانی پێشمەرگەی کوردستان لە ١٩٦١/٩/١٦بۆچی من و بەشێك لەهەڤاڵەکانم بەشدار نەکراوین لەم یادە پیرۆزە؟ بەڵام وا دیارە ئێمەش لەبەر ململانێ و بیروڕای جیاواز بووینە چەند بەشێك و لێکدابڕاوین و شۆڕشی ئەیلول بەتەبایی و برایەتی ناوبانگی هەیەو با ئێستاش بەکردەوە وابین.

جا هەر بەبۆنەی ئەم یادە پیرۆزە باسی چەند کاروچالاکییەکی مێژوویی سەرەتای شۆڕشی ئەیلول دەکەم بەبێ زیادو کەم وەك خۆیان دەیگێڕمەوە، پێش دەستپێکردنی شۆڕش جەیش زۆر لە لەشکری کوردستان دەترساو لەشکری کوردستانیش لەجەیش دەترسا کە شۆڕش دەستپێکرد هەردوولا ترسیان لەیەکتر شکاو شۆڕشی ئەیلول لەسفرەوە دەستپێکرد هەموو سەروەت و سامان و پشت و پەنای شۆڕشی گەلی کورد یەکگرتوویی بوو، یەکەم شەڕیش لەگەڵ جەیشی عیراقی لەناوچەی سۆران قەزای رانیە بوو

لەرۆژی ١٩٦١/٩/١٥ لەبناری کێوەڕەش لەنزیك گوندی سیداوە، من سەرباز بووم لەگەڵ شەڕەکەدا، رۆژێك پێش پێشمەرگایەتیم بوو لەو شەڕە ١٣ لۆری کەوتە دەستی لەشکری کوردستان و خەسارەتی گیانی نەبوو، بۆ رۆژی دووەم واتە ١٩٦١/٩/١٦ حکومەت بەهێزێکی زۆرتر بەپاڵپشتی تۆپی گەورەو فرۆکەی جەنگی هێرشیان کردە سەر لەشکری کوردستان تا پێش رۆژئاوا شەڕ بەردەوام بوو، جەیشەکە شکاو پاشەکشەی کرد لەشکرەکەی کوردستان بەسەرکردایەتی حسێنی بۆسکێن بوو جەیشەکەش بەسەرکردایەتی عەقید کاف محەمەد نەبەوی بوو لەو شەڕە ئەفسەرێك کوژرا ناوی رئیس حەسەن وایلی بوو هەر ئەو رۆژەش بوو لەکاتی رۆژئاوا من چوومە ناو ریزی لەشکری کوردستان و خۆم و رەشاشەکەم و دیلێکیشم لەگەڵ خۆم رزگارکرد کە ناوی عەولا بوو خەڵکی گوندی بەردە کۆز بوو.

شەڕی یەکەمیش لەناوچەی بادینان لە ١٩٦١/١٢/١٣ بوو لەگەلی زاوێتە بەسەرکردایەتی بارزانی بوو لەو شەڕە عەسکەرێکی زۆر کوژراو چەك و تەقەمەنی زۆر کەوتە دەست لەشکری کوردستان، ئەو شەڕە دەنگی دایەوەو ئەو دوو شەڕە لەسەرەتای شۆڕش بوون.

لەکاتی شۆڕشی ئەیلول نە ئۆتۆمبیل هەبوو بۆ هاتوچۆ نەکەرەستەی پەیوەندی هەبوو هەموو بەپیادە بوو، ئێستا دەربارەی دەستپاکی و دڵسۆزی پێشمەرگەی کاتی شۆڕشی ئەیلول باس دەکەم، لەکۆتایی مانگی ١٢ی ١٩٦١ بەسەرکردایەتی پێشمەرگەی قارەمانی گەلەکەمان بەرێز مام جەلال ٣١ هەزار دیناری عیراقی لەرێگەی هەولێر-کۆیە لەنزیك گوندی شێخەروان گیرا ئەو پارەیە بۆ هەڵگرتن دابەشکرابووە سەر پێشمەرگەکان لەپاش دوو شەو لەگوندی رێزنە حساب کرا فلوسێك کەمی نەکردبوو هەر لەبارەی دەستپاکی

پێشمەرگە لەمانگی چواری ١٩٦٢ بەسەرکردایەتی بەڕێز مام جەلال مەرکەزی قەزای پێنجوێن گیرا ١١ هەزار دیناری عیراقی لەناو مەرکەزەکە گیرا ئەو پارەیە لەناو جەمەدانی دابوو هەر شەوەو لەلای پێشمەرگەیەك بوو لەپاش مانگێك گەڕاینەوە چەمی رێزان پارەکەمان ژمارد فلوسێك کەم نەبوو، ئەوەش دوو نموونەی دەستپاکی بوو.

ئێستاش باسی چەند سەفەرێك دەکەم تەنها بۆ مێژوو باسیان دەکەم:

١. لەمانگی ١٩٦٢/٦ ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لەچەمی رێزان بوون ئەوکاتە مەکتەبی سیاسی لەم سێ بەڕێزانە پێکهاتبوون:

*مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێری مەکتەبی سیاسی.

*مامۆستا نوری شاوێس ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوو.

*مامۆستا عەلی عەبدوڵڵا ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوو.

مام جەلال بۆ پاراستنی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی منی دانا وەك سەرۆکی پاسەوانان، نۆ پێشمەرگەم لەگەڵ بوو ئەندامانی مەکتەبی سیاسی سەفەریان کرد بۆ لای بارزانی ئەو کاتە بارزانی لەناوچەی باڵەکایەتی دەرەوەی مەرکەزی پۆلیسی رایەتی گرتبوو، ئەو سەفەرە یەکەم سەفەری مەکتەبی سیاسی بوو بۆ لای بارزانی ئێمە هەموومان بەپێ لەچەمی رێزان چووینە حاجی ئۆمەران لەو سەفەرە مام جەلالیش لەگەڵمان بوو لەبێتواتەش مامۆستا مەلا عەوڵاش لەگەڵمان هات، ئەوکاتەی چووینە ناوچەی باڵەکایەتی لەدوو لاوە شەڕ زۆر گەرم بوو لەلای رەواندز حکومەت هێرشێکی گەورەی بەهەموو جۆرە چەکێکی ئەو سەردەمی دەکردە سەر هێزەکانی بارزانی لەلایەکی تریش لەناوچەی سیدەکان و لۆلان لەگەڵ عەشیرەتی برادۆست و

بەشێك لەعەشیرەتی هەرکیەکان، بەڵام بەبیروباوەڕی ئەوکاتەی پێشمەرگەی کوردستان توانیان هەردوو هێزەکانی دوژمن بشکێنن، ئەو شەڕە زۆر درێژەی کێشا تا گەڕاینەوە هەر بەردەوام بوو ئەو ماوەیەی ئێمە لەحاجی ئۆمەران بووین هەمووومان بەئاوات بووین زیارەتی بارزانی بکەین، هەمووومان داوامان لەمام جەلال کرد دەبێت وا بکەی بارزانی ببینین، مام جەلال مۆڵەتی بۆمان وەرگرت زیارەتی بارزانی بکەین، شەو بوو لەگەڵ مام جەلال چووینە خزمەتی بارزانی، بارزانی زۆر بەخۆشی پێشوازی لێکردین، لەکاتی تەوقەکردن مام عەولای پێشمەرگە نیازی وابوو دەستی بارزانی ماچ بکات، بەڵام بارزانی قبوڵی نەکردو هەندێکیش ناڕازی بوون بەو هەوڵدانەی مام عەولا ئێمە ماوەی ١٠ دەقیقە لەلای بارزانی دانیشتین و گەڕاینەوە.

٢. سەردانی دووەم بۆ لای بارزانی لەبەهاری ١٩٦٢ بوو ئەوکاتە بارەگای مەکتەبی سیاسی لەئەشکەوتی گوندی مالومە بوو من لێپرسراوی بنکەی مالومە بووم لەم سەفەرەم ١٥ تفەنگی برنۆی تازەو دووبار قوماش و بڕێك پارەم بۆ بارزانی برد ئەوکاتە بارزانی لەشاری کۆیە بوو کاتی گفتوگۆ بوو لەگەڵ حکومەت.

٣. سەردانی جاری سێیەم لەسەرەتای هاوینی ١٩٦٣ بوو ئەوکاتە شەڕ لەسەرانسەری کوردستان زۆر گەرم بوو کاتی حەرەس قەومی بوو جەنابی بارزانی ئەوکاتە خۆی و لەشکرەکەی لەشەڕدابوون لەچیای پێرس ئەو سەفەرەش لەمالومەوە بەپیادە چوومە ناحیەی بلێ ئەوکاتە بارزانی لەگوندی سەفتان بوو لەو سەفەرەم هەندێك پارەو چەند نامەی گرنگم لەگەڵ خۆم بۆ بارزانی بردبوو ئەوکاتە لوقمانی کوڕی بارزانی لەسەر قایەغەکەی بلێ بوو ئەو منی پەڕاندەوەو جێگای بارزانی بەمن وت کە چوومە لای بارزانی

لەگوندی سەفتان شەو بوو شتەکانمدا بەبارزانی و شەویش چەند پرسیارێکی لێکردم لەبارەی شەڕ منیش وەڵامم دایەوەو لەپاشان فەرمووی هەر لەگەڵ بارەگای خۆمبە بەدوات دەنێرم من ماوەی دوو ڕۆژ لەبارەگای بارزانی مامەوە لەبەر توندوتیژی بۆمبارانی فڕۆکەو تۆپی گەورە هەر شەوەو لەجێگەیەك بووین هەر ئەوکاتەی من لەبارەگای بارزانی ئەمر بووم لەسەر چیای پێرس سێ پێشمەرگەی ناودار شەهیدکران یەکێکیان ناوی مەلا شێن بوو ماوەی دوو شەو لەبارەگای بارزانی مامەوە لەپاش دوو ڕۆژ بارزانی داوای منی کرد کە چوومە لای وەڵامی نووسراوەکانی دامەوە ئەوکاتە کاك مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێم گەنجێکی منداڵ بوو تفەنگێکی برنۆی درێژی لەشان بوو لەنزیك باوکی راوەستابوو، بەڵام تا من گەڕامەوە فڕۆکە قایەغەکەی شکاندبوو، بۆیە بەچووپی تایەی تراکتۆر پەڕیمەوەو گەڕامەوە بۆ مالومە.

## شۆڕشی نوێ،
## شۆڕشی گەلی کوردستانەو مێژووشی دیارە

ئەو شۆڕشە لەکاتو ساتەکی وا سەریهەڵدا، ڕۆناکی سەرهەڵدانی شۆڕش لەدڵی کورد نەمابوو، ڕاگەیاندنی شۆڕشی نوێ، کوردی بوژاندەوەو هیواو ئاواتی خستەوە ناو دڵی هەموو کوردێك لەکوردستان. بەڕاستی ئەوکاتە ڕاگەیاندنی شۆڕش ئەوەندە کارەکی ئاسان نەبوو. لەکاتی سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلول تاساڵی (١٩٧٠)، گوندەکانی کوردستان وەکو خۆیان مابوون، من دەڵێم هەردوو شۆڕش، شۆڕشی میللەتی کوردە، با وەکو خۆی باسیان بکەین، دەبا غەنە نەدەینە دوژمنانو بۆ بەرژەوەندیی تایبەت مێژووی شۆڕشەکانمان بەشێواوی باسی بکەین، دەبا گرنگیی بەڕۆڵی گوندنشینەکانو چینی هەژار بدەین، هەر ئەوان بوون بەسەرو ماڵ بوونە سوتەمەنیی شۆڕشی ئەیلولو شۆڕشی نوێ-ش، خۆ سەرکردە کڵاوی سەخرەجنی لەسەر نەبووە بەتاقی تەنیا شەڕی لەگەڵ دوژمن کردبێ، بیر لەوە ناکەنەوە هەتا ئێستاش کۆمەڵێك پیاوی بەتەمەنو کۆنە پێشمەرگە ماونو هەردوو شۆڕشەکە ئەگەر خۆیان نەگۆڕن، زۆر باش دەزانن هەردوو شۆڕشەکە چۆن سەریهەڵداو لەچ کاتێك بووەو چ سەرکردەیەك ڕۆڵی سەرەکیی بینیووە، ئەو کەسانەی بە ناشارەزایی باسی شۆڕشەکان دەکەن، ئەوانە فێڵ لەمیللەتو مێژوو دەکەنو نەوەکانی ئێستا هەڵدەخەڵەتێنن، لەبەرئەوەی گەنجەکانمان تائێستاش مێژوویەکی ڕاستو دروست لەبەر دەستیاندا نییەو هەر چۆنێك باسی بۆ بکەن، باوەڕ دەکات.

من وەکو کۆنە پێشمەرگەکی سەرەتای شۆڕشی ئەیلول، زۆر باش دەزانم شۆڕشی ئەیلول چۆن دەستیپێکردو چۆن قۆناغەکانی بڕیو چۆن شەڕی براکوژی دەستیپێکردو کام سەرکردە ڕۆڵی جوامێرانەی هەبوو و دەشزانم کێ هەر کلکی بەشۆڕش هەڕیەساردبوو تا ئەو ڕۆژەی بەداخەوە شۆڕشی ئەیلول هەرەسی هێنا بەهاوکاریی دەوڵەتان. ئەو هەرەسهێنانەی شۆڕشی ئەیلول کارەساتێکی گەورەبوو هەموو کوردی تەزاندو هەموو کوردێك لەماڵی خۆی دەگریا، بەچاکو خراپەوە بەجاشو باشەوە، هەموو کوردەك هەرەسهێنانی شۆڕشی بەخەتەرێکی گەورە دەزانی لەسەرخۆی، من ئەوەی بەبیر سەرکردەکان دەهێنمەوە لەپاش نەمانی شۆڕش، بەهەزاران ماڵی کورد بەلۆری عەسکەریی گواسترانەوەو دابەشکران بەسەر شارەکانی خوارووی عیراق. لەپاش ئەو کارەساتە گەورەی بەسەر کوردستاندا هات، هەموو خەڵکی کوردستان ریسەکەیان بۆوە خوریو هیواو ئاواتەکانیان بڕا. هەموو کوردەك هیواو ئاواتی ئەوەبوو دەیانگوت: جارێکی دیکە دەبێ شۆڕشەك لەکوردستان سەر هەڵداتەوە؟ ئەوە ئاواتەکانی کوردبوو تا (١٩٧٦/٦/١) تروسکەو ڕووناکییەك پەیدابوو، ئەویش بەرپاکردنی شۆڕشی نوێ بوو لەگەڵ دەنگدانەوەی سەرهەڵدانی شۆڕشی نوێ هیواو ئاواتەکی نوێش گەڕاوە ناو دڵی دانیشتووانی کوردستان، شانیان دا بەرێ بەشێوەکی تازەتر شۆڕش پەرەی سەندو حزبەکانی تریش بەشداریی شۆڕشەکە بوون، هەریەکەو بەناوێك. ئێستا لەسایەی خوێنی شەهیدان واکوردستان نیمچە ئازادە، هەندەك لەسەرکردەکان لەجیاتی خزمەتی گەلو وڵات بکەن، لەبەر بەرژەوەندیی تایبەت خەریکن پشت لەمیللەت دەکەن، ئێستا ئەوەندە

بەرژەوەندیی تایبەت زۆر بووە، هەندەك کەس هەر یاری نەفسێیە لەخواردن شەریکە، بەڵام بەکردەوە تەریکە.

لێرەدا باسی کورتە چیرۆکەك دەکەم، ئەم چیرۆکە لەلایەك پەندەو لەلایەکی تریش چیرۆکی مندالآنە، واباس دەکەن دەڵێن«رۆژەك لەرۆژان کیسەڵو رێوی رێکدەکەون بەشەراکەت فەلاحەتی بکەن، لەپاش رێککەوتن، هەردووکیان دەچنە ناو زەوییەکەو کیسەڵ جۆتی دا دەبەستیو تۆی دەداو دەس دەکا بەجۆت کردن، رێویش کەندەڵانەك لەناو زەوییەکە دەبێ دەچێتە بەر سێبەری کەندەڵانەکەو کلکی دەداتە بەر کەندەڵانەکەو تەماشای کیسەڵ دەکات، کیسەڵ ماوەیەك جۆت دەکاو ماندوودەبێ بانگی رێوی دەکاو دەڵی برام من ماندووبووەمە، دەوەرە تۆش دوولات جووت بکە، رێوی بەکیسەڵ دەڵێ: ئەگەر کلکم لەبەر ئەو کەندەڵانە بکەمەوە، کەندەڵانەکە دەروخێ، جا رێوی بەو فێڵە کارناکا تا دروێنەش کراو گێرەش کراو شەنە باش تەواوبوو، رەوسەی دەغڵی پەیدابوو، رێوی چووە لای کیسەڵ گوتی با دەغڵەکە بکەینە نیوە خۆ من شەریکی تۆم، کیسەڵ گوتی ئاخر تۆ ماندوونەبووی، رێوی خۆی کردە شەریك» هیوادارم کورد بیر لەو جۆرە شەراکەتانە نەکاتەوە.

## ناحەزانی ڕا پەڕین
## خەونی جرناو فرنا بەڕا پەڕینی ۱۹۹۱ەوە دەبینن

سەرەتای هەموو کارێك بەبێ بیرکردنەوە نابێ، هەموو کەسێك کەبیر لەکارێك دەکاتەوە پلان و نەخشەی بۆ دادەنێ و هەوڵی بۆ دەدا، بەئامانج بگات، جا ئەو کارە چ کاسبی بێت چ ئاشتەواییی بێ، یان شەڕ بێت دەبێ بەرنامەی بۆ دابنێ ڕاپەڕینەکەی ساڵی ۱۹۹۱ بەبێ پلان و بەرنامە نەبوو، لێرە دا پەندەکی کوردی هەیە دەڵێ (هەر شەڕەك بۆ جوامێرەکیە)، واتە غروری و سەرکێشی سەدام وایکرد دەوڵەتی کوێت بگرێ لەئەنجامی گرتنی کوێتیش ئەمەریکا و دەوڵەتان لەسوپای عێراقیاندا، ئەو شەڕە لەبەرژەوەندی کورددا بوو، بەڵام لەپاش گرتنی کوێت ئەو ئەندازیارەی نەخشەی ڕاپەڕینی دانا، کێ بوو، جا دەبێ کورد دەستخۆشی لەو کەسەی بکات، کەبەرنامەی بۆ ڕاپەڕین دانا، جا ئەو کەسە چ تاکە کەس بێت یان لیژنەیەك بێ، یان چەند حزبەك بێت لەبەر ئەوەی ڕاپەڕین گەورەترین دەستکەوت بوو بۆ کوردستان، نازانم بۆ لەبیرمان چوو حزبی بەعس بنکەو بارەگای لەهەموو شار و شارۆچکەکان هەبوو، عەسکەریش لە هەموو کون و قوژبنی کوردستان هەبوو، ئەو هەموو بنکەو بارەگایانەی بەعسیەکان و ئەو هەموو جەیشە پڕ چەکەی سەدامی خۆ بەپێی نەخشەو بەرنامەگێران، ڕاستە ئەمەریکا پەلوپۆی سەدام و سوپاکەی شکاندبوو، بەڵام ڕاپەڕینی پێشمەرگە و میللەتی کورد گەورەترین گورزبوو، لەحکومەتی عێراق درا، بەڕاستی قسان بکەین ئێمە

لەناو شارەکان، یەکەم کەس مام جلال بوو لەڕادیۆی گەلی کوردستان بانگەوازی خۆ ئامادە کردن و پێکهێنانی شانە چەکدارەکانی کرد، لەناو شارەکان و هەموو بانگەوازەکانیش هەر لەو ڕادیۆیەوە بڵاودەکرانەوە، ئەو کاتە خەڵکانەکی زۆریش هەبوون باوڕیان بەو بانگەوازانە بوو، من ناچمە سەر باسی چۆنیەتی گرتنی شارەکان و شارۆچکەکان باسی هۆکارەکانی سەرکەوتنی ڕاپەڕین دەکەم بەم شێوەی خوارەوە:

١-ئەگەر (سەدام) کوێتی داگیر نەکردبا (ئەمەریکا و دەوڵەتان) لەعێراقیان نەدەدا.

٢-ئەگەر (ئەمەریکاو دەوڵەتان) لەعێراقیان نەدابا، ئەوە ڕاپەڕین نەدەبو لەکوردستان.

٣-ئەگەر سەرکردایەتی شۆڕش پێش وەختە ئامادەکاری بۆ ڕاپەڕین نەکردباو شانە چەکدارەکانی لەناو شارەکان پێك نەهێناباو لەڕێگەی ڕاگەیاندن میللەتی ووشیار نەکردبا، ڕاپەڕین بەو شێوەیە ڕێکوپێك نەدەبو.

٤-ئەگەر هەموو دانیشتوانی کوردستان هاوکاری پێشمەرگەو شانە چەکدارەکان نەبا بەجاشەکانیشەوە ڕاپەڕین ئەوەندە سەرکەوتو نەدەبوو.

٥-ئەگەر سەرکردەکانی یەکێتی بەپێی بەرنامە دابەش نەبووبان، بەسەر شارەکان و سەرکردایەتی پێشمەرگەو شانە چەکداریەکانیان نەکردبا هەر کەسەو لەخەتی خۆی ڕاپەڕین، ئەوەندە ڕێك نەدەبوو، بۆ نمونە باوکی (ڕێناس) ڕۆڵی سەرەکی هەبوو لەهەولێر.

٦-ئەگەر (ئەمەریکا) ڕێگای بە(سەدام)ی، نەدابا (سەدام) نەیدەتوانی دووبارە شارەکانی کوردستان بگرێتەوە .

٧-ئەگەر (سەدام) شارەکانی کوردستانی نەگرتبا کۆڕەو ڕووی نەدادا.

٨-ئەگەر کۆڕەو نە بوویا هێڵی (٣٦) دانەدەندرا.

٩-ئەگەر هێڵی (٣٦) دانەنرابا حکومەتی هەرێم دروست نەدەبوو، لەگەڵ پەرلەمان، ئەو خاڵانەی سەرەوە هۆکاری سەرهەڵدانی ڕاپەڕینن، جا ئێستا ئەوەی هەمانە ئەوە دەستکەوتەکانی ڕاپەڕینە، هەرچەند زۆر شت هەنە، بە دڵی ئێمە نیە، بەڵام ڕاپەڕین گۆڕانکاریەکی زۆر گەورە بوو، من وام دێتە بەر چاو کورد ئەگەر یەکدەست بێ ڕاپەڕینەکی تری لەپێشە با سەرکردایەتی کورد خۆیان بۆ ئامادە بکەن،پەندەکی کوردی هەیە دەڵێ ئەگەر مانگ لە(١٤)ی بێ حەوجە بەئەنگوستێ نیە، ئەگەر حکومەتی مەرکەز لەسەر ئەوکردەوانەی بەردەوام بێت.

# چمکێـک
# لەمێژووی خەباتی شۆڕشگێڕیی کورد

حکومەتی عێراق لەپاش تێکچوونی گفتوگۆو مفاوەزات لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕش لەهاوینی ساڵی (١٩٦٣) لەکاتی درونەو خەلەو خەرمان هێرشێکی سەرتاسەری کردە سەر کوردستان ئەو هێرشە هەموو ناوچەکانی کوردستانی گرتەوە حکومەت نیازی وابوو هەموو کوردستان داگیربکاتەوە، بەڵام نەیتوانی ئامانجەکانی جێبەجێ بکات، تەنها توانی ناوچەی بارزان بگرێ، حکومەت لەساڵی (١٩٦٣) تەڕو وشکی بەیەکەوە دەسوتاندو هەموو هێزو توانای خۆی بەکارهێنا، بەڵام سەرنەکەوت دوا هەوڵدانی ئەوەبوو لەمانگی (١٠)ی (١٩٦٣) هێزێکی گەورەی کۆکردەوە بەهاوکاریی لیوای یەرموکی جەیشی سوری بۆ هێرشکردنە سەر ناوچەکانی شوان و شێخ بزینی و ناوچەی ئاخجەلەر، چەمی ڕەزان، لەبەرئەوەی هێرشەکە یەکجار گەورە بوو هەموو جۆرە چەکێکی بۆ ئامادەکرا بوو حزبیش پێشوەخت ئاگاداری ئەو پیلانە بوو.

ئەگەر پێشمەرگە شەڕی کردبا ئەو شەڕە لەبەرژەوەندی کوردو شۆڕش نەبوو لەبەرئەوەی خەڵکێکی زۆر دەکوژراو زۆر گوندیش وێراندەکران سەرکردایەتی و بەڕێز (مام جەلال) بڕیاریاندا پێش ئەوەی حکومەت هێرش بکات، ناوچەکە چۆڵ بکەن، لەبەرئەوە بوو (مام جەلال) فەرمانیدا هەموو هێزی پێشمەرگە بکێشنەوە بۆ پشت شەقامی سەرەکی سلێمانی دوکان تەنها

لقەکەی ئێمە لەحاجی قەڵا مابووین و دوو پۆل پێشمەرگەشمان لەسەر قایەکەی گوندی کلێسە بوو، بۆ پاراستنی قایەکەو گوندی کلێسەو لقەکەی ئێمە، کە بەسەرکردایەتی پێشمەرگەی دێرین (سەعید مەسیفی) بوو، حکومەت پێشئەوەی هێرش بکات پێشەکی ناوچەکانی بەفرۆکەو و تۆپی دوور هاوێژ بۆمبارانکرد، دواتر هێرشە گەورەکە دەستپێکرد حکومەت هەموو ناوچەکانی داگیرکرد تا چەمی رێزانیش هاتن، بەڵام نەگەیشتنە ناو گەلییەکەی ناو چەمی رێزان جەیشی سوری لەبەرئەوەی شارەزا نەبوو بەکەیفی خۆی لەلای گوندی بۆڵ قامیشەوە تا سەر زێیەکەی دوکان هاتن لەڕاست گوندی کلێسەوە نەیاندەزانی پێشمەرگە لەکەمیندان بۆیان زۆر بەبێ ترسی سەربازەکان سواری بەلەم دەبن و هەوڵدەدەن لەئاوەکە بپەڕنەوە بۆ ئەوبەر کە بەلەمەکان دەگەنە ناوەندی ئاوەکە پێشمەرگەکان زۆر بەتوندی لێیاندەدەن و بەشێکی زۆر لەسەربازەکانی ناو بەلەمەکان دەکوژرێن، بەشێکیش لەترسان خۆیان هاویشتە ناو ئاوەکەو خنکان بەشێکی زۆر کەم قوتاربوون.

کورد دەڵێ دەست وەکەری پیرۆزە، لەگەڵ ئەو لێدانە جەیشی سوری خراپ شکاو گەڕاوە بەرەو کەرکوك لەگەڵ شکانی جەیشی سوریا هەموو هێزەکانی حکومەتیش گەڕانەوەو ناوچەکەیان چۆڵکرد، ئەو هێرشە ماوەکەی کورت بوو لەپاش گەڕانەوەی حکومەت هێزی پێشمەرگە چوونەوە جێگاکانی خۆیان و دوای تەواوبوونی هێرشەکە من خۆم و پۆلەکەم چوومە ناوچەی رانیە لەسەر داوای کاك (عومەر دەبابە) ئەوکاتە کاك عومەر فەرماندەی هێزی کاوە بوو من لەگوندی رێزینە بووم مەکتەبی سیاسی بەبروسکە داوای منیانکرد چوومە مەکتەبی سیاسی ئەوە بوو دەربارەی هێرشی جەیش لە (١٩٦٣).

# کۆچی دوایی
# پێشمەرگەی دێرین حەمە سالح عەبدوڵڵا

بەداخێکی زۆرەوە، ئێمەی پێشمەرگە دێرینەکانی سەرەتای شۆڕشی ئەیلول هەر ناوەناوە هەڤاڵێکی خۆشەویستمان ماڵئاوایی دەکات و لێمان جیا دەبێتەوە، ئەو جیابوونەوەو لێکترازانە هەموومان نیگەران دەکات، بەڵام ئەوەش کاری خوایە و ڕێگای هەموومانە، بەڵام نابێ ئەو هەموو خەبات و فیداکارییە و پێشمەرگایەتی و قارەمانەتی شۆڕەسوارێکی وەك كاك (حەمە سالح) بەئاسانی لەبیر بکرێ.

من وەك هاوسەنگەر و هەڤاڵێکی دێرینی كاك حەمە سالح بەئەرکی سەرشانی خۆمی دەزانم کورتەیەك لەبارەی خەبات و پێشمەرگایەتی و فیداکارییەکانی بنووسم.

كاك حەمە سالح پێش سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلول، پۆلیس و ئەندامێکی کاراو دڵسۆزی حزبیی ئەو کاتە بوو، ئەوکاتەش حزب پێش شۆڕشی ئەیلول مەفرەزەیەکی چەکداری هەبوو لە شاخی سەفین بەسەرکردایەتی كاك (شەمسەدین مفتی و مامۆستا مەلا عەولا).

كاك حەمە سالح نائیب عەریفی پۆلیس بوو لەسەرای هەولێر، شەوی ۱۹٦۱/۸/۱۸ ئامر حەرەس دەبێ، بۆیە هەموو ئەندامەکانی حزب لەگەڵ خۆی دەکاتە حەرەس و هەر ئەو شەوە بەهاوکاری هەڤاڵەکانی توانیان هەموو ئەو چەك و جبەخانەی سەرای هەولێر لەئۆتۆمبێلێکی جۆری (جێب)

بارکەن و بیبەن بۆ هێزەکەی سەفین، پۆلیسەکانیش جگەلە حەمە سالّح خۆی، بریتی بوون لە: عەریف عوسمان، هادی شێرە، هەمزە جوبرائیل، کەریم حەسەن بەگ (شۆفێرەکەبوو )، قادر حەمەد.

لەکاتێکدا ئەو پۆلیسانە ئەو کارەیانکرد شۆڕشی ئەیلول هەڵنەگیرسابوو و کەمکەسیش هەبوو باسی شۆڕش بکات،.

لەشۆڕشیشدا کاك حەمە سالّح خۆشەویستی بەرێز (مام جەلال) بوو، یەکێك بوو لە پێشمەرگە هەرە ئازاکانی شۆڕشی ئەیلول، لە هەموو شەڕەکانی ناوپارێز و گرتنی قەزای چوارتا و گرتنی قەزای پنجوێن و ناحیەی رێدار و زۆر جێگای تر رۆڵێکی باڵای هەبوو،

هەروەها لەساڵی ١٩٦٢ لە گرتنی ناحیەی باسنێ قارەمانێتییەکی ئازایانەی زۆری هەبوو، بەگشتی فەرماندەیەکی ئازای شۆڕشی ئەیلول و لەکاتی شەڕەکاندا هەمیشە لەپێشەوە بووە.

### * کورتەی ژیاننامەکەی

ساڵی ١٩٣٢ لەگوندی (دەربەندی سەیدان)ی ناوچەی بەڕانەتی لەدایکبووە، لەتەمەنی گەنجیدا لەهەولێر بۆتە پۆلیس، ساڵی ١٩٦١ پێش سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلول روویکردۆتە شاخ و بۆتە پێشمەرگە لەهێزی سەفین.

بەداخەوە، رۆژی ٢٠١٣/٤/١٢ لە نەخۆشخانەی رزگاری لەشاری هەولێر کۆچی دوایی کرد و لەرێو ڕەسمێکی شکۆداردا بەشداربوونی خەڵکێکی زۆری شاری هەولێر و بە ئامادەبوونی بەشێکی زۆر لە پێشمەرگە دێرینەکان و هەڤاڵانی، لە گۆڕستانی گوندەکەی، بەخاك سپێردرا.

# چەند یادەوەرییەك
# لەگەڵ مامۆستا خالید دلێر

ئەگەر بەنووسین باسی خەباتو کوردپەروەریی‌و دەستو دەروون پاکی خوالێخۆشبوو مامۆستا خالید عەبدولواحید ناسراو بە خالید دلێر برای شەهیدی نەمر جەعفەر عەبدولواحید بکەین، تەواو نابێ.

ئێوارەی ڕۆژی ٢٠١١/١٢/١٧، کاتێك لەسەتەلایتی گەلی کوردستان ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنی ئەو هەڤاڵە دێرینەی خۆم بینی، وەکو پیرەمێردێکی دڵ ناسك گریانم هاتو شەهید جەعفەری برا بچووکی کاك خالیدو سالآنی (٦٣و ٦٤)یشم بیرهاتەوە، کە ئەوکات بەیەکەوە لەناوچەی ماوەت بووین.

ئەوکاتە مامۆستا خالید دلێر نووسەری نووسینگەی مەکتەبی سیاسی بوو، منیش لێپرسراوی ئەکادیمیای شۆڕش بووم لەگوندی ئیساوێ، ئیشوکارەکانی منیش بەشی زۆری لەلای کاك خالید بوو، ئیدی ئێمە پێکەوەبووین‌و لەیەکتر دانەبڕاین تاساڵی ١٩٦٤ چووینە هەمەدان‌و خۆمان ڕێکخستەوە، مامۆستا خالید بوو بەلێپرسراوی لقی ڕێکخستنی پێشمەرگەو لەو ماوەیەی کە لەهەمەدان بووین چەند خولێکی هۆشیاری کۆمەڵایەتی کردەوەو بەشێکی زۆر لەپێشمەرگەکان بەشداری ئەو خولانەیان کرد، لەلایەکی تریش جەعفەری برای کاك خالید لەگەڵ مامۆستا تەها بابان خولی فێربوونی زمانی ئینگلیزیان کردەوە بۆ پێشمەرگەکان.

لەهەموو ئاهەنگو بیرەوەرییەکان ئەو دوو برایە رۆڵی سەرەکیان هەبوو، تاڕادەیەکی زۆر دڵسۆزبوون لەئەنجامدانی کارەکانیاندا.

بۆ خۆئامادەکردن بۆ ئاهەنگ گێڕانی جەژنی نەورۆزی ساڵی ١٩٦٥ کە لەمۆڵی شاری هەمەدان کرا، رۆڵە سەرەکییەکان کاك خالیدو کاك جەعفەری برای مەشقیان بەتیپەکان دەکرد، مامۆستا خالید بۆ جەژنی نەورۆز سروودێکی دانا بەناوی ساڵێکی تریش وا داهاتەوە، ئەو سروودە ئەوەندە خۆشبوو بەشێکی زۆریش لەپێشمەرگەکان دەیانوتەوە، کە ئەمە بەشێکێتی:

ساڵێکی تریش وا داهاتەوە

رۆژی نەورۆزی کورد واهاتەوە

بەهاتنەوەی نەورۆز ئەمجارەش

دەرسی تێکۆشان دادەداتەوە

ئێمەش گوڵی سووری دوور وڵات

دەنێرین بۆ هەر نەبەردێك مەشخەڵی شۆڕش هەڵبکاتەوە

هەر بۆ ئەو ئاهەنگی نەورۆزە، جەعفەری براشی تیپێکی هەڵپەڕکێی دروستکردبوو و پێش مانگێك مەشقی پێدەکردن لەسەر شێوەی گۆرانی ئەمان کەژێ، بۆ ئاهەنگی نەورۆزەکەش بەشێکی زۆر لەکاریەدەستان‌و دانیشتووانی شاری هەمەدان بەشدارییان لەگەڵ کردین.

لەبەهاری ساڵی ١٩٦٥دا پێشمەرگەیەکمان شەهید بوو، کەوتە ناو مەنجەڵی چێشتەوەو سووتا، تەرمەکەیمان لەگۆڕستانی بابە تاهیری هەمەدانی ناشت، پێشمەرگەکە ناوی کاکە رەش هەمەدانی بوو، مامۆستا خالیدیش شیعرەکەی بەکوردیی‌و بەفارسی بۆ کێلەکانی قەبری کاکە رەش نووسی.

ئەو ماوەیەی لەهەمەدان بووین، مامۆستا خالید دلێرو جەعفەری برای نموونەی ڕەوشت بەرزیی و کوردپەروەری بوون و ڕۆژێك بەڕوو گرژیم نەمبینین.

لەپاش گەڕانەوەشمان بۆ کوردستان مامۆستا خالید لەگەڵ ئێمە هاتە بەرەکانی شەڕ لەدۆڵی بالیسان، چونکە ئەوکاتە حکومەت بەنیازبوو بێتە دۆڵی بالیسان، زستان بوو، بەفرێکی زۆریاری بوو، مامۆستا خالید لەگەڵ ئێمە بوو، ورەشی لەهەموومان بەرزتر بوو، من هەر چەندە لەوان بەتەمەن تر بووم، بەڵام ئەوان بەمامۆستای خۆم دەزانم، لەبەرئەوەی زۆر کردەوەی باش لەوان فێر بووم و لەبابەتەکانیشم بەکورتی باسی قارەمانانی شاری کۆیەم کردووە.

مامۆستا خالید دلێر" پێشمەرگەیەکی دڵسۆز بوو، نووسەرێکی زۆر باش بوو، شاعیرێکی کوردپەروەر بوو، هونەرمەندێکی دەنگخۆش بوو، هەموو مەرجەکانی چاکەی تێدا بوو، بائەوەش بڵێین لەژیانیدا هەر هەژار بوو، بەڵام هەژارێکی سەر بەرزو چاو تێر بوو.

بەداخەوە ئەو پیاوە بەئەمەکە لەڕۆژی ٢٠١١/١٢/١٦، کۆچی دوایی کرد، هەزار ڕەحمەت لەگۆڕی هەردووکیان.

لەگەڵ ئەو پەڕی ڕێزم بۆیان

## کورتەیەك لە
## خەباتی پێشمەرگەی دێرین ئەحمەدی دادی

ڕۆژی ٢٠١٢/١/٧ هەڤاڵی دێرینم مامۆستای مێژوو نووس (عەبدولڕەقیب یوسف) بەتەلەفۆن هەواڵێکی لەناکاو و دڵتەزێنی دامێ، ئەویش کۆچی دوایی هەڤاڵی دێرینمان خوالێخۆشبوو (ئەحمەدی دادی) بوو.

ئەو هەواڵە ناخۆشە زۆر نیگەرانی کردم و ئەوەم بەبیرهاتەوە ماوەی مانگێك نابێ ئەوە سێیەم پێشمەرگەی دێرینی سەرەتایی شۆڕشی ئەیلولە یەك لەدوای یەکتر کۆچی دوایی بکەن، لەمانە (مامۆستا خالید دلێرو کاك جەلال کاوانی).

وادیارە خەم و پەژارەکان تێکەڵ بەیەکتر دەبن و دیوارە گەورەکەی پێشمەرگە دێرینەکانی شۆڕشی ئەیلولیش هەر ناوە ناوە بەردی گەورە گەورەی لێدەبێتەوەو بەرەو ڕووخان دەچێت. منیش وەکو هەڤاڵێکی خەمخۆری پێشمەرگە دێرینەکان، هەرئەوەندەم لەدەستدێت هەر یەکەو کورتەیەك لەبارەی خەباتیانەوە بنووسم.

### * پێشمەرگەو پزیشك بوو

سەرەتای ناسینم لەگەڵ خوالێخۆشبوو کاك ئەحمەدی دادی، لەڕۆژی دووەمی جەژنی ڕەمەزانی ساڵی ١٩٦٢ بوو لەمزگەوتی گوندی (هەڵەدن) کەبەڕێز مام جەلال (گا)یەکی بۆ پێشمەرگەکان سەر بڕی بوو، ئەو ڕۆژە من و

کاک ئەحمەد یەکترمان ناسی، ئەوکاتە هەردووکمان گەنج بووین، کاک ئەحمەد یەکێك بوو لەو پێشمەرگانەی لەسەرەتای شۆڕش لەچەمی ڕێزان لەگەڵ مام جەلال بوو.

کاک ئەحمەد لەگەڵ ئێمەدا لەهەموو شەڕەکانی ناوچەی شارباژێڕ و ناوچەی پێنجوێن بەشداربوو، پێشمەرگەیەکی ئازاو بەتوانا و زیرەك بوو، لەکاتی شەڕکردن لەگەڵ دوژمندا دوو ڕۆڵی دەبینی، وەك پێشمەرگەیەك هەم شەڕی دەکرد، وەك پزیشکێکیش هەم چارەسەری نەخۆش و بریندارەکانی دەکرد.

کاک ئەحمەدی دادی تاکە دکتۆری ناو هێزەکەمان بوو، تائەوکاتە دکتۆرەکان نەهاتبوونە ناو شۆڕش.

ئەحمەدی دادی لەبەرئەوەی ئەندامێکی کۆنی حزب بوو، زۆر شارەزایی هەبوو لەبارەی ڕێکخستنەکانی حزبایەتی، هەروەها خۆشەویستی هەموو سەرکردەکان و پێشمەرگەکان بوو، هەموو ژیانی خەبات و کوردایەتی بوو، زۆر جار کیسە دەرمانەکەی هەڵدەگرت و بنکە بەبنکە دەگەڕا بۆ چارەسەری نەخۆشەکان.

* **کادرێکی بەتوانابوو**

کاک ئەحمەد پێش ئەوەی ببێت بەپێشمەرگەش کادرێکی بەتوانا بوو لەناوچەی سلێمانی، پێشمەرگەکی ئازای (هەمەدان)یش بوو، ئەوکاتەی لەهەمەدان بووین لەئامۆژگاریکردن ڕۆڵێکی باڵای هەبوو لەکاتی کۆڕوکۆبونەوەکان، لە پاش گەڕانەوەشمان بۆکوردستان وەك جاران ڕۆڵی خۆی دەبینی.

ساڵانی ١٩٦٨ ـ ١٩٦٩ کاك ئەحمەد بوو بەلێپرسراوی ناوچەی پێشمەرگە لەبەکرەجۆ، ئەو ئەندامانەی لەگەڵیدابوون، ئەم هەڤاڵانە بوون:

کەریم جەوهەر، جەمال خەفاف، حەمید رەشاش، قارەمان شەوکەت، مەلا موسا حامید. لەساڵی ١٩٦٩ بەبۆنەی جەژنی نەورۆز ئاهەنگێکی گەورەمان سازکرد، لەوئاهەنگەدا خەڵکێکی زۆری شاری سلێمانی تێدا بەشدار بوون، ئەو کاتە کاکە(حەمدی تاهیر) وتاری حزبی خوێندەوە، وتاری پێشمەرگەش خوالێخۆشبوو ئەحمەدی دادی خوێندیەوە.

لەساڵی ١٩٧٠ لەپاش بەیانی ١١ی ئازار لەگەڵ کاك ئەحمەد لەیەکتری دابڕاین.

بەداخەوە ئەو قارەمانە لە ڕۆژی ٢٠١١/١٢/٢٨ لەوڵاتی سوید کۆچی دوایی کردو لەڕۆژی ٢٠١٢/١/٧) تەرمەکەی لەگردی سەیوان بەخاك سپێردرا.

# خەبات و پێشمەرگایەتیی
## سەرکردەی قارەمان ( ڕەیس حەمەدئەمین فەرەج )

ئەوەی من ئاگادارم رەیس حەمەد ئەمین فەرەج کە ناوی راستی (حەمەد ئەمین مەلا فەرەج) بوو. نە درەنگ هاتە ناو شۆڕشو نەکەمیشی بۆ گەلەکەی خۆی کردیە، خۆبەخشانە ئەو پیاوە کورد پەروەرە کەسایەتی دیارو ناوداری شارەکەی سلێمانی بوو، چەندی بلێی پیاوەکی کورد پەروەرەو ئازاو دەست پاکو لەبەر دڵان شیرین بوو. من ئەوەندە باش شارەزایی ئەو تێکۆشەرە بووم بەوەندە نووسینەم ناتوانم باسی هەموو خەباتی ئەو شۆڕە سوارە بکەم. من نەك وەکو هەڤاڵێك وەکو کەسێکی هەولێری ئەو چاکەم لەبەر چاوە. بەڵام بەداخەوە دەڵێم نووسەرانی هەولێرو نەنووسەرانی شارەکەی خۆشی رۆژەك لەڕۆژان باسی خزمەتو خەباتی ئەو شۆڕشگێڕەیان نەکردووە، من خۆشم لەخۆم رازی نیم لەکەمتەرخەمی. من باش شارەزای بنەماڵەکەیان نیمەو نازانم لەچ ساڵێك لەدایك بووەو نازانم چۆن قۆناغەکانی خوێندنی بڕیوە، بەلاّم باسی ئەو کاتانە دەکەم چۆن کاك حەمەد ئەمینم ناسیو ماوەی پێشمەرگایەتیو سەرکردایەتیەکەی وەکو خۆی بۆ مێژوو دەگێڕمەوە. سەرەتایی ناسینم دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٦٢ ئەو کاتە بارەگای مەکتەبی سیاسیی لەئەشکەوتەکەی گوندی مالومە بوو، سەرەتای زستان بوو رۆژەك گەنجەکی باڵا بەرزی ڕێکو پێك بەسواری وڵاخێك هاتە بارەگای مەکتەبی سیاسیی بەڕێز مامۆستا (ئیبراهیم) و ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی زۆر

بەگەرمی پێشوازیان لێکرد، من ئەو کاتە لێپرسراوی بارەگا بووم بەخێرهاتنم لەکاک ( حەمەد ئەمین) کردو مامۆستا (ئیبراهیم) منو کاک حەمەد ئەمینی بەیەکتر ناساند، مامۆستا گۆتی ئێوە هەردووکتان عەسکەرن. لەپاشان من زانیم کاک حەمەد ئەمین ئەفسەری فیرارەو پلەکەشی رەیسە واتە نەقیبی ئێستا. هەر بۆیش ناز ناوی رەیس حەمەد ئەمین بوو . هەر وەکو رەیس کەمال مفتی. کاک حەمەد ئەمین ماوەیەکی باش لەبارەگا مایەوە لەو ماوەیەدا منو کاک حەمەد ئەمین زۆر باش یەکترمان ناسی.

## لەگەڵ خۆیدا چەند ئەفسەرێکی هێنابوو

کاک حەمەد ئەمین لەگەڵ خۆی ناوی چەند ئەفسەرێکی دیکەی هێنا کە لەگەڵ خۆی هێنا بوونیو گۆتی ئەوانەش ئەندامی حزبن بەنیازن بێنە ناو شۆرش یەکێك لەو ئەفسەرانە فرۆکەوان بوو فرۆکەکەی لیۆشنی رووسی بوو گۆتی ئەو ئەفسەرە بەتەمایە فرۆکەکە لەگەڵ خۆی بێنی دەبێ جێگایی نیشتنەوەی بۆ دابین بکەینو ناونیشانی شوێنەکە دیاری بکەین بۆ نیشانکردنی جێگای فرۆکەکە، مامۆستا عەلی عەبدوڵڵاو کاک حەمەد ئەمینو من چووینە دۆڵی جافایەتی، بەڵام جێگای وای لێنە بوو دەستبدات. لەپاش گەرانەکی زۆر من باسی فرۆکەخانە کۆنەکەی زەمانی ئینگلیزیم کرد لەدەشتی مەرگەیە. ئەوانیش لەسەر ئەو جێگایە رازی بوون. بەڵام ئەفسەرەکە نەهات، لە پاش هاتنی کاک حەمەد ئەمین چەند ئەفسەرەکی دیکە هاتنە ناو شۆرش هەموویان پلەکانیان ملازم بوو ئەوانیش هاتنە بارەگای (م.س) لەو ئەفسەرانە.

١ـ ملازم نەوزادی ساڵح خۆشناوی کە ئێستا راوێژکاری سەرۆکی هەرێمە.

٢ـ ملازم ئیسماعیل نادر بوو.

٣ـ ملازم حەسەن بارزانی بوو. ئەو کاتە کاك ملازم نەوزاد زۆر زیرەكو وریا بوو. ئەوان هەموویان ئەندامی حزب بوون. لەپاشان مەکتەبی سیاسیی ئەفسەرەکانی دابەشکردن بەسەر هێزەکانی پێشمەرگە، کاك حەمەد ئەمین سەر بەمەکتەبی سیاسییەوەبوو لەساڵی ١٩٦٤ کاك حەمەد ئەمین لەگەڵ ماڵو منداڵەکانی لەگوندی ئاو کورتی بوو، کە شەڕی برا کوژی روویدا کاك حەمەد ئەمین بەمنداڵەوە لەگەڵ ئێمە هاتە ئێرانو ماڵەکەی لەگەڵ ماڵی مامۆستا (ئیبراهیم ئەحمد) لەتاران بوو، لەپاش گەڕانەوەمان بۆ کوردستان لەساڵی ١٩٦٦ کاك حەمەدئەمینیش گەڕایەوە لەساڵی ١٩٦٧ کاك حەمەدئەمین کرا بەفەرماندەی هێزو هات هەر دوو شارەکەی رانیەو قەڵادزێی ئازادکرد. ئەو کاتە شێخ جەنگیو عەریف سلێمانیش لەگەڵ هێزەکەی کاك حەمەد ئەمین دابوو، من ئەو کاتە لەگوندی سەرکەپکان بووم، لەپاش بریندارکردنی مەلا موسا منیش لەگەڵ پێشمەرگەکان چووینەوە پاڵ ئەو هێزەی کاك حەمەد ئەمین کە لەڕانیەو قەڵادزێ بووین، لەساڵی ١٩٦٨ کاك حەمەد ئەمین فەرەج بووە موتەسەریفی هەولێر تا ١٩٧٠/١/٢١ لەو ماوەیەدا کاك حەمەد ئەمین باشترین خزمەتی بەشاری هەولێرێ گەیاند، لەکاتی کاك حەمەد ئەمین موتەسەریفی هەولێر بوو کاتەکی زێڕین بوو بۆ شاری هەولێر نەشەڕو ئاژاوە هەبوو نەدزی دەکرا نەکەس بەناهەق دەگیرا، نەکەس بێسەرو شوێن دەبوو، لەهەمووی گرنگتر ئەوە بوو لەکاتی ئەو پیاوە محافیز بوو یەك تاکە ئەندامەکی حزبی بەعس لەهەولێرێ نەبوو، هەموو ئموری شارەکە لەژێر دەسەڵاتی ئەو دابوو هەریۆیەش کاروباری شارەکە ئەوەندە رێك بوو. کاك حەمەد ئەمین پیاوەکی زۆر پاك بوو لەهەموو روویەکەوە پیاوەکی ئازاو

دڵسۆزی کورد بوو، ماوەی دزو خراپەکاری نەدەدا. هەر ئەوەش بوو لەپاش نەمانی کاك حەمەد ئەمینو هاتنی (خالید عەبدولحەلیم) شاری هەولێر بووە مۆڵگەی بەعسیەکانو بارودۆخی شارەکە بەرەو خراپە گۆڕا، لەکاتی کاك حەمەد ئەمین لەهەولێر بوو لەساڵی ١٩٧٠ منیش فەرماندەی هێزی پێشمەرگەی هەولێر بووم، من زۆر هاوکاری کاك حەمەد ئەمین بووم لەڕووی ئەمنو ئاسایشی شارەکەوە لەپاش بەیانی (١١) ی ئازار هەموومان گەڕاینەوە سەر کارەکانی پێشوومان ئەو کاتەش لەبەغداد کاك حەمەد ئەمین خەمخۆری هەمووومان بوو، لەهەر کاتو ساتە ناخۆشیەك سەری هەڵدابا لەگەڵ حکومەت، چارەسەری دەکرد.

## خزمەتی کوردو ڕێبازی کوردایەتی دەکرد

کاك حەمەد ئەمین زۆر برادەری وەزیری بەرگری (حەمادی شەهاب) بوو هەموو کارەکی بۆ کاك حەمەدئەمین دەکرد، لەپاشان بووە مەلحەقی عەسکەری لەوڵاتی (مەغریب) کە ڕۆیشت بۆ مەغریب بەئێمەی گوت لەپاش من بۆ هەر ئیشو کارێك بڕۆنە لای موقەدەم حەمەد ئەمین دەریەند فەقەرە. بەڕاستی ئەویش پیاوێکی کورد پەروەر بوو. بەهاتنامان دەهات کاك حەمەد ئەمین کەلە مەغریب بوو هەر خزمەتی کوردو ڕێبازی کوردایەتی دەکرد کاك حەمەد ئەمین لەپاش گەڕانەوی لەمەغریب کرا بەسەرۆکی دادگای عەسکەریو ماڵەکەشی لەگەڕەکی (یرموك) بوو، ماڵەکەی هەمیشە پڕ بوو لەمیوان، کاك حەمەد ئەمین پیاوێکی خانەدانو سەخیو چاو تێرو قسە لەڕوو بوو، لەپاشان بەپلەی لیوا خانەنشین کرا.

**لەمەڕدوو کارەکەی زەرەری کرد**

لەپاش خانەنشینی ماوەیەك لەگەڵ(حەسەن بالتە) خەریکی کاری مقاوڵات بوو، ئەو کاتە گەورەترین مقاوەڵاتی گرت لەبەغدا، نووسینگەکەی لەگەڕەکی قامیرە بوو ئەو نووسینگەیە جێگای چاو پێکەوتنی کۆنە پێشمەرگەکان بوو زۆر جار کاك (عومەر دەبابە)و کاك (عەلی عەسکەری)و کاك دکتۆر (خالید) لە نووسینگەکەی ئەودا کۆبووەنەوەیان دەکرد.

لەهەمان کاتیش کاك حەمەدئەمین کەباب خانەکی لەشەقامی کفاح کردبۆوە بۆ برادەرەکانی قەت قبولی نەدەکرد پارە بدەن، کاك حەمەدئەمین لەبەر ئەو هەموو مەسرەفەی لەخەڵکی دەکرد زەرەرەکی زۆری کرد لەمەڕدوو کارەکەی چ لەمقاوەلاتەکەی چ لەکەباب خانەکەی. لەئەنجامی ئەو زەرەرە حکومەت هەموو ماڵو سەروەتەکەی دەست بەسەر داگرت، بەداخەوە ئەو پیاوە چاو تێرو بەوەفایە کەوتە ناو ژیانەکی هەژاریو کولە مەرگی من زوو زوو سەردانم دەکرد، بەڵام کە دەچووم گریانم دەهات بۆ حاڵی ئەو پیاوە کورد پەروەرە ماڵەکەی لەکەلاوەیەك دابوو. لەگەڕەکی حارسیە هەر خۆیو خەدیجە خانی خوشکی بەتەنیا مابوونەوە خانوەکەیان نەدەرگای پێوە بوو نەپەنجەرە لەگەڵ ئەو حاڵەش پیاوەتیو کوردایەتی لێدەباری، کاك حەمەد ئەمین هەموو مەرجەکانی پیاوەتی تێدا بوو لەهەموویان زیاتر ئەوەبوو کەسێك ئەوەندەی کاك حەمەد ئەمین ڕێزی لەدایكو باوکیو خوشکە گەورەکەی خۆی نەدەگرت. من حەسودیم بەو ڕێز لێنانە دەبرد.

لەکۆتایی نووسینەکەم دەڵێم خەڵکی شاری سلێمانی بەرامبەر بەو پیاوە قارەمانە کەمتەرخەمنو لەکاتی تەنگانە کەس لە هانای نەهات ئەوەی بەهانای هات بەس (شێخ لەتیف بەرزنجی) بوو پێش وەفاتکردنی کەمەك

یارمەتیدا. بەداخەوە من ئەوەم لەیاد نەماوە لەچ کاتێك کۆچی دوایی کرد هەزاران ڕەحمەت لەگۆڕی کاك حەمەد ئەمین بێت. دلوا لەنووسەرانی شاری سلێمانی دەکەم چی لەبارەی ئەو پیاوە دەزانن وەکو مێژوو بینوسن با کردەوە جوانەکانی ون نەبێت.

# باسێک لەبارەی خەباتی
# شەهید حەمید باتاس (هەڤاڵ مێرووله)وە

شەهید حەمید باتاس، لەساڵی ١٩٢٠ لەگوندی شێخانی شەمزینانی هەکاری لەدایکبووەو ناوی باوکی محەمەدەو ناوی دایکی ناسیّ بووەو برای شیرخۆری پێشمەرگەی ناودار (ئیسماعیل سەرهەنگ)ە.

## کە دێنە باتاس

لەکاتی ئەو دەنگوباسە دڵتەزێنەی لەسێدارەدانی شێخ عەبدولقادری شەمزینیو سەید محەمەدی کوڕی لەساڵی ١٩٢٥دا گەیشتە هەکاریو لەگەڵ سەدان خێزانی دانیشتوی ناوچەی هەکاری هاتنە عێراقو لەگەڵ ئەوانیش ناسیّ لەگەڵ تاقە منداڵەکەی حەمید دێتە باتاسو هەریر، بەڵام ئەوکاتەی دێنە عێراق باوکی لەژیاندا نەمابوو. کە دێنە (باتاس)یش لەبەر هەژاری، دایکی حەمید مێرد بەپیاوێکی هەرکی دەکاتو حەمیدیش منداڵ دەبیّ، تا گەورە دەبیّ هەر لەماڵی باوکی مامۆستا ئیسماعیل سەرهەنگ دەبیّو بەیەکەوە دەچنە قوتابخانە، کە تەمەنیشی دەگاتە ١٧ ـ ١٨ ساڵ، کاک حەمید دەچێتە ماڵی سەید عەبدوڵڵا، کە ئەوکاتە سەید عەزیز شەمزینی ئەفسەر دەبێتو حەمید لەگەڵ خۆی دەباتە کەرکوك.

کاك حەمید لەکەرکوك دەچێتە ناو ریزەکانی حزبی پارتیو دوکانێکی بچوك دادەنیّو کاری حزبایەتیش دەکات.

شەهید حەمید ناسراو بەهەڤاڵ (مێروولە)، ئەوەندە رەوشت بەرزو پاکو دڵسۆزدەبێ، لەناو ئەندامانی حزب جێگای خۆی لەناو دڵی هەموویان دەکاتەوە، بەتایبەتی سەرکردەکانی حزبی ئەوکاتەی وەکو بەڕێز مام جەلال و کاك عومەر دەبابەو شەهید عەلی عەسکەری و مامۆستا مەلا عەولاً.

## پشکۆیەك ئاگر

پاشان هەڤاڵ مێروولە دەبێتە لێپرسراوی رێکخستنی ژنانی کەرکوك، مامۆستا مەلا عەولاً بۆی گێڕامەوەو وتی کە (کاك حەمید لێپرسراوی ژنان بوو، لەناو حەوشەکەی بارەگای ژنان دار مێوێك هەبوو زۆر ترێی گرتبوو، کاك حەمید هەموو هێشوەکانی ژماردبوو، هەمووشی لەنێوکیسە نابوونو بەنووسین ژمارەی بۆ کیسەکان دانابوو بۆئەوەی بزانێ چی لێکراوەتەوەو دەیوت ئەوە ماڵی حزبەو نابێ کەس بیخوات)، شەهید حەمید نموونەی ئەخلاقو دەستپاکیو خۆڕاگری بوو، وەکو کوڕە گەورەی ماڵی عەلی عەسکەری بوو.

حەمید باتاسی، خۆی بەکوڕی حزب دەزانیو عەلی عەسکەریو مام جەلال-یشی بەبرای خۆی دادەنا، مامۆستا مەلا عەولاً دەیوت: (جارێك لەکۆبوونەوەی مانگانەی شانەکان منو کاك عەلی عەسکەریو کاك خالید دلێری تێدا بەشداربووین، لەپاش پرسیارو وەڵام هاتینە سەر داواکاری، کاك حەمید وتی: من داواکاریم هەیەو وتی من کوڕی حزبمو داوا دەکەم حزب ژنم بۆ بێنێ، بەڵام ئەو ژنەی دەمەوێ دەبێ ئەندامی حزب بێتو مامۆستای قوتابخانە بێ).

شەهید حەمید پیاوێکی راستگۆو لەڕووبوو، نەشدەترساو چەندینجار حکومەت دەیگرت لەسەر چالاکی، شەهید عەلی عەسکەری زۆر باسی

دڵپاکیو خۆراگریو ئازایەتی حەمید باتاسی دەکرد، بۆ نموونە وتی (ڕۆژێك کاك حەمید پشکۆیەك ئاگری لەسەر دەستی خۆی داناو فووی لێدەکرد، وتم کاك حەمید بۆ دەستی خۆت دەسوتێنی؟! وتی خۆم دەجەرێنم بزانم ئەگەر گیرامو وتیان قسە لەسەر عەلی عەسکەری بکە تاچەند خۆم رادەگرم؟!.

ئێمە هەر چەندی باسی هەڤاڵ مێرووله بکەین لەبارەی دڵسۆزیو کوردپەروەری تەواو نابێ.

### شەو لەتەکیە دەخەوت

سەید عەزیز شەمزینی دەیگێڕاوەو دەیوت (لەپرسەی شێخ سادقی برای بارزانی نەمر دانیشتبووین، هەڤاڵ مێرولەش لەپرسەکە بەشداربوو، ئەوکاتە سەرۆك حەمید باتاسی نەدەناسیو سەرۆك بەحەمید باتاسی وت ناوت چییە؟ وتی هەڤاڵ مێرووله. سەرۆك وتی کاکە ناوی حزبی نا، ناوی خۆت بڵێ، دووبارە وتی: مێروولەو ناوەکەی خۆت نەوت.

جارێك لەمەلا عەولا توڕەبوو و پێی وت (مەلا عروسکە بۆ هار نابێ لەباتی زەرەی کەر، گوێ لەتەلەفۆنو تەسجیل دەگری، لەجیاتی سواربوونی کەر، سواری قەمەرەی مارسیدس دەبێ، لەباتی گۆجان کلاشینکۆف هەڵدەگری).

هەڤاڵ مێرووله ئەندام کۆنگرەی گوندی هەوداڵانی ساڵی١٩٦١ بوو، پاشان لەساڵی١٩٦٢ بووە لێپرسراوی لقی ٢ی پارتی لەموسڵ، کەجێگەیەکی پڕ مەترسی بوو، مامۆستای مێژوونووس (عەبدولڕەقیب یوسف)یشی لەگەڵ بوو.

باسیان دەکردو دەیانوت هەڤاڵ مێرووله بەشەوو ڕۆژێك یەك ژەم نانی دەخواردو زۆرجاریش بۆ خۆپاراستن لەناو گۆڕستانەکان دەخەوتن. لەساڵی١٩٦٢دا ئەوکاتە کە مەکتەبی سیاسی لەئەشکەوتەکەی گوندی مالومە

بوو، من لێپرسراوی بارەگای م.س بووم‌و کۆبوونەوەی ئەندامی مەکتەبی سیاسی‌و لیژنەی مەرکەزی بەسترا. شەهید حەمید باتاسی بەشداری کۆبوونەوەکە بوو، هەرچەندە ئەندامی سەرکردایەتی مەرکەزی نەبوو، بەڵام وەکو لێپرسراوی لق بەشداربوو، لەساڵی١٩٦٤ کاک حەمید دەبێتە لێپرسراوی بەشی ژنان لەهەولێرو بەشێوەی نهێنی کاری حزبایەتی دەکرد، ناوی خۆی گۆڕیبوو، خۆی لەگەڵ دەروێشەکانی شێخ عەبدولکەریم رێکخستبوو، شەو لەتەکیە دەخەوت‌و هەموو نووسراوە نهێنییەکانی لەناو سندوقێکی بچووک دەکردو لەبن ئاڵای سەروقەدی شێخ عەبدولکەریم دەیشاردەوە، ئەوکاتەو ئێستاش بنەماڵەی شێخ عەبدولکەریم بەژن‌و پیاوەوە هەر کوردایەتییان دەکرد، بەتایبەتی کوڕەکانی خوشکە زەینەبی کچی. هەندێکجار شێخ بۆ زیارەتی غەوس لەگەڵ دەروێشەکانی دەچوونە بەغداو دەروێش سەعیدیش بۆکاری حزبایەتی لەگەڵ دەروێشەکان دەفەکەی لەملی خۆی دەکردو دەچووە بەغداو کارەکانی خۆی جێبەجێدەکردو دەشگەڕاوە.

## لەگەڵ ٦٣ پێشمەرگەی قارەمان

لەساڵانی ١٩٦٧-١٩٦٨ وەکالەتی دۆشاوی زێڕی وەرگرتبوو، بەبەلاش دۆشاوی دەدایە بارەگای حزب لەبەغداو لەکەرکوك. لەساڵی١٩٦٩شدا لەهەولێر لێپرسراوی لیژنەی کۆکردنەوەی دەغڵ‌ودان بوو لەگەڵ خوالێخۆشبوو عەبدولڕەحمان رووتەو خوالێخۆشبوو مەدیٚ فەندی شەقڵاوەیی، بەڵام کاک حەمید لەئەندامی لیژنەکە رازی نەبوو، لەبەرئەوەی زیادە مەسرەفیان دەکرد، بۆیە کاک حەمید وازی لەلیژنەکەهێناو هاتەوە بەکرەجۆ. هەندێك پارەیان کۆکردبۆوەو پارەکەی هێنایە لای من‌و

پارەکەماندا بەبەڕێز مام جەلالو وتی (من لەگەڵ ئەو لیژنە کار ناکەم، لەبەرئەوەی زیادە مەسرەف دەکەن) لەپاش بەیانی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ش هەڤاڵ مەلا محەمەد بەحرکەیی‌و مستەفا رابەرو تارق شێخ نوری‌و زۆرێکی تر لەبرادەرانی سەردانیان دەکرد.

ئەو پیاوە خۆڕاگرە بەو شێوەیە لەهەولێر مایەوە تاشۆڕشی نوێ سەریهەڵداو تا لەگەڵ شەهید عەلی عەسکەری‌و خوالێخۆشبوو کاك عومەر دەبابەو شەهید دکتۆر خالید چوونەوە شاخ‌و بۆ بەشداریوونی شۆڕشی نوێ، هەڤاڵ مێروولەش خۆی رانەگرتو چێشتخانەکەی‌و مەنجەڵەکانی بەجێهێشتو خۆی گەیاندەوە ناو ریزەکانی شۆڕشی نوێ. ئەو پیاوە سەریەرزە کوردایەتی لەگەڵ خوێنی تێکەڵاوبیوو، هەر بەردەوامبوو.

شەهید حەمید باتاسی لەگەڵ ٦٢ پێشمەرگەی قارەمان لەسەعات دوانزەی شەوی ١٧لەسەر١٩٧٧/٥/١٨ لەسەر پردەکەی چۆمانو ڕایات کەوتنە ناو کەمینی سەربازانی حکومەتی بەعسی دڕەندەو شەهید حەمید لەگەڵ دوانزە پێشمەرگەی دیکە شەهیدکرانو بەشێکیش لەپێشمەرگەکان کەوتنە ناو رووبارەکەو خنکانو بەشێکیش رزگار بوون.

هۆی شەهیدبوونی ئەو پێشمەرگانەش هەر جاسوسە کوردەکان بوون کە هاوکاری سەربازان بوون.

## سەربازی ونبوو

بەداخەوە دەڵێم لەبەرئەوەی شەهید باتاسی کەسی نەبوو، ئێستا گۆڕەکەی دیار نەماوەو دەبوایە لەپاش راپەڕین ئەوکاربەدەستانەی کە هەڤاڵ مێروولەیان دەناسی چووبانە سەر گۆڕەکەی بەبەردی مەڕمەڕ

گۆڕەکەیان رازاندباوە، چونکە بەشێك لەوانەی دۆستو هاوڕێی هەڤاڵ مێروله بوون لەهەردوو حزبەکە، ئێستا ماوونو کار بەدەستن.

بۆیە دەتوانن لەناو شارەکاندا جێگایەکی بەناوەوە بکەن، چونکە بەڕاستی شەهید حەمید سەربازی ونبوی گەلەکەمان بوو و هەموو مەرجەکانی کوردایەتی تێدابوو..

هەزاران ڕەحمەت لەشەهید حەمید باتاسیو لەهەموو شەهیدانی راستەقینەی کوردستان.

تێبینی: بەشێك لەو زانیارییانەم لەمامۆستای مێژوونووسی ناوداری گەلەکەمان عەبدولڕەقیب یوسف وەرگرتووە، زۆر سوپاسی دەکەم.

# ئاهەنگە بەجۆشەی نەورۆزی ساڵی ١٩٦٢
# لە شۆڕشی ئەیلولدا

جەژنی نەورۆز جەژنەکی ئەوەندە پیرۆز و پڕە لە هەستی نەتەوایەتی و دڵ ڕفێن و جۆش و خرۆش، لە ڕۆژانی نەورۆز هەستی نەتەوایەتی تازە دەبێتەوە، قەومی کورد لە کاتەکانی خۆشی و ناخۆشیدا ئەگەر دەرفەتی بۆ برەخسێت بەهەر شێوەیەك بێت ئەو جەژنەو یادە پیرۆزە بەرز ڕادەگرێ و دڵی پێی خۆش دەبێ، جا بۆیە لام باش بوو باسی ئاهەنگی جەژنی نەورۆزی ساڵی ١٩٦٢ بکەم وەك مێژوو، لەبەرئەوەی ئەو نەورۆزە لەکاتی سەرەتای شۆڕشی ئەیلول بوو، کاتی هەژاری و پێشمەرگایەتی بوو، جائەم نەورۆزە پڕشادی و خۆشییە لەدوو جێگا لەهەر جێگایەو بەشێوەی خۆی ئاهەنگەکە کرا، جێگایەکیان لەگوندی بێتواتە بوو جێگایەکەی دیکەش لە قەزای چوارتا بوو، ئەوکاتەی من باسی دەکەم سەرەتای شۆڕشی ئەیلول بوو، ژمارەی پێشمەرگە زۆرکەم بوو، زۆرکەس وای دەزانی ئەوشۆڕشە گەشە ناکات، ئەوکاتە ژمارەی هەموو هێزەکەمان ٣٠٠ پێشمەرگە زیاتر نەبوو هەموو ژیانمان لەسەر گوندەکان بوو، من ئەو کاتە لەگوندی بێتواتە بووم، مامۆستا مەلا عەولا فەرماندەمان بوو، ئەو بەشە هێزەی لە چەمی ڕێزان بوو مام جەلال فەرماندەیان بوو، بەڵام ئەو هێزەی لە چەمی ڕێزان بوو ژمارەیان زۆر کەم بوو.

جا بۆ ئەوە هێزەکەی چەمی ڕێزان کاریگەرتر بێ مام جەلال داوای لەمەلا عەولا کرد ٧٠پێشمەرگەی لەهێزەکەی بێتواتە بۆ بنێرێ بۆ کاری پێویست، منیش یەکێك بووم لەو پێشمەرگانە.

## بابگەڕێینەوە سەرباسی هەردوو ئاهەنگەکانی جەژنی نەورۆز.

١-ئاهەنگی جەژنی نەورۆز لە گوندی بێتواتە لەساڵی ١٩٦٢ئەو بەشە هێزەی کە لە بێتواتە بوو، چەند ڕۆژێك لەپێش نەورۆز داوایان لەیەکێتی قوتابیانی ڕانیە کردبوو بەشێوەی نهێنی بەشداری ئاهەنگی جەژنی نەورۆز بکەن لەگەڵ پێشمەرگە، ئەو کاتە مامۆستا سەڵاح شەفیع بەرپرسی قوتابیانی قەزای ڕانیە بوو، بەفەرمانی حزب ١٦ قوتابی کچ و کوڕ واتا ٨ کچ و ٨ کوڕ بەجل و بەرگی کوردی ئامادە کردن و بەشێوەیەکی زۆر نهێنی ڕەوانەی بێتواتەی کردن، هەموو قوتابیەکان کچ و کوڕی ئەندامانی حزب بوون، بۆنمونە: ئەو کاتە مامۆستا ئیسماعیل سەرهەنگ بەڕێوەبەری قوتابخانە بوو کچێك و کوڕێکی خۆی بەجل و بەرگی کوردی نارد، کچەکەی جل و بەرگی پیاوانی پۆشیبوو ناوی نیشتمان ئیسماعیل سەرهەنگ بوو، کوڕەکەشی ناوی هیوا سەرهەنگ بوو، مامۆستا تۆفیقی مەلا سدیقیش خۆی و کچەکەی کە ناوی پەخشان خان بوو کە دەکاتە خێزانی مامۆستای مێژوو نووس عەبدولرەقیب یوسف.

خۆشی ئەو نەورۆزە ئەوەبوو نەکارەبا هەبوو نە ئامێری دەنگ هەبوو نەکورسی هەبوو نە ئالا ڕازاندنەوە هەبوو، هەموویان لەسەر زەوی دانیشتبوون ئەو کەسەی قسەی دەکرد مامۆستا مەلا عەولا و کاك عومەر دەبابە بوون، مامۆستا مەلا عەولا لەسەرەتای ئاهەنگەکە سورەتە قورئانی

خوێند و لە پاشان هەرخۆشی گۆرانی شیرین بەهارەی گۆت، قوتابیەکانیش بە گۆرانی هەڵپەڕکێ ئاهەنگەکەیان ڕازاندەوە.

٢- بابچینە لای بەشە هێزەکەی مام جەلال، بەر لەهاتنی جەژنی نەورۆز مام جەلال هێزی کۆکردەوەو پلانی گرتنی قەزای چوارتاو ناحیەی باسنێی سیویل و چەند مەخفەرێکی دانا، لە شەوی جەژنی نەورۆزی ١٩٦٢ ئاگری نەورۆز بە تەقەی تفەنگ لەسەر قەزای چوارتاو ناحیەی باسنێ و مەخفەری گرگاشەو مەخفەری کاپیلۆن و مەخفەری مۆکەبە گیران، ئەوەی ڕاست بێ عەریف مەجید گورون توانی مەخفەری مەوکەبە و کاپیلۆن لەگەڵ خۆی بێنێ بەبێ تەقە بەخۆیان هاتنە ناو شۆڕش، لەو شەڕە دەست کەوتی زۆر وەدەست هات لە چەك و تەقەمەنی، بەداخەوە خەسارەتی ئێمەش دوو پێشمەرگەی قارەمان بوون بە ناوەکانی حەمید کاوانی و کاکۆل سەعید لە پشتی گوندی تەگەران.

هەردوو ئاهەنگەکە بە ناوی ئاهەنگی جەژنی نەورۆز بوو هەر یەکەو بە جۆرەك بوو، ئەو کاتە بەلای ئێمەی پێشمەرگە خۆشترین نەورۆز بوو.

# ئێمەی پێشمەرگە دێرینەكانی هەمەدانو باڵی مەكتەبی سیاسی بۆ وەفاداری مام جەلال هەر لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلول ئەو بەڵێنەمانداوەو وەفاداریمان نەگۆڕە وەفاداریمان بۆ (مام جەلال) نەگۆڕە

كورد دەڵێ قسەی پیاوان سەنەدە, ئێمە لەكاتێكدا ئەو بەڵێنەمان بەمام جەلال دا كە ژمارەمان (١٨) پێشمەرگە بووین لەئەشكەوتەكەی (بافلێ) لەچەمی رێزان بووین خۆ ئەو كاتە بەشی هەرەزۆری دانیشتوانی كوردستان باوەڕیان بەبوونی شۆڕش نەبوو، هەر لەو كاتەشدا بوو مام جەلال دروشمی كوردستان یان نەمانی بەرزكردەوە. ئەو كاتە نیوەی پێشمەرگەكانیش بێ چەك بوون، خاوەنی یەك تاكە فلوس نەبووین، لەناو ئەشكەوتەكە لەسەر پوش و پەڵاش دەخەوتین، هەر ئەو (مام جەلال)ە بوو لەماوەیەكی كەمدا توانی ژمارەمان لە (١٨) پێشمەرگە بكاتە (٢٨٠) پێشمەرگە بەهاوكاری خەڵكە دڵسۆزەكانی كوردستان.

مام جەلال توانی بەو (٢٨٠) پێشمەرگەیە بەشەكی زۆر لەناوچەی سلێمانی رزگار بكات، بۆ نموونە ناوچەی شارباژێڕو ناوچەی شلێرو قەزای پێنجوێن، چەند جێگایەكی تر. ئەو سەركەوتنانە دەنگی داوەو حكومەت تووشی سەرلێشێوان بوو. هەر بەهۆی ئەو سەركەوتنانە بوو شۆڕش هەموو ناوچەكانی كوردستانی گرتەوە, ئەگەر باسی رۆڵی سەركردایەتی مام جەلال

بکەم هەر تەواو نابێ با بگەڕێینەوە سەر وەفاداری بۆ مام جەلال ئێمە پێشمەرگە دێرینەکان شانازی بەو وەفادارییەی خۆمان دەکەین کە بەکردەوە سەلماندمان لەساڵی (١٩٦٤) کە (٤٦٠) پێشمەرگە لەگەڵ مام جەلال چووینە (هەمەدان)و ئەو ناوە خۆشەی جەلالیمان پێبڕا.

بەڵێ ئێمە بەشەکمان کۆچی دواییان کردیە، بەڵام کوڕو نەوەکانیان ماوە بەشێکیش لەژیاندا ماوینو خاوەن منداڵو نەوەین، هەر هەمووومان لەسەر بەڵێنەکەی خۆمان ماوین.

ئێمەی کۆنە جەلالییەکان بۆ کاتی پێویستو بۆ ڕۆژی تەنگانە وەکو کەچە شیری پشت کەندوانین قەت ژەنگن نابین بۆ یەکێتیو ڕێبازەکەی مام جەلال هەمیشە جاحێڵ دەبینەوەو کاری خۆمان دەکەین. ئێمەی پیرە پێشمەرگەکان زۆر باوەڕمان بەپەندی پێشینان هەیەو ووتە بەنرخەکانی بەڕێز (مام جەلال)یش بۆ ڕێبازی یەکێتی وەکو پەندی پێشینانە.

لەپەندەکانی کوردەواری دەڵێ نان پارو پارو دەخورێو پاروش هەتا نەیجوی قووت نادرێ، بانگەشەی یەکێتی بۆ هەڵبژاردنی ئەمجارەمان بەبەرنامەو قۆناغ بوو، ئێستا قافڵەو قەتاری یەکێتی وا بەرەو قۆناغی سەرکەوتن دەچێ سەرکردەی ئەو کاروانە گەورەیە مام جەلالە. کاروانەکە ئەوەندە گەورەیە چاوپیسانی پێ هەڵنایێ، ناحەزەکانی یەکێتی لەمازیان زەرەریان کردیە بەتەمانە لەسیجکان تێبیننەوە، مازی و سیجکە بەری یەك دارن، بەڵام مازیەکە پارەی باش دەکات سیجکە پووڵەکی ناکات، لەکۆتایدا دەڵێم یەکێتییەکان ئەو پەندەتان لەبیر نەچێ. کوردەواریی دەڵێ نە گۆلاوان بکەنە ڕەز نە ناکەسان بکەنە کەس. گۆلاو ئەو کانیاوەیە لەوەرزی بەهاران ئاوی هەیە، بەڵام لەوەرزی هاوینان ئاوەکەی وشك دەبێ، هیوادارم یەکێتی سەرکەوتووبێ.



مام حەمید رەشاش لەگەڵ پاڤڵ جەلال تاڵەبانی



مام حەمید رەشاش لەگەڵ جێگری سەرۆکی حکومەت قوباد جەلال تاڵەبانی



سیمیناری زانکۆی سۆران لەسەر زمانی کوردی



یادی حاجی قادری کۆیی - زانکۆی کۆیە

لەلای ڕاستەوە مامۆستا عەبدولوەهاب شێخانی ، مام حەمید ڕەشاش ، مامۆستا عەبدولاّ حەسەن زادە



زانکۆی کۆیە– لەلای ڕاستەوە دکتۆر هاوژین سلێوە ، مام حەمید ڕەشاش ، مامۆستا عەبدولوەهاب ، ئەوانی تر مامۆستایانی زانکۆی کۆیە حەوتەمین کەس مامۆستا کانەبی باپیر



زانکۆی سۆران

لەلای ڕاستەوە مام حەمید ڕەشاش ، مامۆستا عەبدولوەهاب شێخانی ، مامۆستا عەزیزی مەلای ڕەش



زانکۆی سۆران

مامۆستا حەمید ڕەشاش ، مامۆستا حەمە سالح فەرهادی



ماڵی مامۆستا عەبدولوەهاب شێخانی

گفتوگۆیەک لەسەر زمانی کوردی لەگەڵ مام حەمید ڕەشاش



نەورۆزی بەغدا ، مام حەمید ڕەشاش لەگەڵ مەلەک خانی خێزانی



مام حەمید ڕەشاش لەگەڵ مام جەلال



مام حەمید ڕەشاش لەگەڵ کاك سەعدی ئەحمەد پیرە



مام حەمید ڕەشاش لەگەڵ فەقێ شێخ وەسانی



مام حەمید لەسەر گڵکۆی شەهید حەمید کاوانی



لەلای چەپ مام حەمید رەشاش ، مامۆستا عبدالوهاب شێخانی ، رەهبەری سەید برایم



قوباد جەلال تاڵەبانی لەمەراسیمی ماڵئاوایی مام حەمید رەشاش



دەریاز کۆسرەت رەسول لەمەراسیمی ماڵئاوایی حەمید رەشاش



مام حەمید ڕەشاش لەبەردەم ئەشکەوتی مالومە لەگەڵ ستار محمدئەمین لەناوەڕاست و لەگەڵ حەمید سابیر



مام حەمید ڕەشاش لەگەڵ پارێزەر کەمال محیەدین



گوندی بالیسان مام حەمید لەگەڵ خزمانی گوندی بالیسان و ستار محەمەئەمین و حەمید سابیر



ستار محەمەئەمین لەنێوان هەردوو تێکۆشەری دێرین عبدالرزاق بێتووشی و مام حەمید رەشاش



مام حەمید رەشاش لەگەڵ هونەرمەند باکووری



مام حەمید رەشاش لەگەڵ مەلا محەمەد بەحرکەیی و کاك عەدنان موفتی و پارێزەر کەمال محیەدین



مام حەمید رەشاش لەسەتەلایتی گەلی کوردستان لەشاری سلێمانی



مام حەمید رەشاش لەگەڵ پۆلێك تێکۆشەری دێرین لەمەکتەبی کۆمەڵایەتی هەولێر



مام حەمید رەشاش لەیەکێك فیستیڤاڵەکانی کلتووری لەگەڵ دکتۆر عبدالواحد ئیدریس و هەڤاڵانی



مام حەمید رەشاش سالۆنی لاپەڕە نۆ ڕۆژی ناساندنی کتێبی پارێزەر کەمال محیەدین



مام حەمید ڕەشاش لەماڵی پارێزەر کەمال محیەدین



مام حەمید ڕەشاش لەگەڵ هەڤاڵانی مەکتەبی کۆمەڵایەتی و ستار محەمەدئەمین لەناوەندی هەولێری

مەکتەبی ڕاگەیاندن بەئامادەبوونی پارێزەر کەمال محیەدین





مام حەمید رەشاش سالۆنی لاپەڕە تۆ ڕۆژی ناساندنی کتێبی پارێزەر کەمال محیەدین



مەسعودی مەلا هەمزە و مام حەمید رەشاش

لە سالۆنی لاپەڕە نۆ ڕۆژی ناساندنی کتێبی پارێزەر کەمال محیەدین



مام حەمید رەشاش سالۆنی لاپەڕە نۆ ڕۆژی ناساندنی کتێبی پارێزەر کەمال محیەدین





مزگەوتی گەورەی شەقڵاوە لە مەراسیمی پرسەی تێکۆشەری دێرین ئیسماعیل حوسێن

مام حەمید ڕەشاش و کەمال محیەدین و ستار محەمەد ئەمین



مام حەمید رەشاش لەگەڵ ستافی بەرنامەی بۆ مێژوو
لە کاتی تۆمارکردنی یەکێك لە ئەڵقەکان لەگوندی ئاوە کورتە



ستار محەمەدئەمین لەگەڵ مام حەمید رەشاش



مام حەمید ڕەشاش لەگەڵ عیماد ئەحمەد



مام حەمید ڕەشاش لەگەڵ خوالێخۆشبوو شێخ جەنگی



مام حەمید رەشاش لەگەڵ کانەبی باپیر



مام حەمید رەشاش لەگەڵ کانەبی باپیر و عبدالوەهاب شێخانی لە سەرکەپکان



مام حەمید رەشاش لەگەڵ رەهبەری سەید برایم و چەند هەڤاڵێکی تر لەشاری کۆیە



مام حەمید رەشاش لەنێوان عەدنان موفتی و کانەبی باپیر



مام حەمید ڕەشاش لەنێوان ستار محەمەدئەمین و پارێزەر کەمال محیەدین



مام حەمید ڕەشاش لەگەڵ دکتۆرە ئاسۆس نەجیب وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی



مەلەك خانی هاوسەری مام حەمید رەشاش



رزگار حەمید رەشاش



مام حەمید ڕەشاش لەگەڵ بەختیاری کوڕی



مام حەمید ڕەشاش لەگەڵ دڵداری کوڕی



مام حەمید رەشاش لەگەڵ شازادی کوڕی



مام حەمید رەشاش لەنێوان مەجید و فەرهادی کوڕی



مام حەمید ڕەشاش و کچەکانی (پیرۆز و شیرین و نەورۆز)



مام حەمید و مەلەک خانی هاوسەری



مام حەمید ڕەشاش و شیرینی کچی



مام حەمید ڕەشاش و پیرۆزی کچی



کەوسەر ـ کچە گەورەی مام حەمید رەشاش



مام حەمید و مەلەک خانی هاوسەری



هەردوو خوالێخۆشبووان مام حەمید ڕەشاش و سیروان مەسعود



مام حەمید ڕەشاش لەگەڵ فەرهادی کوڕی

